# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی


49

شوبات

2007

ساڵی نۆیەم


-سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

-تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

-بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

-هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.


خاوەنی ئیمتیاز: **شێرکۆ بێکەس**

سەرنووسەر: **ڕەووف بێگەرد**

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی — شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید — شێرزاد حەسەن

دەرهێنانی هونەری: **قادر میرخان**

کاری کۆمپیوتەری: **تاڤگە فائق**

هەڵەچنی چاپ: **ساکار ڕەووف**

سەرپەرشتیاری چاپ: **فەرهاد ڕەفیق**

چاپ: **دەزگای حەمدی**



ناونیشان

سلێمانی — شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 2136659

دەزگای سەردەم *3129609*

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( ***14665/615*** و ***14665/616***) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

www.sardamco.com



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

# ناوەرۆك



## وێستگەکانی سەردەم



**نرخی** (1200) **دینارە**

# شوناس، کلتور، سیاسەت، لە روانگەیەکی ئەنترۆبۆلۆجیەوە

## پێشکەشکردنی "شوێنەوارەکانی توندوتیژی" کلاستەر

عەلی حەرب

لە عەرەبییەوە: رێبین هەردی

هەندێك لێکۆڵینەوەی هەنوکە لە بواری ئەتنۆلۆجیدا گرنگییەکی تایبەتیان هەیە. مەبەستمان بە تایبەتی ئەو لێکۆڵینەوانەیە کە بیار کلاستەر بەجێیهێشتوە کە لەم وتارەدا بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەری رادەوەستین، چونکە کاریگەری ئەو دەرئەنجامانەی پێیگەیشتووە بواری خودی ئەتنۆلۆجیا بەجێدەهێڵێ و هەموو زانستە مرۆڤایەتیەکان بەگشتی دەگرێتەوە. هەروەها لەبەرئەوەی هەڵگری روانگەیەکە کە کۆی تێڕوانینمان بۆ کۆمەڵگا و مێژوو، دەگۆڕێت. ئەگەر ئەتنۆلۆجیا (زانستی گەلان) لە بنەڕەتدا تەرخانکراوە بۆ لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگا سەرەتایی و دێرینەکان، ئەوە ئەمە بە مانای ئەوەیە کە دەشێت لیکۆڵینەوەی مرۆڤی سەرەتایی، رێگەیەك بێت بۆ لێکۆڵینەوە لە مرۆڤ بە گشتی و زانینی رابردوو دەشێت بمانگەیەنێتە زانینی هەنوکە.

بەو شێوەیەش رەوتەکە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە ئاینزای پەرەسەندن هەیە. ئەوانەی کە پێیانوایە بالاْتر تەفسیری نزمتر و ئەوی دوایی تەفسیری پێشتر دەکات. لەو روانگەیەوە کە بالاْتر و دواتر، پێگەیشتوتر و کامڵترن. ئەم پێچەوانەکردنەوەی مەسەلەکان، دەرەنجامی دۆزینەوە تازەکانە لە بوارە جیاوازەکانی زانستدا، چ زانستی رەفتار، یان دەرونشیکاری، یان لێکۆڵینەوە ئەرکۆلۆجیەکان، یان لە زانستە مرۆڤایەتیەکاندا بە گشتی، بەراستیش ئەگەر ئەوە راست بێت کە کۆنراد لۆرنز دەیڵێت: ئەگەر ئەوەی ئاژەڵ بەراستی بناسێت، ئەمە ئەو توانایەی پێدەبەخشێت مرۆڤیش بە تەواوی بناسێت، ئەوا ئەمەش کەمتر راست نییە ئەگەر بڵێین ناسینی منداڵ و شاز و شێت، پێویستە بۆ ناسینی کامڵ و ئاسایی و عاقڵ. هەروەها

پێدەچێت ناسینی سەرەتایی پێویست بێت بۆ ناسینی مرۆڤی هەنوکە. ئەگەر فرۆید پێیوابوو کە لێکۆڵینەوەی دیاردە دەرونیە نەخۆشەکان، رێگەیەکی باشترە بۆ لێکۆڵینەوە لە دەرونی مرۆڤ بە گشتی، بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ وەك مرۆڤ، ئەوا دەکرێ بگوترێت ئەمڕۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگای سەرەتایی، گرنگی بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگای هەنوکە و تێگەیشتن لە کۆمەڵگا وەك کۆمەڵگا، دەردەکەوێت. ئەوە شتێکی لاوەکی نیە کە قوڵترین دۆزینەوەی ژیانی دەرونی لەسەر دەستی فرۆید لە رێگەی لێکۆڵینەوە لە دیاردە نەخۆشیەکانەوە، بێتە دی، هەروەها ئەوەش شتێکی لاوەکی نیە کە دۆرکهایم – کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی زانستی کۆمەڵگا – یەکێك بێت لەوانەی لێکۆڵینەوەی لەسەر دابونەریتی سەرەتاییەکان و بیروراکانیانی کردووە.

ئەگەر لێکۆڵینەوەی ئەتنۆلۆجی لە سەدەی پێشودا (سەدەی نۆزدەهەم) دەستیپێکرد، ئەوا ئەمڕۆ وەرچەرخانێکی گەورە لە رووی سەیرکردنیەوە بۆ بابەتەکەی کە جیهانی دڕندەکانە، بە خۆیەوە دەبینێت. وەرچەرخانێك کە لە گۆڕانکاریەکی بنەڕەتیەوە دێت لە سەیرکردندا بۆ کۆمەڵگای سەرەتایی. ئەم گۆڕانکاریەش بریتیە لە وازهێنان لە سەیرکردنی سەرەتاییەکان لە روانگەیەکی ئەوروپی روتەوە، یان هەڵسەنگاندنیان لە رێگەی پێوەرە کلتوریە رۆژئاواییەکانەوە. بە مانایەکی دی هەوڵدانێك هەیە بۆ دۆزینەوەی رەگوریشەی سەیرکردنی ئەوروپییەکان بۆ ئەوی دی بە گشتی، و بۆ سەرەتاییەکان بە تایبەتی.

بە هەموو ئەو تەوژمە ناوەندگەری و وەهمە زاتیە ئەم روانگەیە لە خۆیدا هەڵگرێتی.

کلۆد لیڤی شتراوس کە دیارترین ئەنترۆبۆلۆجی هاوچەرخ و گرنگترین پسپۆری لێکۆڵینەوەی بیری دڕندەیی و سیستەمە سەرەتاییەکانە، یەکەم کەس بوو رەخنەی لە تەوژمی ناوەندگەری لە هەڵوێستی رۆژئاواییەکاندا بەرامبەر بە کلتورەکانی دی گرت. بە راستیش کلۆد لیڤی شتراوس پێیوایە بیری رۆژئاوا خەسڵەتێکی "بەڵگەنەویستانە"ی بە چەمکەکانی وەك پێشکەوتن، پەرەسەندن و تازەگەری، بەخشیوە کە لەوە تێپەڕ ناکەن چەند بیرێك و "شێوەی تایبەت" بن کە کۆمەڵگا رۆژئاواییەکان لە رێگەیەوە بیر لە خۆیان دەکەنەوە. لەبەرئەوە جێبەجێکردنی ئەم چەمکانە بەسەر کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بەتایبەتی، بووە هۆی ئەوەی –ئەوی دی– وەك خود هاوشێوە بکرێت و لێرەوە بووە هۆی نکولیکردن و سڕینەوەی خەسڵەتە تایبەتیەکانی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان. لیڤی شتراوس بە نکولیکردنی لە خەسڵەتی رەها و گشتگیری فکری رۆژئاوایی، بە هەوڵدانی بۆ هەڵوێست وەرگرتنێکی بێلایەنە و کرانەوە – ئەگەر نەڵێین لایەنگری – بەرامبەر بە سەرەتاییەکان، بە تێگەیشتنێکی جیاواز لەوانی پێشوو بۆ عەقڵی سەرەتایی گەیشت. تێگەیشتنێك کە لەسەر ئەوە بەندە کە بڕوای بە بوونی دابڕانێك نیە لە نێوان سیحر و زانستدا، هەروەها بڕوای بەوە نییە سەرەتاییەکان عەقڵێکی تایبەت بە خۆیان هەبێت یان بە مانایەکی وردتر عەقڵێك کە پێش عەقڵی

(ڕۆژئاواییە) و نزمترە لێی. لیڤی شتراوس بەم هەڵوێستەی بایەخ بۆ ژیارە نائەوروپییەکان دەگەڕێنێتەوە بەشێوەیەك کە هیچ ژیارێك ئیمتیازی بەسەر ژیارێکی تردا نابێت و بەشێوەیەك کە دەبێ چاو بە پۆلێنکردنی باوی کۆمەڵگاکاندا بۆ دڕندە و شارستانی، کۆن و تازە، وەستاو و بزێو، مێژوویی و نامێژوویی، بگێڕێتەوە. لێرەوە شتراوس بانگەشە بۆ جۆرێك گونجان لە نێوان کلتورەکاندا دەکات کە هەر هەموویان لە پلەیەکی یەکساندا دابنێت.

بێگومان ئەم ئاراستەیە لە لێکۆڵینەوەی ئەتنۆلۆجیدا کە لەگەڵ لیڤی شتراوسدا دەستی پێکرد، بەو مانا فەلسەفیانەوە کە هەیەتی دەرفەتی بۆ دروستبوونی هوشیارییەکی ئەوروپی جیاواز بۆ خود و ئەوی دی کردەوە، (هوشیارییەك) کە لە خاڵی ڕەخنەکردنی چەمکەکانی پێشکەوتن و تازەگەری و شارستانێتی و مێژووەوە، دەسپێدەکات. لە ڕاستیشدا کاریگەرییەکانی ئەو پێدراوە مەعریفییە تازانەی ئەتنۆلۆجیای هەنوکە پێشکەشی دەکات، پانتایی ڕۆژئاوا بەجێدەهێڵێ بۆ پانتایی کلتورەکانی دی، بە تایبەتی پانتایی عەرەبی/ ئیسلامی، چونکە دەبینین هەندێك لە بیریارە عەرەبەکان دەستیانکردووە بە وەرگرتنی ئەم پێدراوانە، یان سودی لێدەبینین بۆ باسکردنی کێشەکانی ئیسلام و مێژووەکەی، یان لە نوێنەرایەتیکردنیاندا بۆ شوناسە کلتوریەکەیان و دواجار بۆ بینینی پەیوەندیان بەوی دیەوە (ڕۆژئاوا).

کلاستەر لە لێکۆڵینەوە و بینینەکانیدا هەوڵی دا دیدێکی ئەتنۆلۆجی تازە دامەزرێنێت یان بە مانایەکی تر هەوڵیدا لێکۆڵینەوە لەو مەرجانە بکات کە وا دەکات دامەزراندنی ئەنترۆپۆلۆجیایەکی سیاسی وەك مەیدانێك کە دەیەوێت لێکۆڵینەوە لە واقعی دەسەڵاتی سیاسی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بکات، شیاو بێت.

بیرکردنەوەی کلاستەر "دژی تەوژم" کە خۆی بە مەرجی هەموو بیرکردنەوەیەکی ڕاستەقینەی دادەنا، بەرەو ئەوەی برد ڕەدی وێنای باوی فکری ڕۆژئاوا بۆ دەسەڵات بکات، بەو مانایەی کە لەسەر زۆرداری و توندوتیژی ڕاوەستاوە. لێرەوە داوای پیاچوونەوەی بە چەمکی سیاسەتدا بە ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە، دەکرد:

1- دەسەڵاتی سیاسی شتێکی بەستراوە بە ژیانی کۆمەڵایەتیەوە. بەو مانایەی کۆمەڵگایەك نییە بێ دەسەڵات. ئەمەش بۆ کۆمەڵگا سەرەتاییەکان ڕاستە، بەشێوەیەك ناکرێ بە کۆمەڵگای پێش سیاسی دابنرێن یان بە قۆناغێکی کۆرپەلەیی کۆمەڵگای سیاسی دابنرێن.

2- دەزگای سیاسی ئەگەرچی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا نییە، بەڵام ئەم نەبوونییە شتێك دەشارێتەوە، شتێك کە خۆی بە دیاریکراوی خەسڵەتێکی سیاسیی هەیە.

3- دەسەڵاتی سیاسی بە ناچار دەسەڵاتی زۆردارانە نییە، بەڵکو دەشێت دەسەڵاتێك هەبێت لەسەر زۆرداری و توندوتیژی ڕانەوەستابێت.

ئەمـــەش ئـــەو شـــتەیە كـــە كلاســـتەر وەك گریمانەیـــەك لەســـەرەتاوە وەریگـــرت، گریمانەیەك كە دواتر لێكۆڵینـەوە مەیدانیـەكانی بۆی دەسەلمێنن.

بەمـشێوەیە كلاســتەر لــە هەوڵدانیــدا بــۆ دامەزرانـــدنی بناغـــەی پـــرۆژە زانـــستیەكەی (ئەنترۆبۆلۆجیای سیاسی)، خۆی بە دوو شت چـــەكدار دەكـــات: یەكـــەمیان هەڵوێـــستێكی پێچەوانە، بە رێزگـرتن لـە كلتـورە دێرینـەكان تا ئەوپـــەڕی رێـــز، دوهـــەمیان هەڵوێـــستێكی عەقڵانیانـە كـە بـە پرسـیار لـە گرنگـی هەنـدێك وتـەزا لـە پێناسـەكردنی ئـەو كەسـانەی كـە بـە دڕندەكان ناونراون، دەكات. وەك پرسیار كـردن لـە وتـەزای ئـابوری پێویـست، یـان مانـای بـاوی دەســـەڵات. لێـرەوە كلاســتەر دەســتیكرد بــە لێكۆڵینـــەوەی هەنـــدێك لـــە كۆمـــەڵگا ســـەرەتاییەكان، لـــە رێگـــەی بەدواداچـــوونی شێوەی دەسەڵات لە ناویاندا و پلەی سـەرۆك لـە ناویانـدا و ئەركـەكانی، یـان بـە زانـینی شـێوەی ئیــشكردنی یـــان بـــە شـــیكردنەوەی دیـــاردەی توندوتیژی و جەنگ لە ناویدا.

شـتێكی سروشـتیە هەوڵەكـەی كلاسـتەر بـۆ دووبـارە تەفسیركردنەوەی جیهـانی سـەرەتایی، هاوكـاتی هەوڵــدانێكی رەخنەگرانــە بێــت، بــۆ ئـــەوەی لـــە رێگەیـــەوە تـــاوتوێی وتـــارە ئەنتۆلۆجیـــەكان بـــە جیـــاوازی ئاراســـتە و بیروڕاكانیـــەوە بكـــات. وەك چـــۆن لـــە وتـــاری "شـوێنەوارەكانی توندوتیژیـدا" دەردەكـەوێت. لـەم وتـارەدا كلاسـتەر بەشـێوەیەكی سـەرەكی دیـاردەی جـەنگ لـە كۆمـەڵگا سـەرەتاییەكاندا شیدەكاتەوە. بـەلاَم ئەگـەر رەخنەكـەی كلاسـتەر هـــەڵگری برِێكـــی زۆر تۆمـــەتباركردنی ئـــەو نوسـەرانەیە كـە باسـی جـەنگیان كـردووە، بـە تایبـەتی ئـەو كەسانەی جەنگیان لـە كۆمـەڵگای سـەرەتایی دوورخستۆتەوە، ئـەوا بەشـێوەیەكی جــــدی لەســــەر هـــۆبز و لیڤـــی شـــتراوس رادەوەستێت. چونكە ئەگەرچی كلاستەر رەخنـە لـــە هـــەردووكیان دەگرێــــت و هەڵـــەی وێناكردنـــەكانیان بـــۆ كۆمـــەڵگای ســـەرەتایی كەشفدەكات، بەلاَم بە بڕوای ئـەو هـەردوكیان لـە هەنـدێك رەهەنـدی سـەرەكی بـوونی كۆمـەڵگای سەرەتایی تێگەیشتوون.

هەنـدێك لـەو ئەتنۆلۆجیانـەی پـاش لیڤـی شتراوس هاتن یان قوتابی ئەو بوون، پێیان وایە سـەرەڕای ئـەوەی هەوڵەكـەی شتراوس هـەڵگری پیاچـــونەوەی هەڵـــسەنگاندنە بـــۆ كۆمـــەڵگا ســـەرەتاییەكان و ســـەرەڕای ئـــەو دەســـتكەوتە گەورانـــەی لێكۆڵینـــەوەكانی لـــە تەفـــسیركردنی هەندێك لایەن و دیاردەی فكـر و ژیـانی كۆمەڵگا ســـەرەتاییەكاندا بەدەســـتهێناوە، بـــەلاَم لەگـــەڵ ئەوەشـــدا كارەكـــانی ئـــەو شـــتەی بەدەســـت نـــەهێناوە كـــە بـــۆ تەفـــسیركردنی كۆمـــەڵگای ســـەرەتایی پێویـــستە. وەك بیـــار كلاســـتەر لـــە لێكۆڵینـــــەوە پێـــــشەنگەكەیدا لـــــە بـــــواری "ئـــەنترۆپۆلۆجیای سیاســـیدا" بەشـــێوەیەكی تایبـــەتی دەریخـــستووە. بەراســـتیش ئەگەرچـــی كلاســـتەر دان بـــەو "ســـەركەوتنە گـــەورە"یـــەدا دەنێـت كـە لیڤـی شتراوس لـە لێكۆڵینەوەیدا بـۆ فكـــری وەحـــشی و سیـــستەمەكانی خزمایـــەتی بەدەستهێناوە، بـەلاَم پێیوایـە لیڤـی شتراوس لـە شـــیكردنەوەی روداوە ســـەرەكیەكانی كۆمـــەڵگا ســــــەرەتاییەكاندا، ســــــەركەوتوو نـــــەبووە و

تیورەکەی دوورترە لەوەی بمانگەیەنێتە سەر ماهیەتی ئەم کۆمەڵگایە یان بمانگەیەنێتە قوڵایی بونی. لێرەوە کلاستەر لە سەرەتاوە دەیویست دەست بە پرۆژەیەك بکات کە زیاتر لەو شتانە بڕوات کە لیڤی شتراوس پێیگەیشتووە، ئەمە ئەگەر نەڵێن پرسیار لە خودی ئەو بناغەیە بکات کە ئەتنۆلۆجیای لەسەر راوەستاوە و لێرەوە پرسیار لە رەوایەتی زانستی، بە تایبەتی سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی "رەهەندی سیاسی" لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بکات، چونکە زوربەی ئەتنۆلۆجیەکان بە زمانی ئەو کۆمەڵگایەی بەرهەمی هێناون – واتە بە زمانی رۆژئاوا وەك کلاستەر دەڵێت – قسە لەسەر ئەم کۆمەڵگایانە دەکەن، بە هەموو ئەو کاریگەریانەی کە ئەم زمانە کەشفیدەکات لە بیروڕاکانی رۆژئاوا و وەهمەکانیان. لێرەوە کلاستەر بانگەشەی بۆ رودانی "شۆڕشێکی کۆپرنیکی" کرد لە بواری ئەتنۆلۆجیادا کە ئەو وێنایە هەڵدەگەڕێنێتەوە کە وایدەکرد کۆمەڵگا سەرەتاییەکان بە دەوری ژیاری ئەوروپیدا بسوڕێنەوە. ئەم شۆڕشە بە بڕوای کلاستەر شتێکی پێویستە ئەگەر بمانەوێت گوتارێك دامەزرێنین بگونجێت لەگەڵ کەینونەی کۆمەڵگای سەرەتاییدا، نەك لەگەڵ کەینونەی کۆمەڵگای رۆژئاواییدا. بەڕاستیش تەوژمی ناوەندگەری رۆژئاوا "بەربەستێکی مەعریفی" پێکدەهێنا کە رێگەی لە تێگەیشتنی کۆمەڵگای سەرەتایی و سروشتی دەسەڵاتی سیاسی دەگرت. چونکە رۆژئاواییەکان سەیری کۆمەڵگای سەرەتاییان لە روانگەی وێنای خۆیانەوە بۆ سیاسەت دەکرد، وێنایەك کە پێیوایە دەسەڵات لەسەر بناغەی زۆرداری و دابەشبوونی کۆمەڵایەتی بۆ فەرمانڕەوا و فەرمانلێکراو، دامەزراوە، و بەشێوەیەکی نمونەیی لە دەوڵەتدا بەرجەستە دەبێت، کاتێکیش شتێکی لەم چەشنەیان لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا نەدۆزیەوە، بڕوایان بەوە کرد کە سیاسەت لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا بوونی نییە، بگرە بڕوایان بەوە کرد کە ئەم کۆمەڵگایە بەڕاستی کۆمەڵگا نییە. ئەم هەڵوێستە لە هەڵوێستی ئەو کەسە دەچێت کە چاوەڕێی ئەوە دەکات کاتێك دەچێتە بەر ئاوێنە، جگە لە خۆی کەس نەبینێ، بەڵام ئەگەر ئەمە نەهاتە دی (واتە هیچی نەدی)، وا بزانێت هیچ نابینێت. بە بڕوای کلاستەر نەفیکردن بە مانای نەبوون نییە. لێرەوە پێیوایە کاتی ئەوە هاتووە رۆژئاوا دان بەوەدا بنێت کە جیهانی سەرەتایی، جیهانێکی کۆمەڵایەتی کۆرپەلەیی نییە، بەڵکو جیهانێکی کۆمەڵایەتی کامڵە و ئەو کۆمەڵگایانەی نوسین ناناسن، کەمتر قوڵ و کامڵ نین لە کۆمەڵگا رۆژئاواییەکان. ئەم کۆمەڵگایانە دەستەوەستان نین بۆ ئەندێشەکردنی ئەزمونەکەیان یان بۆ داهێنانی چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکانیان. بەمشێوەیە کلاستەر لەسەرەتاوە هەڵوێستێکی گوماناوی بەرامبەر بەو بەڵگەنەویستە وەرگرت کە زانستی ئەتنۆلۆجی لەسەری راوەستاوە، واتە ئەگەری ناسینی جیهانی سەرەتایی لە رێگەی بەڵگەنەویستەکانی تەحەکومی گوتاری ئەتنۆلۆجیەوە کە یەکەمیان تایبەتە بە جەنگ و دوهەمیشیان تایبەتە بە ئاڵوگۆڕ.

کلاستەر پێیوایە ئەو بیروڕایانەی لە بارەی جەنگی سەرەتاییەکانەوە گوتراوە، گوتارێکی ناکۆك بەیەك پێکدەهێنن کە بەسێ ئاراستەدا پەرەدەسێنێ: ئاراستەیەکی سروشتی، ئاراستەیەکی ئابوری و ئاراستەیەکی ئاڵوگۆڕی. هەر سێ ئەم ئاراستەیەش لەوەدا کۆدەبنەوە توندوتیژی کورتبکەنەوە بۆ کەینونەی کۆمەڵایەتی سەرەتاییەکان.

لە گوتاری سروشتیدا وا تەماشای توندوتیژی دەکرێت، وەك خەسڵەتێك لە خەسڵەتەکانی رەگەزی مرۆڤ، وەك رەفتارێکی شەڕانگێزانە کە لە سروشتی بایەلۆجی مرۆڤدا رەگی داکوتاوە. لەبەرئەوەش کە ئەم رەفتارە شەڕانگێزانەیە بۆ مانەوە دانراوە، ئەوا لە سەرەتاوە تەکنیکێکی بۆ بەدەستهێنانی خواردن دروستکرد، کە لەلای سەرەتاییەکان لە راوکردندا بەرجەستە بوو. جەنگیش هیچ نیە جگە لە هاوشێوەی راوکردن، جەنگ شەڕانگێزیەکەی راوکردنی بە میرات بۆ ماوەتەوە، ئەویش بە گۆڕانی هێواش هێواشی راوکەر بۆ جەنگاوەر، کاتێك کلاستەر ئەم بەڵگاندنە تا دوایی دەبات دەبینێ هیچ جیاوازیەك لە نێوان جەنگ و راوکردندا نەماوە، جگە لەوەی جەنگ راوکردنی مرۆڤە لەلایەن مرۆڤەوە، و راوکردنیش جەنگی مرۆڤە بەرامبەر بە ئاژەڵ. ئەگەر ئەمەش راست بێت ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی خواردنی گۆشتی مرۆڤ گشتگیر بکەین کە ئەمەش خۆی پێچەوانەی راستیە. چونکە تەنانەت لای بخۆرانی گۆشتی مرۆڤ، ئامانجی جەنگ کوشتنی دوژمنان نییە بۆ خواردنی گۆشتەکانیان. بەمشێوەیە سروشتیەکان بە گێڕانەوەی راوکردن بۆ جەنگ، کۆمەڵایەتی دەگێڕنەوە بۆ بایەلۆجی، و تەفسیری دیاردەیەك کە پەیوەندی بە کۆمەڵناسیەوە هەیە، بە گەڕانەوە بۆ ئاژەڵناسی دەکەن. بەلاّم راستیەکەی ئەوەیە جەنگ دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی کلتور نەك جیهانی سروشت.

لە گوتاری ئابوریدا – بە هەمەڕەنگی شێوەکانیەوە "شەعبی، یان زانستخوازی یان مارکسی"، تەفسیری جەنگ بە ململانێ لە نێوان گروپەکاندا دەکرێت لە پێناوی دەستبەسەراگرتنی دەستکەوتە مادیەکاندا، ئەو بناغەیەی ئەم گوتارەی لەسەری راوەستاوە بریتیە لە وەرگرتنی وتەزای "نەداری سەرەتایی"، واتە گوتنی ئەوەی ئابوری سەرەتایی ئابوریەکە لەسەر بناغەی پێویستی راوەستاوە. پێویستیەك کە تەنها رێگە بە درندەکان دەدات بمێننەوە و بەس. سەرچاوەکان هێندە "کەمن" کە بەشی هەموان ناکات، لێرەوە گروپەکان لە پێناوی بەدەستهێنانیدا ململانێ لەگەڵ یەکدا دەکەن. ئەم ململانێیەش بە ناچار دەبێتە هۆی ململانێیەکی چەکدارانە: واتە جەنگ. بە بڕوای کلاستەر تەفسیری مارکسیش لەم تەفسیرە دوورناکەوێتەوە. ئەگەر مارکسیەت تەفسیری مێژوو، واتە یاساکانی جوڵەی مێژوو و گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەکات، لە رێگەی ئارەزووی هێزەکانی بەرهەمهێنانەوە کە رێگەی لێناگیرێت بۆ پەرەسەندن، ئەوە ئەمە بە مانای ئەوەیە مێژوو لە خاڵێکەوە دەستپێدەکات کە تیایدا هێزەکانی بەرهەمهێنان لە نزمترین ئاستی

مومکیندان، واته له خاڵی سفردان. که ئەمەش به ناچار دەمانگەیەنێته قبوڵکردنی نەداری ئابوری کۆمەڵایەتی. بەلاّم لێکۆڵینەوەکانی هەنوکەی بواری ئەنترۆبۆلۆجیای ئابوری، به پێچەوانەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئابوری دڕندەکان یان شێوە بەرهەمهێنانی خێزانی، به تەواوی بەشی پێویستیەکانی کۆمەڵگای سەرەتایی دەکات، ئەمەش بەرامبەر به چالاکیەکی بەرهەمهێنان کە لە کاتێکی دیاریکراودا ئەنجامدرێت و به ریتمێکی هێواش، ئابوری سەرەتایی ئابورییەکی فرەییە، نەك ئابوریەکی کەم. لێرەوە ئابوری تەفسیری جەنگ ناکات، بەڵکو سیاسەت تەفسیری دەکات.

بەلاّم گوتاری ئاڵوگۆڕ باشترین کەس کە نوێنەرایەتی بکات، کلۆد لیڤی شتراوسە. لیڤی شتراوس توندوتیژی و ئاڵوگۆڕ بەیەکەوە گرێدەدات. بەشێوەیەك کە جەنگ بەدەرەنجامی "رێکەوتنێکی سەرنەکەوتوو" دادەنێت و هەروەها ئاڵوگۆڕیش بە جەنگێکی شاراوە دادەنێت کە رێگە چارەی ئاشتیانەی دۆزیوەتەوە. بێگومان لیڤی شتراوس جەنگ به چالاکیەك دادەنێت کە خەسڵەتێکی سۆسیۆلۆجی هەیە. بگرە تێزێکی ورد لە بارەی شێوەی کارکردنی کۆمەڵگای سەرەتاییەوە پێشکەش دەکات. بەلاّم بەپێی رونکردنەوەکانی کلاستەر، لیڤی شتراوس ئاڵوگۆڕ دەخاتە پێش جەنگەوە چونکە کۆمەڵگای سەرەتایی لە ناوەڕۆکدا لەسەر ئاڵوگۆڕ راوەستاوە وەك لیڤی شتراوس دەیبینێ. کۆمەڵگای سەرەتایی "کۆمەڵگایەکە لە پێناو ئاڵوگۆڕدا" و جەنگیش نیە تا ئەو کاتە نەبێت کە ئاڵوگۆڕ شکست دێنێ یان لە نێوان کۆمەڵگاکاندا نامێنێ. بەمشێوەیە بەپێی تەفسیری لیڤی شتراوس چیدی جەنگ لە خۆیدا هیچ شتێکی پۆزەتیڤی تێدا نییە، و لێرەوە "رەهەندی دامەزراندن"ی خۆی لەدەستدەدات و دەبێت بەشتێك کە نەفی کۆمەڵگای سەرەتایی دەکات، بەو مانایەی کە کۆمەڵگایەکی ئاڵوگۆڕە و دەبێت به دیاردەیەکی لاوەکی. لە کاتێکدا کلاستەر پێیوایە ئەم تەفسیرە پێدراوە دیمۆگرافیەکان لەبەرچاو ناگرێت کە گشتگیری جەنگ به گشتی لە هەموو کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا دەسەلمێنن. جاجۆر و ناوەندە سروشتی و شێوەی رێکخستنە ئابوری و کۆمەلاّیەتیەکەی هەرجۆرێك بێت. لێرەوە چەمکی ئاڵوگۆڕ دەبێتە هۆی تواندنەوەی جەنگ و دورخستنەوەی ئەرکە سۆسیۆلۆجیەکەی.

دیارە ئەمە بە مانای رەدکردنەوەی بیرۆکەی ئاڵوگۆڕ نییە، چونکە مەسەلەکە بریتی نییە لە هەڵبژاردن لە نێوان جەنگ یان ئاڵوگۆڕدا، وەك لیڤی شتراوس تێیگەیشتووە. کۆمەڵگای سەرەتایی "جێگایەکە بۆ توندوتیژی" وەك چۆن تەواو "بوارێکە بۆ ئاڵوگۆڕ". ناکرێت لە کۆمەڵگای سەرەتایی تێبگەین بەبێ تێگەیشتن لە جەنگ. هەڵەی لیڤی شتراوسیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی جەنگ و ئاڵوگۆڕی لەسەر یەك ئاستدا تاوتوێکرد کە بەناچار دەبێتە هۆی دوورخستنەوەی یەکێکیان – دیارە جەنگ لەلای لیڤی شتراوس – کە ئەمەش دەبێتە هۆی شێواندنی هەقیقەتی کۆمەڵگای سەرەتایی. ئەگەر تیورەزەنی دەوڵەت واتە هۆبز، پێیوابوو کە جیهانی دڕندەکان بریتیە لە "جەنگی

هـەموان دژی هـەمووان" ئـەوا روانگـەی لیڤـی شـتراوس بـۆ ئـەم جیهانـە بـەپێی دەربـڕینی کلاستەر دەیکات بە "ئاڵوگۆڕی هەموان لەگەڵ هەموانـدا". هەردووکیـشیان لـەم بۆچـونەیاندا هەڵـەن. چـونکە نـە هاوڕێیـەتی گـشتگیر و نـە جەنگی سەرتاسـەری لـە کۆمـەڵگای سـەرەتاییدا مومکین نین.

گریمانـەی هاوڕێیـەتی گشتگیر راست نییـە، چـونکە ناکۆکـە لەگـەڵ سـتراتیژی کۆمـەڵگای سـەرەتاییدا کـە چ لەسـەر ئاسـتی ئـابووری و چ لەسـەر ئاسـتی سیاسـی، لەسـەر بناغـەی کورتکردنـەوەی ئـاڵوگۆڕ بـۆ دوا سـنور راوەسـتاوە. بەراسـتیش شـێوەی بەرهـەمهێنانی سـەرەتایی کـە شـێوەی بەرهـەمهێنانی خێزانیـە، بە "ئیکتیفای زاتی" دەناسرێتەوە. بەشێوەیەك کە هـەموو کۆمـەڵ ئارەزووی ئـەوە دەکـەن خـۆی ئەو شتانە بەرهەمبهێنێت کە بەسن بۆ مانـەوەی ئەندامەکانی، بەبێ ئەوەی پێویستی بە کەسانی دی بێت. ئەگەر ئابوری سـەرەتایی کـار بـۆ ئەمـە دەکات بەشێوەیەك کۆمەڵ بەرەو داخران بەسـەر خـۆدا بـەرێت، ئـەوا ئەمـە بـە پلـەی یەکـەم لەبـەر ئامـانجێکی سیاسـی ئەنجامـدەدات. پاراسـتنی سـەربەخۆی هـەموو کۆمـەڵ و ئازادیـەکانی — چـونکە کۆمـەڵگا سـەرەتاییەکان هەوڵـدەدەن "هەمەکیـەکی تـەواو" بـن. واتـە کۆمـەڵێکی سەربەخۆ و جیاواز و کیانێکی "کامڵ"بن. ئەم کۆمەڵگایـە هەوڵـدەدات بـەردەوام پارێزگـاری لـە شوناسی خـۆی بکات، ئـەویش بەرەدکردنـەوەی هاوشوناسـی لەگـەڵ ئـەوانی دیـدا، واتـە بـە رەدکردنـەوەی لابردنـی ئـەو جیاوازیانـەی کـە خەسـڵەتی پێکـدەهێنن و لـەوانی دی جیـا دەکەنەوە. ئەمـەش تەفسیری ئەو پارچە پارچە بوونـە دەکات کـە لـە کۆمـەڵگای سـەرەتایی و لـە هـەموو شـوێنێکدا هەیـە و لـە شـکڵی کۆمـەڵ و گروپی جیـاوازدا دەردەکـەوێت. لێرەوە لـۆژیکی کۆمـەڵگای سـەرەتایی لەسـەر بناغـەی "پارچـە پارچە بوون و فرەیی" راوەستاوە. لۆژیکێك کە جیاوازیـەکان بەرهەمـدێنێ و لێـرەوە ناکۆکـە لەگـەڵ لـۆژیکی ئـاڵوگۆڕی سەرتاسـەریدا کـە لـۆژیکی هاوشوناسـی و یەکێتیـە، ئەمـەش بـە مانـای ئەوەیـە کۆمـەڵگای سـەرەتایی لەسـەر ئـاڵوگۆڕ رانەوەسـتاوە، هێنـدەی "دژی ئاڵوگۆڕ"ە. بەڵام ئەو دەزگایە کامەیە کە زامنی بـەردەوامی ئـەم لۆژیکـە دەکـات؟ ئـەوە جەنگـە. جـەنگ کـە ئامێرێـك و هۆکارێکـە کـە رێگـە بـە کۆمـەڵ دەدات بـە سـەربەخۆیی و جیـاوازی بمێنێتـەوە. جـەنگ بـۆ کۆمـەڵگای سـەرەتایی بریتییـە لـە ئەگـەرێکی هەمیـشەیی، و دەزگـا سـتراتیژیەکەی و گەمەیـەکی ئـازاد کـە لـە رێگەیـەوە پراکتیکـی بوونی سیاسی خۆی دەکات.

بـەڵام پێدەچـێت گریمانـەی جـەنگی سەرتاسـەریش راسـت نـەبێت، چـونکە ئەگـەر هاوڕێیـەتی سەرتاسـەری یـەکێك لـە خەسـڵەتە جەوهەریەکانی کۆمەڵی سەرەتایی لەناوببات کە ئیرادەیەتی بۆ سەربەخۆیی و جیاوازبوون، ئەوا جـەنگی سەرتاسـەری خەسـڵەتێکی جەوهـەری تـری کۆمەڵەکـە لـەناو دەبـات کـە ئیرادەیـەتی بۆئـەوەی وەك "یەکیـەکی گونجـاو" بمێنێتـەوە. کۆمەڵگای سەرەتایی هەوڵ بۆ یەکسانی دەدات، لەبەرئەوە دابەشبوونی کۆمەڵایەتی لەناو خۆیدا رەد دەکاتـەوە، و کـار بـۆ دوورخـستنەوەی

نایەکسانی و ڕێگەگرتن لە ریسککردن دەکات. شێوەی بەرهەمهێنانی خێزانیش خزمەتی ئەم ئامانجە دەکات بە ڕێگەگرتنی لە وەبەرهێنان. بەلام جەنگی سەرتاسەری بە ناچار بەسەرکەوتن و ژێرکەوتن کۆتایی دێت، لێرەوە جەنگی هەمووان دژی هەمووان بێگومان دواجار دەبێتە هۆی سەقامگیری پەیوەندییەکانی کۆنترۆڵکردن کە براوە پیادەی دەکات. ئەمەش واتە لەناوچوونی کۆمەڵگای سەرەتایی وەك کەینونەیەکی "دابەشنەبوو" واتە وەك یەکەیەکی گونجاو. کەوابوو کۆمەڵگای سەرەتایی نە دەتوانێت هاوڕێیەتی سەرتاسەری‌و نە دژایەتی سەرتاسەری قبوڵبکات، چونکە یەکەمیان شوناسەکەی لەدەستدەدات، و دووهەمیشیان یەکێتی و گونجانەکەی لە دەستدەدات. لێرەوە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان پەنا بۆ هاوپەیمانێتی دەبەن، چونکە مەحاڵبوونی جەنگی هەمووان دژی هەمووان پاڵ بە کۆمەڵەوە دەنێت ئەوانی دی بۆ هاوڕێ و دوژمن پۆلێنبکات. واتە ڕێگە دەکاتەوە بۆ ئەنجامدانی هاوپەیمانێتی لە نێوان کۆمەڵە سەرەتاییەکاندا. چونکە دواجار هیچ کۆمەڵگایەك ناتوانێت دەستبەرداری هاوپەیمانێتی لەگەڵ کۆمەڵی تردا بێ، تاکو هاوکاری بکات و پشتیبگرێت یان لانیکەم بێلایەن بێت لە جەنگیدا دژی کۆمەڵەکانی دی. دیارە کۆمەڵگای سەرەتایی ئەم هاوپەیمانێتیە لە ژێر ناچاریدا دەکات، چونکە جەنگکردن بە تەنیا، هەڵگری مەترسیە. بە مانایەکی دی هاوپەیمانێتی هۆکارە نەك ئامانج، تەکنیکێکە جەنگ دیاریدەکات وەك ستراتیژیەتێك کە لە ڕێگەیەوە کۆمەڵ پارێزگاری لە سەربەخۆیی خۆی دەکات. ئەگەر جەنگیش پێویستی بە هاوپەیمانێتی هەیە، ئەوا هاوپەیمانێتی بەرەو ئالوگۆر دەچێت، ئەمەش ڕێگە پێدەدرێت و سنورەکانی لە نێوان گروپ و کۆمەڵەکاندا دیاردەکرێت. بەمشێوەیە ئالوگۆڕی ژنان بە ئامانجی هاوپەیمانێتی دەکرێت کە دوژمنان بۆ هاوپەیمانان دەگۆڕێت لە ڕێگەی خزمایەتیەوە. هەڵەی لیڤی شتراوسیش دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵکردنی لە نێوان ئالوگۆڕدا وەك ئامانجێك لەگەڵ ئالوگۆڕدا وەك هۆکارێك، واتە لە نێوان ئالوگۆڕدا وەك کردەیەکی دامەزرێنەر بۆ کۆمەڵگا کە لە ڕێگەی ئالوگۆڕی ژنان و تابۆکردنی زیناوە، لە قۆناغی ئاژەڵیەوە دەیگوازێتەوە بۆ قۆناغی مرۆیی و لە جیهانی سروشتەوە بۆ جیهانی کلتور، لەگەڵ ئالوگۆڕدا وەك هۆکار و دەرئەنجامێکی جەنگ. ئەم هەڵەیەش لەو بڕوایەی لیڤی شتراوسەوە هاتووە کە جیهانی سەرەتایی، جیهانی ئالوگۆڕە، لێرەوە دژی جەنگە کە ئالوگۆڕێکی هەڵەیە کە ئەمەش لەگەڵ واقعی سۆسیۆلۆجی کۆمەڵگای سەرەتاییدا ناکۆکە کە ئەوە دەسەلمێنێ جەنگ بناغەو بونیادی کۆمەڵگای سەرەتایی و شێوەی کارکردن و ئامانجی پێکدەهێنێت، لێرەوە جەنگ ئەگەری هەمیشەیی کۆمەڵگای سەرەتاییە و بە بەردەوامبوونی بەردەوام دەبێت‌و بە لەناوچونیشی، لەناو دەچێت.

وەك چۆن لیڤی شتراوس لە تێگەیشتنیدا بۆ جەنگ هەڵەی کردووە، هۆبزیش لە تێگەیشتنیدا بۆ ئالوگۆڕ هەڵەی کردووە. فەیلەسوفی ئینگلیزی پێیوابوو جەنگی هەمووان

دژی هەمووان، ڕێگە لە دروستبوونی ئاڵوگۆڕ بە هەموو شێوەکانی دەگرێت، لێرەوە پێیوابوو کۆمەڵگای سەرەتایی بەرز نابێتەوە بۆ پلەی کۆمەڵگا و جیهانی دڕندەکان، جیهانێکی کۆمەڵایەتی نیە. دەزگای کۆمەڵگاش بە کۆتایی جەنگ و دروستبوونی دەوڵەت دەست پێدەکات. هەردووکیشیان (واتە چ لیڤی شتراوس و چ هۆبز) هەڵەیان لە تەفسیری جیهانی سەرەتاییدا کرد. جیهانی سەرەتایی جیهانێکی کامڵە، بە پێچەوانەی ئەوەی هۆبز گوتویێتی، هەروەها "کۆمەڵگایەکە لە پێناوی جەنگدا" بە پێچەوانەی ئەوەی لیڤی شتراوس دەیڵێت.

ئەگەر جەنگیش هۆکارێك بێت بۆ ئامانجێکی سیاسی کە بریتییە لە مانەوەی سەربەخۆیی کۆمەڵ و جیاوازیەکەی، و پاراستنی کەینونە کۆمەڵایەتیە دابەش نەبووەکەی و ڕەدکردنەوەی ملکەچی بۆ هەموو یاسایەکی دەرەکی، جگە لە "یاسای تایبەتی خۆی"، بە مانایەکی دی ئەگەر بریتی بێت لە دەربڕینی بەردەوامی لۆژیکی فرەیی و پارچە پارچەبوون بۆ پاراستنی شوناسی کۆمەڵ، ئەوا ئەمە بە دابینکردنی ڕووبەڕووبونەوەی لۆژیکەکەی دی ئەنجامدەدات، واتە لۆژیکی یەکێتی و هاوشوناسی و یەکتابوون (نەك کۆمەڵ). واتە لۆژیکی دەوڵەت کە کار بۆ سڕینەوەی جیاوازیەکان و گۆڕانی یاساکانی کۆمەڵ بۆ یاسای دەرەکی دەکات کە ئاماژەیە بۆ کامڵبوونی دابەشبوونی کیانی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیەکانی باڵادەستی و ملکەچی دەخاتە بری پەیوەندیە یەکسانەکان. کەوابوو جەنگ ئامێرێکە بۆ ڕێگەگرتن لە دروستبوونی دەوڵەت و کۆمەڵگاش "کۆمەڵگایەکە دژی دەوڵەت" هێندەی "کۆمەڵگایەکە لە پێناو جەنگدا".

ئەگەر هۆبز لەو بڕوایەدا هەڵە بووبێت کۆمەڵگا لە پاش تێپەڕینی جەنگەوە دەستپێدەکات، ئەوا یەکەم کەس بوو کە دەرکی دوورخستنەوەی جەنگ و دەوڵەتی کرد کە دەیانکات بە دوو جەمسەری ناکۆك بەیەك، کە هەریەکێکیان نەفی ئەویدیان دەکات. بە مانایەکی دی ئەگەر گوتاری هۆبز کورت بکەینەوە بۆ ئەو گوتەیەی کە دەڵێت "دەوڵەت دژی جەنگە"، ئەوا بیار کلاستەر ئەم قسەیە پێچەوانە دەکاتەوە و پێماندەڵێت: "جەنگ دژی دەوڵەت"ە.

کەوابوو جۆرێك لە کۆمەڵگا هەیە کە کۆمەڵگای سەرەتاییە لەسەر بناغەی دابەشبوون دروست نەبووە، واتە ڕێگە نادات دەسەڵاتی سیاسی پەیکەرێکی سەربەخۆ و جیا لە کیانی کۆمەڵایەتی دروستبکات. کەوابوو دەوری دەسەڵات لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا و بە تایبەتی دەوری سەرۆك چییە؟ ئەو بە ناوی "یاسا"یەکەوە دەدوێت کە هیچ مرۆڤێك داینەڕشتووە، بەڵکو باو و باپیران و خوداکان دایانناوە. مەغزای وتنی "سەرۆك"یش هەمیشە بریتیە لە گەڕانەوە بۆ ئەم یاسایە کە دەبێ ڕێزی لێبگیرێت و پێشێل نەکرێت. چونکە هەر گۆڕانێکی بەسەردا بێت، دەبێتە هۆی گەندەڵی جەستەی کۆمەڵایەتی، ئەویش بە گۆڕان و خستنە ناوەوەی شتی تازە کە شتێکە کۆمەڵگای سەرەتایی بە تەواوی ڕەدی

دەکاتـەوە. لێـرەوە سـەرۆك تـەعبیر لـە ئـارەزووە فەردیەکانی ناکات، هێندەی تەعبیر لە تـەوژمی پارێزگـاری کۆمـەڵ دەکـات، واتـە تـەعبیر لـە ئـارەزووی بـۆ پاراسـتنی کەینونەکـەی وەك جەسـتەیەکی کۆمەڵایـەتی گونجـاو و کیـانێکی دابەشنەبوو. بە کورتی کۆمەڵگای سەرەتایی لە کاتێکـدا کـە کـار بـۆ رێگـەگرتن لـە دابەشـبوون لەناو خودی کەینونەیدا دەکات، لە هەمانکاتدا کار بۆ رێگەگرتن لە دەرکەوتنی دەوڵەت دەکات. کـەوابوو "کۆمەڵگایەکـە دژی دەوڵـەت"، واتـە دژی ناچارکردن و دابەشبوون و زنجیرە پلەکان، هـەروەها دژی دەوڵەتـە، هێنـدەی کـە لـە پێنـاوی جەنگدایە.

پاش ئەم پێشکەشکردنەی تیورەی کلاستەر سـەبارەت بـە کۆمـەڵگای سـەرەتایی، دەتـوانین رادەی تازەگەری لـە هەوڵـە فیکریەکانیدا دیـاری بکـەین، تازەگەریـەك کـە لـەو پرسـیارەدا دەردەکـەوێت کـە لـە بـارەی مانـای دەسەڵاتەوە دەیکات، یان لە رێگەی هێنانە ئارای جارێکی دی مەسـەلەی مێـژوو، هـەروەها رێکخـستنی پەیوەندی نێوان ئابوری و سیاسەت.

لـە راسـتیدا ئـەو حەدسـەی ئیلـهامی بـە کلاستەر لە تێفکرینیدا بۆ کۆمەڵگای سەرەتایی بەخشی، حەدسێك بوو کە خەسڵەتێکی سیاسی هەیـە. داتاکـان کـە لای کۆمـەڵێك چـاودێر و ئـەتنۆلۆجی دروسـتبوو، ئـەوەی سـەلماند کـە هەنـدێك لـە کۆمـەڵگا سـەرەتاییەکان دەوڵـەت ناناسـن و هـیچ ئاماژەیـەك بـۆ دەسـەڵاتێکی جیابۆوە نییە کە تاکێك یان چەند کەمایەتیەك بەسەر ئەوانی دیدا پیادە بکەن. ئەم دراوەش بە بەڵگەیـەك بـۆ نـەبوونی دەسـەڵاتی سیاسـی لای درنـدەکان و کامڵنـەبوونی جیهانـە کۆمەڵایەتیـەکانیان دانـرا. رەسـەنایەتی کلاستەریش دەگەڕێتەوە بۆ رەدکردنەوەی ئـەم تەفسیرە، کە ئەم رەدکردنەوەیەش دەیبات بەرەو دووبـارە دۆزینـەوەی مەسـەلەی سیاسـەت. کلاستەر پێیوایە نەبوونی دەوڵـەت لـە کۆمـەڵگا سەرەتاییەکاندا بە مانای "نەبوونی سیاسەت" نییە، بەڵگەش نیە بۆ کامڵنەبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیـەکان کـە لاوازی تەکنیکـەکانی بەرهـەمهێنان تەفـسیری دەکـات. بـەڵکو بـە پێـچەوانەوە هەڵبژاردنێکـە دەلالـەت لـە کـامڵبونێکی کۆمەڵایـەتی تـەواو دەکـات، هەڵبژاردنێکی "سیاسی" بەر لە هەر شتێك کە دەبێتـە هـۆی رێگـەگرتن لـە دەرکـەوتنی دەزگایەکی جیابۆوە لە کیانی کۆمەڵایەتی کە دەسـت بەسـەر دەسـەڵاتدا بگرێـت و رەدی دابەشبوون لەناو کۆمەڵگادا بەسەر فەرمانڕەوا و فەرمانبەردا دەکات.

ئـەم لۆژیکـە لـە کاتێکـدا بـە مانـای باسـکردنێکی تـازەی مەسـەلەی دەسـەڵاتە (ماهیەتەکـەی و پلەکـەی)، ئـەم خاڵانـەی خوارەوەی لە خۆگرتووە:

**یەکـەم** – گـوتنی ئـەوەی توندوتیـژی سـەرەتایی خەسـڵەتێك لـە خەسـڵەتەکانی درندایـەتی نیـە، بە گێڕانەوەشی بۆ خەسڵەتی بایـەلۆجی مرۆڤ (شەڕانگێزی) تەفسیر ناکرێت، یان بە ململانێی زیندوو لە نێوان کۆمەڵەکاندا، یـان بـە ئـاڵوگۆڕ، بەڵکو ئەم توندوتیژیە بـەر لـە هەر شتێك ئامێرێکی "سیاسیە" کە کۆمەڵ لە رێگەیـەوە پارێزگـاری لـە شـوناس و کەینونـەی سیاسی خۆی دەکات.

**دووهــەم** – گـوتنی ئـەوەی سیاسـەت بـەر لـە ئابووریـە، بـەو مانایـەی هەڵبـژاردنی سیاسـی کۆمەڵ مەرجەکانی ژیانی ئابوری دیاریدەکات. ئەگــەر کۆمــەڵگا ســەرەتاییەکان هــەوڵ بــۆ بەرهــەمهێنانی زیــادە نــادەن، ئــەوا ئەمــە بەشـێوەیەکی "ئەنقەسـت" دەکـەن. تـاکو لـەم ڕێگەیـەوە ڕێگـە لـە دروسـتبوونی وەبـەرهێنان و باڵادەســتی لــەناوخۆدا بگرێــت. بەمــشێوەیە چــیدی دەوڵــەت دەرئــەنجامی پەرەســەندنی هێزەکـانی بەرهـەمهێنان نییـە، هێنـدەی خـۆی دەبێـت بـە مـەرجێك بـۆ دەرچوونی ئـەم هێزانـە. واتە ناکرێت بە هۆکارە تـەکنیکی و ئابوریـەکان تەفسیر بکرێت، هێندەی بە گۆڕانی بنـەڕەتی لـە هەڵوێستی کۆمـەڵگادا بەرامبـەر بە دابەشبوونی کۆمەڵایەتی تەفسیر دەکرێت.

**ســـێهەم** – گـوتنی ئـەوەی هێنانـە ئـارای مەسەلەی دەسەڵات، ڕێگەیەکە بۆ تێگەیشتن لە کۆمەڵگای سەرەتایی، مادام سیاسەت دەکەوێتە ناوجەرگـــەی کۆمەڵایەتییـــەوە و جومگـــە سەرەکیەکانی پێکدەهێنێت. ئەمەش ئەو شتەیە کـە لـە پێـشتردا روینـەداوە، چ لـە روانگـەی پەرەســەندخوازیەوە کــە ئەگەرچــی کۆمــەڵگا سـەرەتاییەکان دەخاتـە نـاو مێـژووەوە، بـەڵام کـار بــۆ پەراوێزخــستنی لــە ئاســتێکی نزمــی پەرەسەندنی مرۆڤایەتیدا دەکات، ئاستێك پێش "شارستانیەت"، یان لە روانگەی بونیادگەریەوە کــە ڕەهەنــدی مێــژوویی ئــەم کۆمەڵگایانــە دەسڕێتەوە، بە ئیکتیفاکردنی بۆ تێگەیشتن لەو بونیادانـەی ئامـاژە بـۆ ئینتیمایـان بـۆ جیهـانی کلتــور دەکــەن، لــە هــەردوو حاڵەتەکەشــدا مەســـەلەی دەســـەڵات بـــەبێ دەرککـــردن دەمێنێتــەوە، شـتێك کـەوا دەکـات کۆمــەڵگای سەرەتایی کۆمەڵگا بێت، واتە ئەو جوڵەیـەی کە شوناسی پێدەبەخشێت، کە بە هۆیـەوە یـەکێتی خــۆی دادەمــەزرێنێ و لــە خــۆی دەگــات وەك یـەکێك لـە هەمانکاتـدا. بـە کـورتی دەبێتـە هـۆی تێنەگەیشتن لە بوونی "سیاسەت".

**چـوارەهەم** – پێشکەشکردنی وێنایـەکی تـازە بـۆ مێـژوو کـە وتـەزایی یـەکێتی گەشـەکردنی مێژوویی و پێکەوە گرێدراو، دوور دەخاتەوە کە دەبێتە هۆی ئەوەی هێزەکانی بەرهەمهێنان شان بـە شـانی ئامێرەکـانی کـۆنترۆڵ پەرەبـسێنن، و لەبری ئەمە وێنایەك دادەنێت کە لەسەر بناغـەی ئەو گوتەیە راوەستاوە کە بڕوای بە دابڕانێکی جەوهـەری لـە نێـوان جیهـانی پـێش دەوڵـەت و جیهـانی پـاش دەوڵەتـدا هەیـە. هــەروەها بــە ڕوودانــی شۆڕشــێکی بنــەڕەتی لــە شــێوەی هەڵبــژاردنی کۆمــەڵگا بــۆ خــۆی لــە ڕووی سیاسیەوە، کە گواستنەوە لە سیاسەتی پێش دەوڵەتەوە کە دابەشبوون و زەبر و زەنگی تێدا نیـە، بـۆ سیاسـەتی دەوڵـەت کـە لەسـەر بناغـەی دابەشــبوون و زەبــر و زەنــگ راوەســتاوە، نوێنەرایەتی دەکات. لێرەوە وەك غۆشێ دەڵێت وێنــای کلاســتەر شــێوەی چارەســەرکردنی مەسـەلەی سیاسـەت و بـەڕێوەبردنی، لنگـەوقوچ دەکاتەوە.

بێگومــان ئــەم شــیکردنەوەیە بــۆ واقعــی کۆمــەڵگای ســەرەتایی ڕێگــە لەســەرهەڵدانی هەنــدێك پرســیار ناگرێــت. چــۆن گــۆڕان لــە کۆمەڵگای پێش دەوڵەتەوە بۆ کۆمەڵگای پاش دەوڵــەت روویــدا؟ ئــەم پرســیارەش بەناچــار دەمانبـات بـۆ پرسـیارێکی دی، ئایـا کۆمــەڵگا

سـەرەتاییەکان، ئـەرکۆلۆجیای کۆمـەڵگاکانی هەنوکـەمان پێکـدەهێنن؟ واتـە ئایـا ئـەم کۆمەڵگایانەی هەنوکە، لەو شێوە کۆمەڵگایانەی هاوشێوەی کۆمەڵگا سەرەتایین، دروستبوون؟ و چـۆن ئـەم گواسـتنەوەیە لـە جیهانێکـەوە بـۆ جیهـانێکی دی روویـدا، لـە دەسـەڵاتێکی سیاسیەوە بۆ دەسەڵاتێکی دی تەواو جیاواز لە رووی ئەرك و پلەکانیەوە؟

دیـارە کلاسـتەر هوشـیار بـوو بـەوەی کـە دەشـێت بیرکردنـەوەکانی چـەندان پرسـیار بـوروژێنن. خۆشـی لـە پـەراوێزی وتـاری "شوێنەوارەکانی توندوتیژیدا" ئاماژە بۆ ئەمە دەکـات بـە هێنانـە ئـارای هەنـدێك کێـشە کـە پەیوەنـدیان بە مەسـەلەی دابەشـبوونەوە هەیـە. لەوانـە: ئایـا دینامیکیـەتی جـەنگ هـەڵگری مەترسی دابەشبوونی کۆمەڵایەتی نیە؟ کۆمەڵگا سـەرەتاییەکان چـۆن رەفتـار دەکـەن گـەر ئەمـە روویـدا؟ بـە مانایـەکی گـشتیتر لـە چ هەلومەرجێکدا دەشێت دابەشبوون لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا دەرکەوێت؟. ئەمـەش بە مانـای ئەوەیـە ئەگەرچـی کلاسـتەر کۆمـەڵگا سـەرەتاییەکانی بـە کۆمەڵگایـەکی دابەشـنەبوو داناوە، بەڵام مەبەستی لەمە ئەوە نییـە کە ئەم کۆمەڵگایـە دابەشـبوون ناناسـێت، یـان هـیچ بیرۆکەیـەکی لـێ نییـە، ئەگـەر نا هـیچ مانایـەکی نـەدەبوو باسـی رەدکردنـەوەی کۆمـەڵگای سـەرەتایی بـۆ دەوڵـەت و باسـی رووبەروبونەوەی مەسـەلەی دابەشـبوون بکات. چـونکە چـۆن رەدی شـتێك دەکەینـەوە، گـەر نەیناسین یان بوونی نەبێت؟ بەڵام گەر مەسەلەی دابەشبوون کە بە "مەتەڵی دەسـەڵاتی سیاسـی" دادەنرێـت، بـە چارەسـەر نـەکراوی مایـەوە، ئەگـەریش کلاسـتەر لـەو کاتـەدا کۆچـی دوایـی کـرد کـە رووبـەرووی ئـەم مەسـەلەیە بووبـۆوە — واتە گەڕان بە دوای نهێنیەکانی ئەم دابەشبوونە سـەرەکیەدا کـە وایکـرد دامەزرانـدنی دەوڵـەت شتێکی مومکین بێت، ئەوا کارەکانی سەرەڕای کەمیان، باشی هەڵسەنگاندنیان لەلایەن مارسێل غۆشـیەوە دەسـەلمێنرێ، بـەوەی کـە دەبێـت بـۆ خـودی کۆمـەڵگا سـەرەتاییەکان بگەڕێینـەوە بـۆ ئـەوەی پرسـیار لـە نهێنیـەکانی ئـەم گواستنەوە چارەنوسـسازە بـۆ دەوڵـەت بکـەین، ئـەوەش کـە ئێمـە زۆر دوور نـین لـە دۆزینـەوەی ئـەم نهێنیـەو کردنـەوەی شـفرەکانی. بەراسـتیش ئەمـە ئـەو کارەیـە کـە غۆشـیَ خـۆی کـردی کـە هەوڵیـدا لێکۆڵینـەوە لـە "سەرچاوەی دەوڵـەت" بکات بە گەڕانـەوە بـۆ واقعـی سـەرەتایی و لـە رێگـەی لێکۆڵینـەوەی بـۆ دیـاردەی دیـنی کـە ئـەمیش دیاردەیـەکی گـشتییە لـە کۆمـەڵگا سـەرەتاییەکاندا، رێـك وەك جـەنگ. بێگومـان غۆشـیَ پـشت بـە شـیکردنەوەکەی کلاسـتەر دەبەستێت بۆ پلەی دەسەڵات و ئەرکی سەرۆکی سەرەتایی، و سود لە هەوڵەکەی وەردەگرێت بۆ گێڕانـەوەی عـەقڵی سیاسـی. لـەو گرفتانەشـەوە دەسـتپێدەکات کـە باسـەکەی کلاسـتەر پێیگەیـشتووە. بـەڵام لێکۆڵینەوەکـەی بـۆ دیـنی سـەرەتایی پەنجەرەیـەکی دی دەکاتـەوە بـۆ مەسـەلەی جیابوونـەوەی سـەرەکی، کـە ڕەگـی واقعی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنیَ.

بەڕاسـتیش ئـەو هەڵکۆڵینـەی غۆشـیَ بـۆ رەگـەکانی واقعـی دیـنی کـردی، وەك لـە زۆربـەی

کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا دەردەکەوێت، ڕەهەندێك لە ڕەهەندە گرنگەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کەشفدەکات کە دەکرێت بەمشێوەیە کورتبکرێتەوە: دابەشبوونێکی سەرەکی هەیە کە لە سەرەتاوە درزە دەکاتە ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە، ماوەیەك لە نێوان کۆمەڵگا و خۆیدا هەیە کە هیچ کۆمەڵگایەك بێ ئەو ماوەیە نییە. جیابونەوەیەك هەیە لە بنەڕەتەوە هاوتای یەکێتی مرۆڤ و کۆبونەوەیانە. لێرەوە غۆشێ بواری کۆمەڵایەتی بە کۆمەڵێك دەربڕینی تازە عەقلانی دەکات کە بریتییە لە "کۆمەڵگایەك نیە بە سروشت یەك بێت، و ماهیەتی کۆمەڵایەتی بریتییە لە دابەشبوونی بەسەر خۆیدا".

ئەم جیابوونەوەیە کە بناغەیەکی سیاسی شاراوە لە بنەمای هەموو واقعێکی کۆمەڵایەتی و مەرجی ئەگەری هەموو دەسەڵاتێك پێکدەهێنێت، یەکەم دەرکەوتنی خۆی لە شکڵی دینیدا دەرخست کەوا دەکات مەرجەعی کۆمەڵگا "لە دەرەوە" بێت، واتە دووربخرێتەوە بۆ دەرەوەی کۆمەڵگا، بنەمایەك کە کۆمەڵگا دادەمەزرێنێ و کیانی پێدەبەخشێت و سەرچاوەیەك کە شەرعیەتی و ڕێکخستنی پێدەدات و شوێنێك کە لەوەوە مانای وەردەگرێت و لە ڕێگەی ئەو بنەمایەوە بیر لە خۆی دەکاتەوە. ئەم بنەما دەرەکیەی بناغەی کۆمەڵایەتی، کە ڕەگی دیاردەی دینی پێکدەهێنێت، بریتیە لە سەرچاوەی بیرۆکەی "دین". بیرۆکەیەك کە وا دەکات کۆمەڵگا خۆی لە ڕێگەی شتێکی دی جیاوازەوە بناسێت کە لەو بڕوایەی مرۆڤدا خۆی دەردەخات کە پێیانوایە ئەوان جیهانەکەیان قەرزاری هێزێکی دی (نا مرۆڤانە)ی باڵا و مەزنە، واتە ملکەچی و گوێڕایەڵیان بۆ بڕیارەکانی غەیب و نادیار، کە غۆشێ ناویدەنێت "دینی مانا". بەڕاستیش وێنای کۆمەڵگای بۆ خۆی لە ڕێگەی دینەوە، هەڵگری ڕەهەندێکی سیاسی و ڕەمزیە.

بڕوابوون بەوەی سەرچاوەی یاسادانان و بڕیاردان لە دەرەوەی کۆمەڵگا دێت، بریتییە لە ڕەدکردنەوەی کۆمەڵگا بۆ دەسەڵاتی ناوخۆی کە مافی بڕیاردان و فەرمان دەرکردنی هەبێت. تەسلیمبوون بە ملکەچی مرۆڤ بۆ جیهانێکی تر، لە ناوەڕۆکدا بریتیە لە هەوڵدانی کۆمەڵگا بۆ ڕێگەگرتن لە "ملکەچی مرۆڤ بۆ مرۆڤ" و لێرەوە داواکردنی "یەکسانی" ئەگەرچی لە ڕێگەی ملکەچیەوە بێت بۆ غەیب. بەمشێوەیە کۆمەڵگای سەرەتایی هەوڵدەدات لە ڕێگەی قەرزاری بۆ دەرەوە و ئەوی دی نادیار، ڕووبەڕوی ئەو دابەشبوونە بێتەوە کە هەرەشەی لێدەکات. هەروەها "چارەسەرێکی سیاسی" بدۆزێتەوە بۆ مەسەلەی جیابونەوەی پەیکەرێکی دەسەڵاتاوی جیاواز لە ناو کیانی کۆمەڵایەتیدا. شکڵی دینیش هیچ نییە جگە لە ڕێگەیەك کە کۆمەڵگای سەرەتایی بەهۆیەوە تەکبیری ئەو جیابوونەوەیە دەکات کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە بە کارکردن بۆ تەجمید کردن و بێلایەنکردنی. شکڵی دینی ئەو شێوازەیە کە کۆمەڵگای سەرەتایی لە ڕێگەیەوە، ئەو ماوەیە دەژی کە لە نێوان خۆی و خۆیدا هەیە و بەهۆیەوە تەعبیر لە شوناسی خۆی دەکات. کەوا بوو دەسەڵاتێك لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا هەیە، بەڵام مولکی مرۆڤ نیە، هەروەها یەکێتیەکی سیاسی هەیە، بەڵام

خۆبەخۆ نییە، بەڵکو دروستدەکرێت لە ڕێگەی بێلایەنکردنی ئەو دابەشبوونە بنەڕەتیەوە کە دزە دەکاتە ناو ڕەگەزی مرۆڤەوە. بەشێوەیەك هیچ ملکەچی و گوێڕایەڵیەك نییە بۆ ئەوی دی نامرۆڤ نەبێت، و بەشێوەیەك ڕێگە لە هەموو مرۆڤێك دەگرێت خۆی بە مەرجەعی کەسانی دی دابنێت.

لە بەرامبەر ئەمەدا لەو شێوەیەدا کە لە دەوڵەتدا بەرجەستە دەبێت، شێوەیەکی دی هەیە کە لە ڕێگەی کۆمەڵگاوە دەژی: مەسەلەی دابەشبوونی بەسەر خۆیدا بەشێوەیەك سەرچاوەی دامەزراندن و بڕیاردان دەگۆڕێت، و کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە بۆ دابەشوونێکی فعلی، و سیستەمی مانا دەگۆڕێت. بەڕاستیش لە دەوڵەتدا دابەشبوون لە ناو کۆمەڵگادا دروستدەبێت، پەیکەرێکی دەسەلاتاوی بە کردەوە دەردەکەوێت لە نێوان نوێنەرانی یاسا و زانیندا و ئەوانەی دەبێت ملکەچ بن، لە نێوان ئەوانەدا کە دەبێت فەرمان بدەن و ئەوانەی گوێڕایەڵ بن، لەناو دەوڵەتیشدا جیابوونەوەی کۆمەڵگا لە بنەماکەی، دەگۆڕێت لە ئامێرێکی بەدیهێنانی یەکسانی لە ناو کۆمەڵدا – وەك لە شکڵی دینیدا هەیە – بۆ ئامێرێکی ملکەچکردن. وا دەکات یەکێکی بەوی دیەوە وابەستە بێت و فەرمانڕەوا بە فەرمانبەرەوە. بەلاّم ئەگەر هاتنی دەوڵەت ملکەچی و ناچار کردن دەهێنێت، ئەوا لەلایەکی دیەوە بووە هۆی گۆڕانی ئەو شێوازەی کۆمەڵگا لە ڕێگەیەوە لە خۆی دەگات. چونکە دەرکەوتنی دەوڵەت بە مانای ئەوەیە "کۆمەڵگای مرۆڤ دروستکراوی خۆیەتی، و خاوەنی ماف و دەسەلاتن بەسەریدا، و دەتوانن چارەنوسی دیاریبکەن و ئازادن لە دەستێوەردانیدا". ئەمەش بە مانای ئەوەی هیچ مەرجەعێك بۆ کۆمەڵگا نیە، خۆی نەبێت.

بەلاّم ئەگەر دەوڵەت بە تەواوی شێوازی دینی دەگۆڕێت کە کۆمەڵگای سەرەتایی لە ڕێگەیەوە ئەو "ماوە سیاسیە" دەژیا کە دامەزرێنەری کۆی کۆمەڵگایە، و ئەگەر هاتنی دەوڵەت شۆڕشێکی بنەڕەتی لە مامەڵەی کۆمەڵگادا لەگەڵ خۆیدا و گۆڕانێکی چارەنوسسازی لە پلە و ئەرکەکانی دەسەلاّتدا دروستکرد، ئایا ئەمە بە مانای ئەوەیە ئێمە لەبەردەم هەڵبژاردنێکداین کە دەوڵەت لە بەرامبەر دیندا یان لە بەرانبەر –کۆمەڵگای دژی دەوڵەتدا – بەپێی تەعبیری کلاستەر، دادەنێت؟. ئەمە ئەو شتە نییە کە غۆشێ مەبەستێتی. چونکە ئەو لە کاتێکدا پەیوەندی میوانداری دێرینی نێوان دین و دەسەلاّت دوور دەخاتەوە، لە هەمان کاتدا پەیوەندی دوورخستنەوەی تازەی نێوان دین و دەسەلاّتیش دوور دەخاتەوە کە دارشتنەکەی بیار کلاستەر ئیحای بۆ دەکات. سەبارەت بە غوشێ ڕەگی دەسەلاّت و دین یەك شتە، چونکە هەردووکیان بە مانای ئەوەن کە بنەمای ڕێکخستنی کۆمەڵگا جیایە لێیان. ئەگەریش دەوڵەت هەڵسا بە هەڵگەڕانەوەی لۆژیکی کۆمەڵگای سەرەتایی کە دین تەعبیری لێدەکات، ئەوا دەوڵەت نیە کە دەرەکیبوونی بناغەی کۆمەلاّیەتی، دروستکردووە. یان ئەو شتە نیە کە ماوەی نێوان کۆمەڵگا و خۆی دروستکردووە. دابەشبوونێکی سیاسی بنەڕەتی هەیە کە لە

روانگەیـەكی دەسـەڵاتاویدا بەرجەسـتەیە كـە هاوتـەریبی جیهـانی مرۆڤـی نانـەمر، ئـەم روانگەیە كە دین تـەعبیری لێكرد، "بریتیـە لـە هـۆی هـەموو كۆمەڵگایـەك و شـكڵی یەكـەمی". لێـرەوە دیـن لـە رووی مێژووییـەوە مـەرجی ئەگەری دروستبوونی دەوڵەتی پێكهێنا. یان بە مانایەكی راستتر "بناغەی دین و دەوڵەت یەك شتە". بەمشێوەیە چیدی دەوڵەت شتێك نیە پێـشتر بـە هـیچ شـێوەیەك دەرنەكـەوتبێت، گـۆڕانێكیش نیـە كـە پێـشتر هـیچ پێـشینەو رەگێكی نەبووبێت.

لە شوێنێكدا كە دەوڵەت نیە، ئەوا بنەمای خودی دەوڵەت هەیە. ئەگەریش دەوڵەت كامڵ نابێـت "بـێ تەسـفیەكردنی دیـن"، وە ئەگـەر كۆتـایی لـۆژیكی خـودا (دەوڵـەتی) بـریتی بێـت لـەوەی كۆمـەڵگا خـۆی لـە رێگـەی دەوڵەتـەوە بە تەواوی عەقڵانی بكات، ئەوا ئەو دەرئەنجامانەی دەوڵـەتی تـازە لـە هەنـدێك شـێوەیدا – تۆتالیتاریەت– پێیگەیشت، نامانگەڕێنێتەوە بۆ سـەرەتایی یەكـەم نـەبێت، واتـە رەگـی دیـنی دەوڵـەت. ئایـا تۆتالیتاریـەت بـریتی نیـە لـە ئـارەزووكردنی كۆمەڵگایـەكی یـەكتا كـە هـیچ ئاماژەیـەكی بـۆ دابەشـبوون تیـا نـەبێت، كۆمەڵگایـەك خـاڵی لـە ململانـێ لەسـەر بەرژەوەنـدی، گونجـاو لەگـەڵ ئـەوەی لـە بـارەی خۆیـەوە دەزانێـت؟ ئایـا بەمـەش پێكهاتەیـەكی تـازە بـۆ مـەحاڵێكی كـۆن پێكنـاهێنێ: مـەحاڵێك ئەوەی مرۆڤ تەماشای هەقیقەتی كۆمەڵگاكەیان بكـەن، واتـە هەقیقـەتی دابەشـبوون نـاكۆكی شیاویان".

ئەمە لە روانگەی غۆشێدا بە چ مانایەكە؟ بە مانـای ئەوەیـە ئـەوەمان لـە بـیر نەچـێت كـە هەڵبـژاردنی كۆمـەڵگای دژی دەوڵـەت – ئەگەرچی بە مانای یەكسانیە – بەڵام لە لایەكی دیـەوە بـە مانـای "وەهمـە"، و هەڵبـژاردنی دەوڵـەتیش – ئەگەرچـی بـە مانـای زۆرداریـە – ئـەوە لەلایـەكی دیـەوە بـە مانـای رووبەڕووبونـەوەی هەقیقـەتی ئـەو پەیوەندیەیـە كـە مرۆڤـەكان بەیەكـەوە گرێـدەدات، واتـە سـەیركردنی ئـەو مەتەڵـەی كـە لـە دابەشـبوونی نێوان مرۆڤەكاندا هەیە و هەوڵدان بۆ كردنەوەی شـفرەكانی. لێـرەوە مەسـەلەكە بـەلای غۆشـێوە ئـەوە نیـە دەسـەڵات رەفـز بكەینـەوە، بـەڵكو بگەڕێینەوە بۆ رەگەكانی و رووبەڕووی هۆكانی ببینەوەو پرسیار لەو بناغانە بكەین كە لەسەری رادەوەستێت، و ئـەو هۆكارانـەی خـۆراكی لێـوە وەردەگرێت، ئەمەش تەنیا رێگەیەكە بۆ گەیشتن بە راستیەكەی و سنوردانان بۆ پراكتیكـەكانی. ئەگەریش شیكردنەوەكانی كلاستەر بۆ جـەنگ ئـەوەی دۆزیـەوە كـە جـەنگ ئـامێری كۆمـەڵگای سـەرەتاییە دژی دەوڵـەت، ئـەوا شـیكردنەوەی غۆشێ بۆ دینی سەرەتایی ئەوە دەدۆزێتـەوە كە ئەمە رێگەی كۆمەڵگای سەرەتاییە بۆ رێگـەگرتن لە دەركەوتنی دەوڵەت. بەڵام رێگەیەكە دواجار هـەڵگری ئەگـەری دروسـتبوونی دەوڵەتـە و مـەرجی دروسـتبوونی پێكـدەهێنێ. چـونكە مـومكین نـەبوو دەوڵـەت دروسـتببێت، ئەگـەر كۆمەڵگا لە بنەڕەتدا خۆی لە رێگەی بنەمایـەكی دەرەكیـەوە عـەقڵانی نەكردایە. دابڕان لـە نێـوان دین و دەوڵەتدا لە سەرەتاوە لە هیچەوە دەسـتی پێنـەكرد، بـەڵكو گـۆڕانێكی – ئەگەرچـی ریشەیش بێت – بۆ رەهەندێكی كۆمەڵایـەتی كـە

پێشتر هەبووە، ئەو ماوە (سیاسییەی) کە دەکەوێتە نێوان مرۆڤ و خوداوە، نێوان دنیایی و دینیەوە. لێرەوە ئەو پەیوەندیە هەیە کە لە نێوان دین و سیاسەت و دین و دەوڵەتدا هەیە. بەمشێوەیە دەکرێت بڵێین شیکردنەوەی غوشێ بۆ واقعی دینی تیشکێکی تازە دەخاتە سەر مەسەلەی دەوڵەت.

بێگومان ئەم روانگەیە بۆ دەسەڵات کۆمەڵێك دەرئەنجامی پراکتیکی لێدەکەوێتەوە، وەك لە کارەکانی کلاستەر و غۆشێدا دەردەکەوێت، بەشێوەیەك چەند ئەو قسەیە راست بێت کە پیاچونەوە بە بنەمای دەسەڵاتدا، دەبێتە هۆی پیاچونەوە بە رێساکانی مومارەسەی سیاسیدا. ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی لە رەخنەی کلۆد لۆفۆردا بۆ ئەو بەرنامە سیاسیانە دەردەکەوێت کە سنورێك بۆ دەسەڵات یان گۆڕانی یان بەرگریکردنی دادەنێت.

ئەگەر جیابوونەوە لە چنینی کۆمەڵایەتیدا — کە هەموو کۆمەڵگایەك بەهۆیەوە دروستدەبێت — بریتی بێت لە بنەمای دەسەڵات جا شکڵی چۆن بێت، ئەوا هەڵە و بگرە ساویلکەییە وا بزانین دەشێت دەسەڵات لە رێگەی بەلابردنی ئەوانەی دەستیان بەسەردا گرتووە، لەناو بەرین. بە دەربڕینێکی دی دەسەڵات لە روانگەی کلۆد لۆفردا بریتی نییە لە دەرئەنجامی دەستبەسەراگرتنی زۆردارانە بەسەر شتەکاندا، هەروەها تەنها بریتی نییە لە بەرجەستە بوونی ئیرادەیەکی خراپەکار، یان بریتی نییە لە "بە کۆیلەکردنێکی بەد" لە ئەزەلەوە کاری بۆ نامۆبوونی ئیرادەی مرۆڤ و دزینی هەقیقەتیان کردووە — وەك ئەوانەی بڕوایان بە یاسای بەرێوەبردنی خۆیی هەیە بە گریمانە وەریدەگرن — بەڵکو دەسەڵات هاوڕێی دەستنیشانکردنی بواری کۆمەڵایەتییە. دەسەڵات لەوێوە سەرچاوە دەگرێت زامنی شوناسەکەی دەکات، بەڵام نەك بە هاوشێوەبوون لەگەڵیدا، بەڵکو بە دوورکەوتنەوە لێی. لێرەوە دەسەڵات بە گۆڕانی ئیرادەیەکی بەد بە ئیرادەیەکی باش لەناو ناچێت، یان بە گۆڕینی فەرمانڕەوا بە یەکێکی دی، یان گروپێکی کۆمەڵایەتی بە گروپێکی دی. هیچ رێگەی دەربازبونێك لە دەسەڵات نییە، یان خەریکە وەك ئەو وێنایەی لێدێت کە فۆکۆ بۆ دەسەڵاتی هەیە: هیچ بەرگریەك نیە بە تەواوی بکەوێتە "دەرەوەی" بواری دەسەڵات. لەم روانگەیەوە تاوتوێی ئەو پرۆژانە دەکات کە داوای گۆڕان دەکەن و بڕوای وایە ئەم پرۆژانە جا چ ریفۆرمیست یان شۆڕشگێڕانە بن، خۆیان لە رووبەڕووبونەوەی دابەشبوون دەدزنەوە، وەك لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا دێتە پێشێ، بە جیاوازی بەڵگەکانی ئەم دوو گروپەوە. بانگەشەکەرانی "ریفۆرم" بڕوایان وایە دەوڵەت دەتوانێت یان لە رێگەی پەرەسەندنی تایبەتی خۆیەوە یان لە ژێر کاریگەری داواکاریەکانی خەڵکیدا — لە هەردوو حاڵەتەکەشدا بە هۆی زیادبوونی بەرهەمهێنان و رۆشنگەرییەوە کار بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتی بکات و هەوڵ بۆ کۆمەڵگایەکی پتر یەکسان بدات. بەڵام بانگەشەکەرانی "شۆڕش" بڕوایان وایە دەستبەسەراگرتنی دەزگای دەوڵەت لە رێگەی کۆیلەکان یان ئەو حیزبەوە کە رێبەرایەتیان دەکات و بەکارهێنانی کەرەسەکان، بەسن بۆ

دروســـتکردنی مەرجگـــەلێك کـــە دەتـــوانن باڵادەستی لەناوببەن. هـەردوو گروپەکـەش بە بڕوای کلۆد لۆفر سروشتی ناکۆکی نێوان ئاغا و کۆیلە نازانن کە لە ڕەهەندەکانی هەموو پانتایی کۆمەڵایـــەتی و درێژکراوەکانیـــدا هەیـــە. بـــە مانایـــەکی دی هـــەردوکیان تـــەنها تەماشـــای "ئـەرکی ڕاستەوخۆی" دەسـەڵات وەك چۆن بە واقعـی هەیـە، دەکـەن، واتـە ئـەو جوڵەیـەی بەهۆیەوە ئامێرەکانی باڵادەستی جیاواز کەڵەکە دەبێـــت، وەك کەرەســـە مادیـــەکان و زانـــین و مافـەکان و بڕیارەکـان، بـۆ بەرژەوەنـدی ئـەو کەســـانەی دەســـەڵاتیان بەدەســـتەوەیە و هەوڵدەدەن هەلومەرجی تایبەتیان بەهێز بکەن و بەمـــشێوەیە (کـــوێر دەبـــن) لـــە "وەزیفـــە ڕەمزیەکانی" (دەسەڵات) واتە ئەو جوڵەیـەی کە کۆمەڵگایەك بەهۆیەوە دیاردەکرێت، و شوناسی خـۆی بـە هـۆی جیابونـەوەی جەمـسەرێکی دەسـەڵاتاوی جیـاوازەوە بەدەسـت دێنێـت، کـە لێی جیانابێتەوە و وایلێدەکات شتێکی مومکین بێـت. ئـەم تێکەڵکردنـەش لـە نێـوان "واقعـی" و "ڕەمـزی"دا ڕەنگـە وا بکـات ئامـانجی ئـەو ململانێیانـــەی لـــە بـــوارە جیاوازەکـــانی کۆمـەڵگای مەدەنیـدا ڕودەدەن، بـریتی بێـت لـە هەڵگەڕانـەوەی پەیوەندیـەکانی هێـز لـە نێوان کۆمەڵە سیاسیەکان و دەوڵەتدا، ئەمـەش شـتێکە هـیچ شـتێکی ئـەوتۆ لـە هەقیقـەتی باڵادەستی ناگۆڕێت.

بە بڕوای کلۆد لۆفر ئەمە بە مانای گۆڕانی وێنایەکی ئەخلاقی بۆ دەسەڵات (بەد یان باش) نیـە بـۆ وێنایـەکی ئـاڵۆز. هـەروەها بـە مانـای بێهـودەیی ڕاپـەڕین و مـەحاڵی گەیـشتن بـە سـەربەخۆیی و جیـاوازی نییـە، سـەربەخۆیی کۆمەڵایـەتی لـە سیاسـی. بـەڵکو بـە مانـای سـەیرکردنی ڕەهەنـدێك لـە ڕەهەنـدەکانی کۆمەڵایەتیـە کـە تـا هەنوکـە دەمامکیـان بەسەرەوەیە (یان شاراوەن) بەهۆی "وەهمێکی دووانەییـەوە" یەکـەمیان بڕوابـوون بـە بـوونی دەسـەڵاتێك کـە بەڕاسـتی دەنوسـێت بـەو جێگەیـەوە کـە بـۆی دانـراوە کـە هەوڵـدەدات داگـیری بکـات و دووهـەم، بڕوابـوون بـە یەکێتیـەکی هەسـتپێکراوی واقعـی کـە هـەموو جیاوازیـەکان لـەناو خۆیـدا دەتوێنێتـەوە. ئـەم وەهمـە دولایەنیـە ئـەو شـتەیە کـە دەبێـت دژی ڕاوەستین. چونکە بێهودەیە ڕەدی ئەو جیاوازیە بکەینـەوە لـە نێـوان ئەوانـەی لەسـەرەوەن و ئەوانەی لە ژێرەوەن. هەروەها بێهودەیە ئیغرای خـەیاڵی دەسـەڵاتی یـەکێك بەسـەر هەموانـدا فەرامۆشبکەین. ئەوەی کە خەون بە لەناوبردنی دەسەڵات و هەڵهاتنی مەملەکەتی سەربەخۆیی و جیاوازیـــەوە لـــەبری دەبیـــنن، خـــەیاڵی کۆمەڵگایـــەکی گونجـــاو لەگـــەڵ خۆیـــدا بەشێوەیەکی هەڕەمـەکی دەکـەن، واتـە خـەیاڵی یـەك شێوازی بەرهـەمهێنان و نیـشتەجێبوون و پەیوەنـــدی و کۆبونـــەوە و بیرکردنـــەوە و هەستکردن و فێربوون.. وهتد، دەکەن. بەڵام چ مانایەکی هەیە خـەیاڵێك یـەك ڕوانگـە لـە بـارەی هـەموو شـتێك و هـەموو مرۆڤێکـەوە هـەبێت، ئەگەر خەیاڵی مەملەکەتێك نەبێت کە مەحکومـە بـە "دیـسپۆتیزم"؟ ئەوەشـی تەحـەدای ئـەم خەیاڵە دەکات ئەوەیە کە کۆمەڵگا ڕێکدەخرێت بـۆ گـەڕان بـەدوای یەکێتیـدا و ئەگەڕێتـەوە بـۆ خۆی لە ڕێگەی دەسەڵاتێکەوە کە تێیدەپەڕێنێ،

هەروەها شێوەی جیاوازی كۆمەڵگا هەیە كە ناكرێت دیاریبكرێت یان لە چوارچێوەی سیستەمێكی تۆتالیتاریدا لە قاڵب بدرێت. كەوابوو ئەم خەیاڵە توانای چارەسەركردنی ئەو ناكۆكیەی نیە كە لە ناو خودی دامەزراندنی كۆمەڵایەتیدا هەیە. لێرەوە دەبێ بیر و كار لە ئاسۆی جیهانێكدا بكەین، ئەگەری گاڵتەپێكردنی ئەو ئیغرایەمان پێشكەش بكات كە دەسەلآت هەیەتی، جیهانێك رەخنەی وەهم و تازەكردنەوەی سیاسی تیا دەكرێت لە ژێر تیشكی تاوتوێكردنێكی كۆمەلآیەتی و سیاسیدا كە هیچ چوارچێوەیەك كە كۆمەڵگا و نەتەوە و دەوڵەت دیاردەكات، دیلی ناكات.

**سەرچاوە:**

مجلة الفكر العربي، ژمارە 33. ئابی 1983. لا 76-86.

# مێژوی پەرەسەندنی هوشیاریی دیموکراتی مۆدێرن

ئالان تۆرین

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

(بەشی سێیەم)

**دەوڵەتی پارێزەر:**

ئایا دەکرێ جوغزی رەخنەی دیموکراسی بۆ تۆتالیتاریزم فراوانبکەین بەجۆرێك ئەو دەوڵەتانەش بگرێتەوە کە بە خەیاڵی کەسدا نایەت تۆمەتی تۆتالیتاریان بخاتەپاڵ؟ ئایا دەتوانین بڵێین سیاسەتی سۆشیال- دیموکرات و گەشەکردنی دەوڵەتی پارێزەر (حامی) دەبێتەهۆی بەهێزکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەر ژیانی گشتی و تایبەتدا، بەئەندازەیەك جۆرێك لە دەوڵەتی لێبکەوێتەوە کە هەرچەندە خاوەن سروشتی ئیستبدادیی تۆتالیتاری نییە، بەڵام وەك یۆرگن هابرماس دەڵێ رووبەرەکانی ژیان داگیردەکا. میشێل فۆکۆو هەموو ئەو کەسانەی لەژێر کاریگەریی فیکری ویدان ئەم پرسەیان بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە تاوتوێ کردووەو ووتوویانە: دەوڵەت لەرێگەی (دەزگا) جۆربەجۆرەکانیەوە دەستوەردەداتە هەموو ئەزموونەکانی ژیانەوە، ئیدی ئێمە هیچ نین جگە لەو شتەی کە دەوڵەت لەرێگەی دەستگیرۆیی و چاودێرییەوە دروستمان دەکا، کە زۆر بەروونی لە بوارەکانی خوێندن و تەندروستی و هاریکاریی کۆمەڵایەتیدا دەردەکەوێ. چیتر پێناسی ئێمە تەنها تۆمارێکی دیموگرافی نییە کە رەگەز، تەمەن، شوێن و بەرواری لەدایکبوون و پیشەمان دیاری بکا، بەڵکو کۆمەڵە رێوشوێنێکی کارگێڕییە کە بڕیاری پێشوەخت لەسەر رەفتارەکانمان دەداو چاودێریمان دەکا. بۆ نمونە مەرجەکانی فێرکردن، جۆری تەمویلی شوێنی نیشتەجێبوون، بگرە جۆری خزمەتگوزاریی تەندروستی...، ئاماژەگەلێکن بۆ ئاستی کۆمەڵایەتیمان. بەم دواییانە ژمارەی ئەو فایل و فۆرمانەی کە زانیاری دەربارەی باری

کەسێتیمان لەخۆدەگرن زیاتر بوون، بەشێکی زۆریان بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەی زانستی بەکاردێن، بەڵام گرفتی مەترسیداریشیان لێکەوتەوە، هەربۆیە چەند لیژنەیەك پێکهێنران بەمەبەستی بەرگریکردن لە پاراستنی نهێنیی زانیارییە شەخسییەکان. دەپرسین: ئایا ئەم دەستێوەردانە لە ژیانی تایبەتی تاکدا، کە خەسڵەتێکی رێکخستنی کارگێڕیو میتۆدی لێکۆڵینەوەی زانستییە، هەڕەشەیە بۆ سەر دیموکراسی؟ ئایا پێناسی شەخسیو ئەزموونە تایبەتەکانی ژیان لەبەردەم هەڕەشەی پۆلێنکردندان، کە هاوکاتن لەگەڵ دەستێوەردانی دەزگاکانی دەوڵەت یان دەزگا ئابوریو زانستییەکان لەو ئەزمونانەدا؟

ئەوەی مایەی نیگەرانییە ئەو دژبوونەیە کە لەنێوان کاری ستراتیجیو کاری پەیوەندیخوازیدا هەیە، یان بەمانایەکی نەریتی لەنێوان بەئەقڵانیکردن و سەربەخۆیی کەسێتیدا هەیە. بەڵام گەر هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر ئەو ئایدیۆلۆجیا پەرگیرەی، کە دژ بە کولتوری بەئەقڵانیکردنە، هەڵوێستی رەتکردنەوەو ئیدانە بێ، ئیدی چۆن دەکرێ سنور دابنێین لەنێوان رێکخستنی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ئەقڵانیو لەنێوان سەربەخۆیی ئەزموونی ژیاندا؟ ئایا فێرکردنی ئیجباریو کوتانی ئیجباری جۆرێکن لە پێشێلکردنی ئازادییەکانی تاك؟ ئەڵبەتە دەسبەجێ مرۆڤ وەڵامدەداتەوەو دەڵێ پێویستە یاساکان بخەینەگەڕو کەرەستەی ئەوتۆ دابنێین کە لەمپەرەکانی بەردەم یەکسانی لە دەرفەتدا هەڵدەگرن، یان ئەو لەمپەرانە لادەبەن کە بەهۆی هەژاریو نەزانیو بیروباوەڕە کۆنەکانەوە دروست دەبن. چونکە ئەم جۆرە ئیلتزامانە چەند فۆرمێکن لە فۆرمەکانی هاوڵاتیبوون، کە مرۆڤ پەسەندیان دەکا بەبەراورد لەگەڵ ئەرکەکانی وەك بەخشینی باج و بەجێهێنانی خزمەتی سەربازی، بەتایبەتی لەسەردەمی جەنگدا. ئامانجی بەشێکی زۆر لە سیاسەتە کۆمەڵایەتییەکان بریتییە لە ئاسانکردن و سووککردنی زوڵم و جیاوازییەکان، هەروەها بریتییە لە دابینکردنی جۆرێك لە سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی دەرامەتەکان. ئەو پرۆسەیە لە ئەوروپا چووە ئاستێکی بەرزەوە، تا ئێستاش لە هەڵکشاندایە. بۆ نمونە ئاستی دەرامەتی ناراستەوخۆ لە وڵاتێکی وەك فەرەنسا لە چارەکێکەوە بووە بە سێیەکی دەرامەتی خێزانیی. رەنگە ئەم رێژەیە بەرزتر ببێتەوە گەر ئامارێکی تەواو بۆ هاریکارییە گشتییەکانی پرۆسەی خوێندن بکەین. واتە کاری دەوڵەتی پارێزەر، خۆی لە خۆیدا، مایەی نیگەرانی نیە، بەڵکو ئەو دۆخی پاشکۆیەتییە نیگەرانی دەبەخشێ کە هاوڵاتیان لەکاتی وەرگرتنی هاوکاریی دەوڵەتدا هەستی پێدەکەن، هەروەها بێهوودەیی ئەو رێوشوێنانەی کە دەگیردرێنەبەر لە کاتی پرۆسەی دابەشکردندا.

جۆری دووەمی رەخنەکان لاوازترن. چونکە هەرچەندە ئەوە راستە کە خوێندنی خۆڕایی چەند ئەنجامێکی نایەکسانی لێدەکەوێتەوە، چونکە منداڵانی خێزانە دەوڵەمەندەکان ماوەیەکی درێژتر لەسەر کورسی خوێندن دەمێننەوە، هەروەها قوتابیانی خوێندنگا گەورەکان، لە وڵاتێکی وەك فەرەنسا بۆ نمونە، مووچە وەردەگرن بەو سیفەتەی فەرمانبەرانی

دواڕۆژن، لە کاتێکدا ئەوانە سەر بە خێزانە دەوڵەمەندەکانن. سەبارەت بە بودجەی تەندروستیش، هەرچەندە چەندین بەرنامەی گەورە بۆ بیمەی کۆمەڵایەتی دانراون، بەڵام کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر شێوازی دابەشکردن نەبووە، چونکە توێژە کۆمەڵایەتییە باڵاکان داهاتی ئەو بەرنامانە بەشێوەیەک سەرفدەکەن کە لە بەرژەوەندیی خۆیاندا بێ، هەر بۆ ئەو مەبەستەش راوێژ بە پسپۆڕەکان دەکەن. ئەڵبەتە ئەم رەخنەیەی ئێمە لەجێگەی خۆیدایە بەڵام سنورداره، چونکە دەکرێ مرۆڤ زۆر بەئاسانی وەڵام بداتەوەو بڵێ: سەرفکردنی بیمەی تەندروستی و فێرکاری بەشێوەیەک کە زیاتر لیبراڵی بێ ئەنجامی زیاتری لێدەکەوێتەوە کە دەچێتە خانەی نایەکسانییەوە، هەروەک لە سیستێمی تەندروستی ئەمریکیدا بەدی دەکرێ، چونکە دەبینین دەیان هەزار خەڵک هەن کە سوود وەرناگرن لە خزمەتەکانی سیستمێکی شیاو لە کایەی بیمە کۆمەڵایەتیەکاندا.

لەبەرامبەردا مەترسییەکی راستەقینە دێتەگۆڕێ سەبارەت بە پاشکۆبوونی ئەو کەسانەی کە سوود لە هاوکاریەکانی دەوڵەت وەردەگرن، تەنانەت گەر تەسلیمی ئەو بۆچوونە لیبراڵییە پەرگیرەش نەبین کە باس لە دەسپێشخەری تاکەکان دەکا، ئەڵبەتە ئەو بۆچوونەش حسابێکی ئەوتۆ بۆ کاریگەریی هەژاری و بێکاری و نەخۆشی و دەرەنجامە کارەستبارەکانیان ناکا بەسەر کەسایەتیدا. ئەمە بەرەو کێشەیەکی راستەقینە راپێچمان دەکا .چونکە ئایا ئەو هاوکارییەی کە دەوڵەت پێشکەشی توێژە هەژارەکانی دەکا نابێتە هۆی لاوازکردنی دیموکراسیەتێک کە پشتئەستورە بە دەستێوەردانی هاوڵاتیان لە کاری کۆمەڵایەتیدا، لە کاتێکدا توێژە هەژارەکان خاوەنی کەمترین وزەن لە کاری فەردی و دەستەجەمعیدا. پرسیارێکی لەمجۆرە هەڵگری کۆدژییە، چونکە بۆچوونە سۆسیۆلۆجیەکان دەربارەی یاسای مافەکان، بۆچوونەکانی دۆگی بۆ نمونە، کە بەرژەوەندی کۆمەڵگاو هاوکاری دەستەجەمعی بە پلەی یەکەم دادەنێ، دەسەلاتێکی بەرفراوانتر دەبەخشێ بە دەوڵەت، بەڵام هەروەک ئیڤلین بێزێ دەڵێ: ئەو بۆچوونانە دەرەنجامی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە. لێرەوە دەکرێ تەئویلێکی تایبەت ببەخشرێ بە یاسای کۆمەڵایەتی گەر مانایەکی وەسفی ببەخشین بە وشەکەو وەک ئامرازێکی پاراستنی تاک و کۆمەڵگا وێنای بکەین. بەڵام لە هەمان کاتدا دەکرێ، بەپێچەوانەوە، وەک ئامرازی یەکێتی کۆمەڵگاو نەتەوەش تەماشای بکەین.

هەمان بەدحاڵیبوون لە شێوازی کۆمەڵایەتییەوە پەڕیوتەوە بۆ ئاستی سیاسی، چونکە کەسانێک هەن پێیانوایە بەرنامەی سۆشیال- دیموکراتەکان جۆرێکە لە دەستێوەردانی دەوڵەت لە پەیوەندییە ئابورییەکاندا، هەروەها پێیانوایە جۆرێکە لە لکاندنی دەسەڵاتی سیاسی بە بکەری کۆمەڵایەتیی رێکخراوەوە، کە بزاوتی کرێکارانە. دەوڵەتی پارێزەر پەیوەستە بە سێ جۆر لە دیسپلینی سیاسیی گەورەوە کە دەکرێ لە یەکدیی جیابکەینەوە. واتە یان پەیوەستە بە یاسای پێکەوەگرێدانەوە، کە یاسایەکە هەوڵدەدا رژێم، بەپڕاوپڕی مانای وشەکە،

بەرقەرار بکا..، یان پەیوەستە بە یاسای پەیمانبەستنەوە، کە پەیوەندیی نێوان بەرژەوەندییە جیاوازو ناکۆکەکانی هێزە چالاکەکان ڕێکدەخا، ئەو هێزانەی کە دەبێ سەرباری جیاوازییان بەشداریی هەمان گروپی کۆمەڵایەتی بکەن..، یان پەیوەستە بە یاسای پاراستنەوە کە بەرگری لە تاکەکان و کەمینەکان دەکا، بگرە بەرگری گروپە زۆرینەکانیش دەکا، دژی دەسەڵاتی خودی دەوڵەت، یان دژی هەموو جۆرەکانی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵایەتی. بەڵام ئەوەی کەم تا زۆر بایەخ دەبەخشێ بەم ئاراستانە پێگەی دەستپێشخەریی یاساییە، چونکە گەر دەوڵەت ئەو پێگەیە داگیر بکا مانای ئەوەیە کە یاسا، بەپلەی یەکەم، یاسای پێکەوەگرێدانە. بەڵام گەر گروپە ڕێکخراوەکانی بەرژەوەندی ئەو پێگەیە داگیربکەن، مانای وایە یاسا هەڵگری سیفەتی پەیمانبەستنە. بەڵام گەر بێتو ئەو بزاوتانەی کە هەڵگری دیدێکی دیاریکراون بچنە ئەو پێگەیە، جا ئیتر ڕێکخراو بن یان نا، ماناکەی وادەکەوێتەوە کە بەرگریکردن لە مافی تاکەکەس زۆرترین بایەخی هەیە. بەهەمان شێوە دەکرێ بڵێین: ئیرادەی پێکەوەگرێدان کار لەسەر ڕێوشوێن و تەگبیری تایبەت دەکا، بەڵام ئیرادەی پەیمانبەستن کار لەسەر ئەو ململانێیانە دەکا کە هەڵگری مۆرکێکی گشتیترن. هەرچی یاسای پاراستنە کار لەسەر پابەندبوون دەکا بە چەند پرنسیپێکی گشتییەوە.

دەکرێ باشترین وەڵام بۆ ئەو پرسیارەی دەربارەی مانای تێکڕژانە کۆمەڵایەتیەکانی دەوڵەت دەخرێنەگەڕ، لەوەدا کورتبکەینەوە کە بڵێین: سەلماندنی گەڕان بەدوای چارەسەری گشتیدا باشترە لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی یەکلاکەرەوە، چونکە چارەسەری کۆمەڵایەتی بۆ کێشەی بێکاری چەند دەرەنجامێکی نێگەتیڤی لێدەکەوێتەوە، بۆ نمونە خولەکانی پێگەیاندن و ڕاهێنان، کە ناکرێنەوە بەسەر چەند ئاسۆیەکی پیشەیی ڕاستەقینەو هاریکاریی داراییدا، دەشێ ببێتە هۆی پەراوێزخستنی ئەوانەی سوود لەو خولانە وەردەگرن. لەبەرامبەردا تەنها وتووێژی دیموکراتانە وادەکا وێنایەکی دەستەجەمعیمان هەبێ لەبەرامبەر دیاردەیەکی وەك بێکاریدا، جا ئیتر لەڕێگەی فراوانکردنی گەشەپێدانی ئابوورییەوە بێ، یان لەڕێگەی دابەشکردنی کارەوە، یان لەڕێگەی هەر گۆڕانکارییەکی ترەوە بێ کە لە شێوازی کارکردن و مووچەدا ڕوودەدا. ئەڵبەتە دەسەڵاتی پەڕگیری بەئەقڵانیکردن ڕێگر نیە لەبەردەم ئامادەکردن و جێبەجێکردنی ئەم جۆرە سیاسەتە گشتییانەدا، بەڵکو ئەوەی ڕێگرە بریتییە لە لاوازی فیکرو کاری سیاسی. ئەو شتەش کە ناومان ناوە داگیرکردنی ژیانی تایبەتی هیچ نیە جگە لە بەرەنجامی بێتوانایی ئێمە لەوەی گوزارشت لە کێشە کۆمەڵایەتیەکان بکەین، یان چارەسەری سیاسیی بۆ بدۆزینەوە. بەڵام دواجار لە دۆخێکی ئاوهادا دەوڵەتی پارێزەر، هەڵگری هەر لاوازییەکیش بێ، باشترە لەوەی بازاڕ دەسەڵات بگرێتەدەست، ئەو بازاڕەی زۆر بێ ڕەحمانە بەشێکی زۆری خەڵکی پەراوێزدەخا.

دیموکراسی بوونی نییە گەر ئیعتراف نەکرێ بەو کێشە کۆمەڵایەتیانەی کە گوزارشت لە

پەیوەندییەکان دەکەن لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتانەدا کە بەشێوەیەکی ئازادانە هەڵدەبژێردرێن. لە حاڵەتێکی وادا زۆرێك لە پرس و ئەزموونەکانی ژیان وەك بەرەنجامی دابەشکردنی داهات تەماشا ناکرێن، بە دەربڕینێکی تر وەك دەرەنجامی سیاسەتێکی دیاریکراو لەقەڵەم نادرێن. چونکە گەر بێتو ئێمە ئەزموونی ژیان بە پرۆسەی بەئەقڵانیکردن بەراوردبکەین، ئەوا کایەی سیاسی لاوازتر دەکەین، بگرە هەموو سەرچاوەیەکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان و هەموو ئەگەرێکی سیاسیی نوێ لەبەیندەبەین. بۆ نمونە لەو وڵاتانەدا کە بەدەست بێکارییەوە دەناڵێنن، کێشەیەکی لەمجۆرە وەك قەدەر تەماشا دەکرێ، یان وەك دەرەنجامی بارودۆخی ئابوریی نێودەوڵەتی لەقەڵەم دەدرێ، کە هاوڵاتیان و بگرە خودی دەوڵەتیش ناتوانێ کاریگەرییەکی ئەوتۆ لەسەر دۆخەکە جێبێڵێ. هاوڵاتیان لە وڵاتانێکی وەك ئیسپانیاو ئیتالیا هیچ چارەسەرێکی ئابورییان بەدەستەوە نامێنێ، تەنها چاوەڕێی ئەوە دەکەن کە بەهای دۆلارو یەن بەرزببێتەوە یان بازاڕی ئەڵمانیو فەرەنسی ببوژێتەوە تا گۆڕان بەسەر چالاکیی ئابوریاندا بێو دۆخی کرێکاران و فەرمانبەرانیان باشتر ببێ. گەر شیکردنەوەی دۆخی گشتی ببەستینەوە بە وەسفی سایکۆلۆجیی دەرەنجامەکانی بێکارییەوە، ئەوە مانای وایە کە ئێمە لە کەشێکی نادیموکراتیانەداین، واتە ئێمە ئەگەری کارتێکردن بەدووردەگرین و هەڵبژاردنەکانی رای گشتییش لەبەرچاوناگرین. هۆکاری سەرەکیی لاوازیی دیموکراسی لە وڵاتە خۆرئاواییەکاندا لەوێوە سەرچاوەدەگرێ کە مۆرکی سیاسی لە کێشە کۆمەڵایەتییەکان دادەماڵدرێ، ئەوەش لاوازییەکە بەر لە هەر شتێك ئەوە دەردەخا کە فیکری سیاسی لاوازەو حیزبەکانیش پەنا بۆ ئەو شیکردنەوەو چارەسەرانە دەبەن کە حاڵی حازر هەموو بایەخێکیان لەدەستداوە.

رەنگە کارێکی مەترسیدار بێ گەر سنور دابنێین بۆ ئەو پێشکەوتنە درێژەی کە لە بیرۆکەی مافی سروشتییەوە پەڕیوەتەوە بۆ بیرۆکەی مافی کۆمەڵایەتی، یان راستتر ئەو کاروانەی کە گەشەی بە مافی سروشتی داو لە سیاقێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا بەرگریی لێکرد، نەك تەنها وەك چەند پرنسیپێکی گشتی لێیان بڕوانێ. بیرۆکەی ئازادی ئەو کاتە گەشەی کرد کە تەنها ئیعتراف بە مافە نیشتمانیەکان نەکرا، بەڵکو ئیعتراف بە گرێبەستی کاری دەستەجەمعیش کرا، دوای ئەوەی کرێکار ملکەچی تەواوی تواناکانی خاوەن کار بوو. بەڵام لەمڕۆدا ئەو کایەیەی کە پێویستە ببێتە بەرەی بەرگریکردن لە مافە بنەڕەتیەکان بریتیە لە کایەی پیشەسازیی رۆشنبیری، لەسەرو هەموویشیەوە تەندروستیو فێرکاری، جگە لە کایەی ژیانی مەدەنیو ئەو کایە فراوانەش کە فۆرمەکانی هەڵسوکەوتی مەعنەویو شەخسی لەخۆدەگرن. لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا هێندە بەس نیە کە بانگەواز بۆ مافە گشتیەکان بکرێ بەرووی ئەو رێسا ئیداریانەدا کە ئامانجیانە زەبتو رەبتی کەمینەکان بکەن و زۆرینەش دڵنیابکەنەوە، بەڵکو پێویستە بەر لە هەر شتێك تواناکانی گوزارشت لەخۆکردن و

دەسپێشخەری لای ئەو کەسانە بەرزبکرێتەوە کە پێویستە وەك چەند هێزێکی چالاك ئیعترافیان پێبکرێ نەك تەنها وەك قوربانی سەیربکرێن. ئەڵبەتە ناکرێ تەنها لەڕێگەی تێڕامان و تێفکرینەوە کایەی سیاسی فراوان بکرێ، بەڵکو ئەو کایەیە تەنها لەڕێگەی چەند نێوەندێکی بەرجەستەوە دەسەپێنرێ، هەروەك چۆن لای هۆمۆسێکسواڵەکان بینیمان کە پێشتر لە چەندین وڵاتدا قوربانیی دەستی شێوازەکانی جیاکاریو پەراوێزخستن بوون، بەتایبەتی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. واتە ئەوەی پێویستی بە پاراستن و هاندان هەیە تەنها ئەوانە نین کە لە ئەزموونی ژیاندان، بەڵکو ئەو توێژانەشە کە چەوساوەن و بەچاوی سووك تەماشادەکرێن تا توانای کارو چالاکییان هەبێ. ئەوەش کە پێویستە دژی بجەنگێین خودی بەئەقڵانیکردن نیە، بەڵکو ئەو دارمانەیە کە وای کردووە (ژیان) لە دنیای مومکینەوە گلۆرببێتەوە بۆ دنیای پێویستیەکان. یان بەمانایەکی تر ئەو جیاکارییەی کە خراوەتە نێوان سیاسەتی ئابوریی پەتیو ڕێوشوێنەکانی هاریکاریی کۆمەڵایەتی. چارەنوسی دیموکراسی –لەو وڵاتانەدا کە ڕێز لە ئازادییە بنەڕەتیەکان دەگرن– بەر لەهەر شتێك بەندە بە ڕێکخستنەوەی ژیانی سیاسی لەڕێگەی پێکهێنانی بزاوتی کۆمەڵگەیی نوێوە، هەروەها لەڕێگەی تازەکردنەوەی شێوازی تێگەیشتن بۆ پرسە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان.

ئەو سەردەمە ژیاین کە ئەستێرەی سیاسەتی سۆشیال– دیموکرات ئاوابوو، ئەو سیاسەتەی کورتبۆوە بۆ دروستکردنی چەند ڕێکخراوێکی پیشەییو سەقامگیرکردنی چەند گروپێکی بەرژەوندیخواز لە چوارچێوەی دەوڵەتدا. ئیتر دەوڵەت لە سایەی ئەو سیاسەتەدا تەنها تەمویلی چەند کەرتێکی بەرخۆر دەکا کە زۆر بەخێرایی زاووزێ دەکەن. پێویستە سەرلەنوێ فێری ئەوە ببین بە چ شێوەیەك دەبینە خاوەنی دیدێکی گشتگیر بەرامبەر کۆمەڵگایەك، کە لە یەك کاتدا دابەشکەرو بەرهەمهێن و بەرخۆریشە، بەجۆرێك دەرفەتمان هەبێ چالاکیی کۆمەڵایەتیو سیاسیی نوێ ئەنجام بدەین و چەند گرەوێکی نوێ بخەینەڕوو کە ڕۆشنبیرەکانمان دیاریی بکەن و بەهاکانی بنرخێنن. چونکە ئایندەی دیموکراسی تەنها بەند نیە بەو بەرکەوتەی بەرهەمی ناوخۆی دەوڵەت کە (بەسەر هاوڵاتیاندا) دابەش دەکرێ، بەڵکو زیاتر بەندە بە توانای ئێمەوە لەوەی وەك بکەری چالاك کار لە کایەیەکی نوێی کۆمەڵایەتیدا بکەین، هەروەها بەندە بە هەڵبژاردنی سیاسەتێکەوە کە زوڵم و جیاوازییەکان بەرتەسك دەکاتەوەو مشتومڕی سیاسی دەژێنێتەوە. ئێمە پێویستمان بەو ڕەخنانە هەیە کە ئاراستەی دەوڵەتی پارێزەر دەکرێن هەروەك چۆن پێویستمان بە گەڵاڵەکردنی چەندین فۆرمی نوێی بەرهەمهێنان و ململانێی کۆمەڵایەتی نوێ هەیە کە لە ڕێگەیەوە ڕۆڵی ریفۆرمخوازانە ببەخشین بە سیاسەتی کۆمەڵایەتی، هەروەها لەپێناو بەرتەسککردنەوەی جیاوازییەکان و پاراستنی ئاسایش و ئازادیی زۆرترین خەڵك.

**لاوازیی دیموکراسی:**

پاش ئەم تێڕامانە لە مێژووی دیموکراسی ئەو دەرەنجامە چییە کە دەسگیرمان دەبێ؟

رەنگە دوو بیرۆکەی دژبەیەك بێنەگۆڕێ. یەکەمیان هەر لە سەرەتاوە خۆی بەسەرماندا دەسەپێنێ دەربارەی دەرکەوتنی یەك لەدوا یەکی سێ رەهەندە سەرەکییەکەی دیموکراسی: هاولاتیبوون، سنووردارکردنی دەسەلاتی دەوڵەت و سیفەتی نوێنەرایەتیکردن، پاشانیش دەرکەوتنی چەند فۆرمێکی نوێی دیموکراسی کە رۆژ بەرۆژ لە کامڵبووندان. سەرەتا باس لە جێگیرکردنی سەروەری میللی و دامەزراندنی دەوڵەت- نەتەوەو کرا، بەتایبەتی لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو فەرەنسا..، پاشان باس لە پێکەوەگونجاندن لەنێوان پرنسیپی کۆماریخوازیو پرنسیپی لیبراڵیدا کرا لەو رژێمە دیموکراتیانەدا کە ملکەچی چاودێریو کۆنترۆڵن، ئەڵبەتە سیستمی سیاسیی بەریتانیا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا نمونە تەواو و دیارەکەی ئەو پێکەوەگونجاندنە بوو. دواجار باس لە دەرکەوتنی دیموکراسیی نوێنەرایەتیکردنی جەماوەری کرا، کە لە یەك کاتدا کۆماریخوازیو لیبراڵیو کۆمەلایەتییشە، واتە ئەو دیموکراسییەتەی کە لە سەدەی بیستەمدا بەهێزترین نمونەی ئەفراند، لە فەرمانڕەوایی (نیودیل)ی رۆزفلت-ەوە، بۆ فەرمانڕەوایی بەرەی میللی لە فەرەنسا، تا دامەزراندنی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی *Welfare State* لە ئینگلتەرا. ولاتانی ناوەڕاستی ئەورووپای خۆرهەلات و ئەمریکای لاتین هەوڵی لاساییکردنەوەی هەمان نمونەی سیاسیان دا، بەو ئومێدەی ئەوانیش ببنە ولاتی دیموکرات. هەر ئەو نمونەیە بووە مەرجەعیەتی سیاسیی لە هندستان، "کە گەورەترین دەوڵەتی دیموکراتیە لە جیهان"، هەروەها بووە مەرجەعیەتی ئەو ولاتانەی خەباتی بێوچان دەکەن لەپێناو دیموکراسیدا وەك کۆریا و باشوری ئەفریقا. بەلام ئەم دیدە گەشبینە دەسبەجێ پرسیارێکی رەشبینانە بەدوای خۆیدا دێنێ. پرسیارەکەش ئەوەیە: ئایا پێکەوەگونجاندنی لەسەرخۆ لەنێوان ئەو سێ رەهەندەو دەرکەوتنی فیکری دیموکراسیی پەتی نابێتەهۆی لاوازبوونی خێرای دیموکراسی؟ ئایا دیموکراسی لە سەرەتای مێژوی دەرکەوتنیدا جوانترین رۆژەکانی ژیانی خۆی نەژیا، وەك ئەوەی لە ئەسینای کۆن روویدا، یان گەر لە مێژوویەکی نزیك قسەبکەین کاتێ دەستوری ئەمریکی نوسرایەوە، یان کاتێ جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاولاتی راگەیەندرا، یان ئەو رۆژگارانەی کە بەریتانیای مەزن لەبەر رۆشنایی جارنامەی مافەکان *Bill of Rights* دەژیا؟ ئایا سەدەی هەژدە سەرکەوتنی بیرۆکەی کۆماریخوازیی بەخۆوە نەبینی، ئایا سەدەی نۆزدەش سەرکەوتنی رژێمە دیموکراتە سنوردارەکان و پاشان گەمارۆدانی ئەو رژێمانەی بەخۆوە نەبینی، دواجار ئایا سەدەی بیستەم تەقینەوەی رژێمە دەسەلاتگەرەکان و فراوانبوونی بێباکیی سیاسیی لە دەوڵەمەندترین ولاتاندا بەخۆوە نەبینی؟ داخۆ شتایشی زارەکیی دیموکراسی، وەك جۆن دیۆن بەگاڵتەپێکردنەوە ووتی، ئەو داڕمانە ناشارێتەوە کە بەسەر پێگەی بیرۆکەی

دیموكراســـــیدا هـــــاتووه، بـــــەجۆرێك وەك نمونەیـەكی بـاڵای ئـیرادەی راسـتەوخۆ وێنـای دەكـا كـە پایـەداربوونی مەحاڵـە، هەرچـەندە شایانی رێزە؟ ئایا ئەو متمانەیە لەبەین نەچووە كە لە هەندێ وڵاتدا، بەتایبەتی لەلایەن نوخبەی زۆر كەمی سیاسیو رۆشنبیرییەوە، بە بیرۆكەی سەروەریی میللیو دیموكراسی بەخشراوە..، لە كاتێكـدا سیاســەت بۆتــە زەوییـــەك لەلایـــەن لەشكرەكانی بازاڕو بەرخۆرییەوە داگیردەكرێ؟ دوا پرسیار: ئایا دەتوانین قسە لە سەركەوتنی دیموكراسی بكەین لە كاتێكدا متمانە بە كاری سیاسی بەرەو لەناوچوون دەچێ؟

بـۆ وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارە سـەرەتا دەڵێن: مەحاڵە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا وێنـای رژێمێكی دیموكراسی بكـەین، كـە لەیـەك كاتدا كۆمـاریو لیبراڵـیو كۆمەڵایـەتییش نـەبێ، لـە كاتێكدا زۆربـەی رژێمە دیموكراتـەكان رازی نین بەو سێ پێوەرە. سەردەمانێكی درێژە مرۆڤەكان رێگەی دەستووریی ئاسان دەگرنەبەر بۆ ئەوەی خۆیـان لـە دیكتاتۆریـەت و سـتەمی زۆرینـە بپارێزن، لـەو رێگانـەش: سنورداركردنی مـافی دەنگدان، جڵەوكردنی شـێوازی خۆگەیانـدن بـە نوخبـەی دەسـەڵاتدار، دامەزرانـدنی ئەنجومـەنی بـاڵای پیاومـاقوڵان، مەسـەلەی مەحـسوبیەت و بـەرتیل و گەنـدەڵیو.. هتـد. بـەڵام دامەزرانـدنی پـــــارت و ســـــەندیكا جەماوەرییـــــەكان، بەرزكردنـەوەی ئاستی فێركاری، بڵاوبوونـەوەی بـەرخۆریی جـەماوەریو گەشـەكردنی هۆكـانی راگەیاندنی جەماوەریی..، كارێكی وای كردووە كـە سـەختە پێكـەوەگونجان لـەنێوان هـەردوو رۆڵەكـــەی سیـــستمی سیاســـیدا ســـازبدرێ: رۆڵێكیـان كەسـە دەستڕۆیـشتووەكانی دەوڵـەت ئـەنجامی دەدا، رۆڵێكیـشیان گوزارشـتكردنە لـە سۆزو داواكارییە میللییەكان.

كەڵەكـــەبوونی كێـــشە نەتەوەییـــەكان و هەسـتیاریی دانیـشتوان، كـە زۆربـەیان خـاوەن مووچـــەو كـــرێن، لەئاســـت قەیرانـــەكان و فراوانبـوونی ئابووریـدا، هـەروەها گونجانـدنی ئـابوری لەگـەڵ كاریگەرییـە دەرەكیەكانـدا..، هەموو ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی كە پایەكانی دیموكراسیی كۆمەڵایەتی بلەرزێو زۆر جاریش دابڕمێ. ئەو پایانەی كە بە هاوپەیمانیی نێوان دەوڵـەت و هێـزە سـەندیكاییەكان دامـەزراوە. بـــەمجۆرە دەبیـــنین توخمـــە پێكهێنـــەرەكانی دیموكراســـی زیـــاتر كرمـــێ دەبـــن و خەریكـە هـاوڵاتیبوون دەبێتـە پێناسـی كولتـورێكی، وەك چـۆن سـنورداركردنی دەسـەڵات لەڕێگـەی مافـە بنەڕەتیەكانـــەوە بۆتـــە جیاكردنـــەوەی ژیـــانی تایبـەتی لـە ژیـانی گـشتی. هەرچـی مەسـەلەی نوێنەرایـــەتیكردنی بەرژەوەندیەكانیـــشە ئـــەوە خەریكـە دادەبـەزێ بـۆ ئاسـتی تواندنەوەیـەكی پیـــشەیی نـــوێ لـــەنێوان دەوڵـــەت و چـــینە كۆمەڵایەتییـــە كۆنەكانـــدا. بـــەڵام چوارچـــێوەی دەوڵەت– نەتەوە، كە دەرفەتی رەخساندووە بۆ هەر سێ پێكهاتەكە تا یەك بگرن، ئەویش خـۆی لە خۆیدا توشی لاوازیی هاتووە، بەتایبەتی لـەو وڵاتـــە ئەوروپیانـــەدا كـــە بەشـــداریيان لـــە گەشـــەپێكردنی فیكـــرو كـــاری دیموكراتیـــدا كردووە. بۆ نمونـە دەوڵـەتی كۆماری لە دۆخـی لەناوچـوونی حەتمیدایـە. ئێمـەش چـیتر ئـەوە قەبوڵ ناكـەین كـە بەناوی دەوڵـەتی گشتگیرەوە تایبەتمەندیو جیاوازی گروپـەكان لـەناوببرێن،

بەڵكو خودی ئەم زاراوانە مرۆڤ توشی ڕاچەنین دەكا لە كۆتایی سەدەیەكدا كە چەندین دەوڵەتی تۆتالیتاری بەخۆوە بینی.

ئەوەی پاشەكشێ دەكاو لەناودەچێ تەنها ئەم جۆرەی دەوڵەتی پاوانخواز نییە، كە سودی لە مۆدێرنە وەرگرتووە، بەڵكو دەوڵەتی نەتەوەیی دیموكراتیشە، كە لە ڕوونترین نمونەدا لە بەریتانیای مەزندا بەرجەستەبوو، كە تا ئێستاش مانشستەر مەڵبەندە زیندووەكەیەتی. ڕۆڵی بەرزی پارلەمانەكان پێگەیەكی بەرزی بەخشیوە بە ژیانی كۆمەڵگەیی، چونكە دەوڵەت لەژێر چاودێریی ڕاستەوخۆی پارلەماندا بووەو دەسەڵاتە ئیدارییەكانیشی سنوردار بوون. هێزە كۆمەڵایەتییە چالاكەكانیش نوێنەرایەتی كراون، هەرچەندە ئەو نوێنەرایەتیكردنە لە ولاتێكی وەك بەریتانیا لە ژێر چەندین قەیدو مەرجدا بووە. بەهەمان شێوە مشتومڕی پارلەمانی دەربارەی كۆمەڵگا لەئارادا بووە. بەڵام سیستیمی سیاسیو بەتایبەتی پارلەمان، ڕۆڵی مەركەزیی خۆیان لەدەستداوە. ئەو پاشەكشێیە، هەروەك ڕەخنەگرانی حزبە پەڕگیرەكان، لە ئۆسترۆگۆرسكی-یەوە تا مایكلز، ئاماژەیان پێداوە، لەمێژە دەستی پێكردووە. بەڵام خودی ئەو حزبانەش وردە.. وردە بەرەو لاوازبوون دەڕۆن، لەكاتێكدا دەوڵەت سەرقاڵی ئەو گوشارانەیە كە بازاڕو پێداویستییەكانی بازاڕ دروستی دەكەن. ئیتر لەمەودوا دەتوانین باس لە سەركەوتنی دیموكراسی بكەین لە كاتێكدا سیستمی سیاسی بەرەو لاوازبوون دەڕوا، بەوجۆرەی لە زۆربەی ولاتەكاندا بینیمان. ئەمە لە كاتێكدا كەمجار بینیومانە دارمانی ڕژێمە دەسەلاتگەرەكان ببێتەهۆی پتەوكردنی گیانی مشتومڕی پارلەمانی.

ئێستا دەوڵەتان كەمتر بیر لە داپلۆسین دەكەنەوەو زیاتر سەرقاڵی گەشەی ئابورین، ئامانجەكانیان زیاتر ئابوریو كەمتر سیاسین، بەرلەوەی پشت بە پۆلیس ببەستن پشت بە سەرمایەگوزاری دەرەكی دەبەستن تا گوشارە كۆمەلایەتیەكان لەسەر خۆیان كەم بكەنەوە. لەڕاستیدا ئەم ئاراستە نوێیە سەرنجڕاكێشە. ئێستا لەكاتێكدا ولاتان دووچاری سەرئێشەو كێشەی زۆر دەبنەوە، كەچی ڕووبەری سیاسییان چۆڵو بێدەنگە. واتە زۆر ئومێد بە كاری سیاسی نابەخشرێ، ئیتر ئەو كارە سیاسییە شۆڕشگێڕانە بێ یان نا. خەڵكانێكیش ئەو دۆخە نوێیە لە بەرژەوەندیی خزمەتی ئابوری یان شەخسیدا بەكاردێنن. خەڵكانێكی تریش لە پەراوێزدان و هەموو ئومێدێكیان لەدەستداوە بەوەی لە پەراوێز دەرچن. تاقمێكی سێیەمیش هەن، لەو بەینەدا، یان پەنادەگرن و دەچنە خەڵوەتەوە یان پەنا بۆ توندوتیژیو لادان دەبەن. ئیتر سیاسەت دەسەلاتی ئەوەی لەدەستداوە گوزارشت لەو داواكاریانە بكا كە ناتوانێ فۆرمێكی سەربەخۆ بەخۆی ببەخشێ. ئێستا سیستمی سیاسی لە كۆمەڵگا دابڕاوە، لە ولاتە دەوڵەمەندەكان كولتوری گەنجان و كەناڵەكانی ڕاگەیاندن و فریوی بەرخۆری چەندین گوزارشتی غەیرە سیاسی بە داوا كۆمەلایەتیەكان دەبەخشن. لەبەرامبەردا دەبینین گوشاری دەوڵەت و ئابوری

نێودەوڵەتی کۆنترۆڵی ژیانی تاکەکەسی کردووەو لەفراوانبووندایە. پاشەکشێی حەتمیی دەوڵەتی کۆماریی نابێ روانینمان لێڵ بکاو ئەو پاشاگەردانییە نەبینین کە دۆخی سیاسیی تەنیوەتەوە، بەئەندازەیەك کە (چینی سیاسی) وەك چینێکی بێزراو دەردەکەوێ‌و دیموکراسی لە هەموو ناوەرۆکێك بەتاڵکراوەتەوە. هەربۆیە چیتر نابێ خۆمان بەو وەهمەوە غافڵ بکەین کە تەماهی لەنێوان دیموکراسی‌و پرۆسەی سنوردارکردنی دەستێوەردانی دەوڵەتدا دروستدەکا.

تا ئێستا ئێمە نازانین چۆن کێشە گەورەکانی چاخی ئێستامان ناوبنێین، تا ئێستا نازانین چۆن دەربارەیان بدوێین و گوزارشتی سیاسیان بۆ بدۆزینەوە. بەڵکو زیاتر لە گۆشەنیگایەکی ئەخلاقی‌و مرۆییەوە پەییان پێدەبەین، هەروەك فیبۆشورەکان[*] (خاوەن مەیلە مرۆییەکان) لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا ئەو کارەیان دەکرد، ئەو دەمەی کە هێشتا کاری سەندیکایی‌و فیکری سۆشیالیستی مەودای خۆیان وەرنەگرتبوو. بەلآم بەگەڕخستنی فیکر لە کاروباری دیموکراسیدا تەنها بە شیکردنەوەی مافە دەستورییەکانەوە ناوەستێ، هەرچەندە ئەو شیکردنەوەیە کەمبایەخ نیە، تەنانەت تەنها بەوەوە ناوەستێ کە بەشوێن ئامرازی پەیوەندیی نوێدا بگەڕێ لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی سیاسی‌و کۆمەڵگەی مەدەنیدا، بەڵکو پێویستە بەر لەهەر شتێك پرسیار بکرێ دەربارەی سروشتی کێشە کۆمەلآیەتی‌و سەندیکاییە گەورەکان کە هەموو گرەوێکیان لەسەر دەکرێ دەربارەی مشتومڕو بڕیاری سیاسی. چونکە دیموکراسی توشی لاوازبوون دێ، گەر دیموکراسیەتی نوێنەرایەتیکردن نەبێ، بەهەمان شێوە تووشی داوەشان دێ گەر هێزە کۆمەلآیەتیە چالاکەکان توانایان نەبێ داواکاری‌و ئومێدەکانیان گەلآڵە بکەن. بەلآم دەبێ خۆمان لە رەشبینییەکی رادیکالآنە بپارێزین کە وامان لێدەکا لێکچوون بسازێنین لەنێوان دیموکراسی‌و ئەو شێوە تایبەتەی دەوڵەتی کۆماری کە لە فەلسەفەی چاخی رۆشنگەرییەوە ئیلهامی وەرگرتوە. ئێستا وێکچوون لەنێوان مرۆڤ و هاولآتیدا نەماوە، هەروەك چۆن وێکچوونێکی گشتیتر لەنێوان سیستم و هێزە چالاکەکاندا کۆتایی هاتووە. بەلآم ئێمە زیاد لە پێویست تەئکیدمان لەوە کردەوە کە ئەم جۆرەی دیموکراسی دەبێتەهۆی سەپاندنی سانسۆری دەوڵەت بەسەر تاکەکاندا، هەروەك چۆن دەبێتەهۆی پایەداربوونی سەروەرییەکی میللی ئایدیاڵ. کەواتە با ئەم جیاکاریە پەسەند بکەین، بەلآم لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودا. چونکە لەلایەکەوە سەربەخۆیی هەر یەکێك لەو دەزگایانە گەشەدەکا، هەر لە زانستەوە کە بەهۆی بزاوتی ناوەکییەوە پەرەدەسێنێ، تا ئاستی بەرهەمهێنان کە لەڕێگەی بازاڕەوە رێکدەخرێ. لەلایەکی ترەوە هێزی کۆمەلآیەتی تەنها هەوڵ بۆ ئەوە نادا کە بەشداری لە سیستمدا بکا، بەڵکو هەوڵدەدا پێناسی خۆی گەلآڵە بکا تا لەلایەن هێزە کۆمەلآیەتییە چالاکەکانی ترو دامودەزگاکانەوە ئیعتراف وەرگرێ. بەمجۆرە پێویستە سەرلەنوێ

پێناسەی دیموکراسی بکرێ بەوەی بریتیە لە پێکەوەگونجان لەنێوان ئەو لۆجیکەدا کە سیستمە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکان جڵەودەکا لەلایەك و گوزارشتکردنی مرۆڤ لەخۆی لەلایەکی ترەوە، بەڵام دەبێ ئەو پێکەوەگونجاندنە لە دەرەوەی هەر پرنسیپێکی یەکخستنی باڵاوە بمێنێتەوە. دیموکراسی لە بەرامبەر هەڕەشەکانی ستەمگەری لەلایەك و دەسەڵاتی بازاڕی پیشەیی نوێ، یان لیبراڵیزمی پەڕگیر، لەلایەکی ترەوە، بەرجەستەدەبێ. یان، بەپێچەوانەوە، دیموکراسی لە بەرامبەر مەترسییەکانی یەکخستنی توندو دەسەڵاتگەرانە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی بەرجەستەدەبێ. دەتوانین ئەم لێکترازانە لەنێوان هێزە چالاکەکان و سیستێم، یان لەنێوان هاوڵاتی و دەوڵەتدا، بە پتەوبوونی ئەو دیموکراسیەتە لەقەڵەم بدەین کە فیکری کۆماریخوازی لەیەك کاتدا سنوری بۆ دانا و ئامادەسازیشی بۆ کرد.

### زیندوبوونەوەی بیرۆکەی دیموکراسی:

لەپێناو دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاودا پێویستە بەر لەهەر شتێك هوشیار بین لەئاست ئەو مەترسییانەدا کە هەڕەشە لە دیموکراسی دەکەن و هەروەها پێویستە ئامرازەکانی نەهێشتنی ئەو مەترسیانە دەستنیشان بکەین.

بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەتی تۆتالیتاریزم پێویستە جەخت لەسەر کەسایەتی و ئازادیی خود و سەلماندن و پێناسی خود بکەینەوە. لە هەمان ڕێگەوە، بەڵام لە دۆخێکی دراماتیکیی کەمتردا، پێویستمان بە بەرەنگاربوونەوەی ئەو ڕەوتە هەیە کە کۆمەڵگە کورتدەکاتەوە بۆ خەڵکانێکی بەرخۆر. ئێستا لە هەموو شوێنێك ئەوە بەدیدەکەین کە ململانێ سەبارەت بە کارو کێشەی چینەکان چوارچێوەیەکی گشتی نابەخشێ بە داواکارییە کۆمەڵایەتیەکان. ئەم حاڵەتە بەرەو دوو تەفسیر راپێچمان دەکا. لەلایەکەوە دەکرێ باس لە هەمەچەشنیی کێشە کۆمەڵایەتیەکان بکرێ، بەو پێیەی ژیانی سیاسی نزیك دەکەوێتەوە لە نمونەی بازاڕی سیاسی کە تیایدا نمایش و خواست (عرض وطلب) بەیەکدەگەن هەوڵی پێکەوەگونجان دەدەن. بەڵام، لەلایەکی ترەوە، تەفسیرێکی پێچەوانە هەیە پێیوایە یەکێتیی کۆنی کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و شەخسییەکان، کە ئومێدیان دەبەخشی بە کۆمەڵگەی مۆدێرن بەوەی ببێتە کۆمەڵگەیەکی دادپەروەرو سوودبەخشتر، بۆتە هۆی پێکدادان و زیادبوونی گوشار لەلایەن بازاڕەکان و پێداویستیەکانی ئازادیی کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی. چونکە بازاڕەکان لە هەوڵی ئەوەدان زانیاری و ئاڵوگۆڕی ئابوری بەرفراوانتر بکەن، بەڵام بکەرە کۆمەڵایەتیەکان، بە تاك و کۆ، لە هەوڵی ئەوەدان ئەزموونەکانی خۆیان بپارێزن و مانایان بۆ بدۆزنەوە، یان پەیوەندیی لەنێوان یادەوەری و پرۆژەکانیاندا بسازێنن.

بە درێژایی سەدەیەکە بواری دیموکراسی، تا ئەندازەیەکی زۆر، بەندە بە بورای چالاکیی ئابوری و پەیوەندیەکانی کارەوە. بەڵام دەبینین لە کۆمەڵگای پاش پیشەسازیدا، پیشەسازیی رۆشنبیری وەك بوارەکانی فێرکاری و تەندروستی و چاودێری کۆمەڵایەتی و

راگەیاندن، رۆڵێکی سەنترالّی گرنگ دەگێڕێ لە بەرهەمهێنانی کالاّ مادیەکاندا. ئێستا چارەنوسی دیموکراسی لە هەموو شوێنێك بەندە بە دامودەزگاکانی وەك نەخۆشخانە، خوێندنگای ئامادەیی و زانکۆکان، رۆژنامەو کەناڵەکانی تەلەفزیۆن..، زیاتر لەوەی بەند بێ بە دامودەزگاکانی بەرهەمهێنان. بۆیە پێویستە هاوزەمان لەگەڵ ئەم بوارە دیموکراتییە نوێیەدا مەیدانی سیاسییش گۆڕانی بەسەر بێ.

سەردەمانێك بوو ژیانی دیموکراسی لە پارلەمانەکاندا رێکدەخرا، پاش ئەوە لە حزبەکاندا رێکدەخرا کە بوونە ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان خواستی کۆمەلاّیەتی و کاری سیاسی. بەلاّم لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا، ئەو وتوویژانەی گرەوی کاری دیموکراتییان لەسەر دەکرێ لەجیهانی بەرفراوانی دەزگاکانی راگەیاندندا سازدەدرێ. زۆربەی ئەو وتوێژانەش دەچنە خانەی چاودێری پزیشکییەوە، وەك ئەو هەڵمەتە ئیعلامییانەی دەربارەی منداڵ لەباربردن، پیتاندن، کوشتنی بەزەیی و چارەسەرکردنی نەخۆشی ئایدز. ئەم وتووێژانە لە دەرەوەی حزبی سیاسی و سەندیکاکان، لەلایەن چەند گروپ و کۆمەڵەیەکی دیاریکراوەوە، دەخرێنەڕوو، هەروەها لەلایەن بزاوتە خاوەن دیدوبۆچوونەکان و هەندێ جاریش لەلایەن بزاوتە کۆمەلاّیەتی و رۆشنبیرییەکانەوە.

بەلاّم کێشەی ئەو مشتومڕانە لەوەدایە کە پەیوەندیی بە سیاسەتە ئابورییەکانەوە نییەو لێی ترازاوە. بۆ نمونە حکومەتەکان، لەلایەکەوە، سەرقاڵن بە کێشەکانی ئابوریی دەوڵەتانەوە، جا ئیتر دەوڵەتانی باشور بن یان باکور. لەلایەکی ترەوە دەبینین نێوەندەکانی رای گشتی بایەخێکی زیاتر دەبەخشن بە کێشەکانی ژیانی شەخسی، پاشان کێشەکانی ژینگە، بەتایبەتی کێشەی چارەنوسی مرۆڤایەتی لەبەردەم هەڕەشەی سروشتدا، ئەو سروشتەی کە مرۆڤ خستویەتیە ژێر رکێفی خۆی و کردوویەتیە مادەیەکی خاو بۆ قەبەکردنی ئابوری.

گەر ئێمە رێگەی یەکەم بگرینەبەر، کە لەوەدەچێ رێگەیەکی کراوەتر بێ، ئەوا داڕمان و ئاوابوونی سیاسەت دەبێتە ئەگەرێك کە سەختە خۆمانی لێ لادەین. بۆ نمونە کەسێکی وەك کارلۆ مۆنگاردینی گوزارشت لە نیگەرانیی خۆی دەکا کاتێ پێیوایە: هەرچەندە ئاوابوونی ئەستێرەی ئیرادەی سیاسی هەڵگری چەند لایەنێکی ئازادیخوازانەی واقعییە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دۆخە سیاسەت کورتدەکاتەوە بۆ چەند بەرژەوەندییەکی بەرتەسك و لەو رەهەندە دەستەجەمعییە بەتاڵی دەکاتەوە کە هەوڵ بۆ سوودی هاوبەش دەدا. بەلاّم ئایا خودی ئەو ئایدیۆلۆجیا دەستەجەمعییە توشی داڕمان نەهاتووە؟ ئایا گەڕان لەپێناو سوودی گشتیدا نەبۆتە خولیای گەڕان بەدوای پێناسدا؟ ئایا هەقی خۆی نیە، دوور لە یەکگرتنی کۆمەلاّیەتی، باس لە زەمانەتە دەزگاییەکانی ئازادیی تاکەکەس بکەین و رێز لە مافەکانی مرۆڤ بگرین؟

چیتر پێویست ناکا بەشوێن بنەمایەکدا بگەڕێین بۆ دیموکراسی کە پەیوەندیدار بێ بە دامودەزگاکانەوە، بەڵکو پێویستە لە بەرەی

رۆشنبیرییەوە بەشوێن ئەو بنەمایەدا بگەڕێین. چونکە کولتوری دیموکراسی تەنها بریتی نییە لە بڵاوکردنەوەی بیروڕای دیموکراتانە، یان چەند پرۆگرامێکی فێرکاریو تەلەفزیۆنی، یان چەند کتێب و پەرتوکێك کە بەسەر خەڵکیدا دابەش بکرێن. بەهەمان شێوە ئەو کولتورە تەنها قسەیەك نیە بووترێ، کە گشتێن و هەموو کەس دەتوانێ بەو شێوەیە بیانکا کە لەگەڵ بۆچوون و بەرژەوەندیەکانی خۆیدا بگونجێ. کولتوری دیموکراسی لەو وێنەیەی بوونەوەری مرۆییدا بەرجەستە دەبێ کە زۆر بەتوندی بەرەنگاری مەرامی دەسەڵاتی رەها دەبێتەوە، تەنانەت گەر ئەو دەسەڵاتە زادەی پرۆسەی دەنگدانیش بێ، ئەو بوونەوەرەی کە لەهەمان کاتدا هەوڵ دەدا ئەو هەلومەرجە دامودەزگاییانە بدۆزێتەوە کە ئازادی شەخسی دەپارێزن. ئەو بایەخە مەرکەزییەی بەندە بە ئازادیی شەخسی تاکەکانەوە، هەروەها هوشیاری لەئاست هەلومەرجە گشتییەکانی ئەو ئازادییە تایبەتەدا، دوو پرنسیپی سەرەکین کە کولتوری دیموکراتیی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا لەسەریان دادەمەزرێ. ئێستا مەترسییەکی گەورەی یەکسانکردنەوەی مرۆڤ بە هاوڵاتی لەئارادایە، لەکاتێکدا خودی ئەو یەکسانکردنەوەیە ئەنگێزەی ئازادیی بوو لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا. بەڵام بانگەشەکردن بۆ بەشداریکردن لە بواری گشتیدا، بەر لەوەی ببێتە هۆی فراوانکردنی ئازادیەکانی تاکەکەس، مانای رەتکردنەوەی کەسە نامۆو بێگانەکانی لێدەکەوێتەوە. بەهەمان شێوە خولیای هاوجۆری (تجانس)، کە کاتی خۆی مایەی نیگەرانی تۆکڤیل بوو، لە کۆمەڵگای جەماوەریی ئەمڕۆدا، بۆتە فاکتەرێکی بەهێزی بوغزاندن و دوورخستنەوە.

ئەو مەترسیانەی کە ئەمڕۆ لەژێر ناوی چەند وتەزایەکی وەك ئاساییکردنەوەو پاکتاوکردنی ئێتنیدا هەرەشەمان لێدەکەن، پێویستە هانمان بدەن بۆ ئاشکراکردنی کولتورێکی دیموکرات، کە بەر لەهەر شتێك بریتیە لە سەلماندنی بوونی ئەوی تر. ئێمە لە کاتێکدا لە دەرگای لێکۆڵینەوەی ئەو کولتورە دەدەین، بەهیچ شێوەیەك خۆمان بەدوور ناگرین لە کێشە مەرکەزییەکانی دیموکراسی، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەرەو پێگەی سەنتراڵی فیکری سیاسی هەنگاو دەنێین.

**پەراوێز:**

(*) فیبۆشورەکان *Philanthropes*، لەسەر وەزنی فەیلەسوفەکان، کەسانێکن ئەویندارى مرۆڤن، هەروەك چۆن فەیلەسوفەکان ئەویندارى حیکمەتن.

**سەرچاوە:**

آلان تورين، ماهي الديموقراطية؟ حكم الأكثرية أم ضمانات الأقلية. ت: حسن قبيسي. ط1، بيروت: دار الساقي،1995، ص139-150.

بەبەراورد لەگەڵ چاپێکی تری هەمان کتێبدا، لە وەرگێڕانی: عبود كاسوحة. دمشق: منشورات وزارة الثقافة، 2000، ص180-194.

# فەلسەفەی رۆشنگەری و هزری مافی مرۆڤ

بەهرام محیی
لە فارسییەوە: عەبدوڵلا ئەحمەدی (ئاریا)

**بەرایی:**

لـەو تاوتوێکردنانـەی پێوەنـدی دارن بـە مێـژووی هـزر، بـە گـشتی سـەدەی حەڤـدە و بەتایبـەت سـەدەی هەژدەیـەم لـە ئـەوروپا بـە چاخی ئەقڵگەری و رۆشنگەری ناودێر دەکەن. لـە پـۆلێنکردنێکی ناسـکتردا بـاس لـە سـێ قۆنـاغی: دەسـتپێك: لوتکـە (اوج) و کۆتـایی رۆشـنگەری دەکـرێ کـە سـەردەمێك لـە نیـوەی سەدەی حەڤدەم تا کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و تەنانـەت دەیـەی سـەرەتای سـەدەی نۆزدەیـەم لـەخۆدەگرێ. بـەم پێیـە دەتـوانین بیرمەنـدانێکی وەك هـۆبز و لـۆك بـە نوێنـەرانی هـزری قۆنـاغی دەستپێك، مۆنتسکیۆو رۆسۆ سەر بە قۆناغی لوتکـە و کانـت بـە دواهـەمین نوێنـەرانی چـاخی رۆشـــنگەری بنـــرخێنین. یـــەکێك لـــە تایبەتمەندییـەکانی بـیری رۆشـنگەری، یمـا)ی ئاراستە رزگاریخواز و یەکسانیخوازەکەیەتی کە ئاوێتــە لەگــەڵ هەڵوێــستێکی رەخنەگرانــە دەجوڵێتـەوە و هـەم لـە بـواری تیـۆری و هـەم لـە بواری پراکتیکدا کاریگەری بەجێدەهێڵێ.

رۆشــنگەرەکان لەلایەکــەوە بانگەشــەکەری ئازادی هزر بوون و لەلایەکی دیکەوە لایـەنگری خودموختــاری تــاکن لــە کایــەی ئاکــاری و رامیــاری‌و ئابووریــدا. ئــەوان خوازیــاری هەڵپـساندنی زنجیرگـەلێك بـوون کـە سـەدەکانی نێوەراســت بەدەســت و پێــی کۆمەڵگایانــەوە بەســتبوو. لــە روانگــەی رۆشــنگەریدا، مــرۆڤ نەبەسـتراوەتەوە بـە ئەرکـە دینییەکانـەوە و نـە ملکەچــی دەوڵەتێکــە کــە فەرمانڕەواکــەی لــە "خــەلاَتی خــودایی" بەهرەمەنــد کرابێــت. رۆشـنگەری، بەسـتراوەیی بـە کەنیـسەوەی بـۆ رزگـاری مـرۆڤ بە پێویـست نـەدەزانی و کەسـێك کـە وتـەکانی، نووسـینەکانی‌و هەڵـسوکەوتی جێگای قبووڵی دەوڵـەت یان کەنیسە نەبوو، بە دەرکراو لە قەڵەم نەدەدا. بۆ رۆشنگەری جگە لـە بەختــەوەری، بەهاگــەلێکی دیکــەی وەکــوو

ئازادیو چرۆکردنی توانا نهێنییەکانی مرۆڤ کە لە سروشتیدا جێگرە، گرنگی هەبوو. بە بڕوای رۆشنگەرەکان، مرۆڤ بە پێداویستیەکی سروشتی نەك هەر بەدوای دابینکردنی ئەم جۆرە بەهایانەوەیە، بەڵکو مافی خۆیەتی کە خاوەنیان بێت، بەم پێیە هەر شتێك کە لەهەمبەر مسۆگەربوونی ئەم جۆرە بەهایانە بوەستایە، لەلایەن ڕۆشنگەرەکانەوە بە ناڕەوا دەژمێردرا. ئەم تێڕوانینە، تیشکی راشکاوانەی خۆی لە هزری مافی مرۆڤ دەدۆزێتەوە کە بە چەمکی ئەمڕۆ لە بەرهەمەکانی سەردەمی رۆشنگەرییە. بە دەربڕینێکی دیکە، هەنگاوی سەرەکی تێپەڕبوون لە "مافی سروشتی"وە بۆ "مافی مرۆڤ" لەم قۆناغەدا هەڵگیرا. فەلسەفەی رۆشنگەری، بە متمانە بەهێزی ئەقڵانی مرۆڤ، دەیویست مرۆڤایەتی لە زنجیری وابەستەیی و ناکاملبوونی مەعنەوی رزگار بکات.

ئامانجی رۆشنگەری، سڕینەوەی ئەفسونگەرایی لە دونیاو، هەڵکەندنی ئەفسانەو نەهێشتنی وەهم بوو بە یارمەتیدانی زانست.

فەیلەسوفانی رۆشنگەری لە خەباتی فیکری خۆیاندا دژی ملهوڕی دینی و سیاسی، بناغە تیوریەکانی مافی مرۆڤیان پتەو و قایم کرد. لە فەلسەفەی رۆشنگەریدا ئەقڵی مرۆڤ وەك تەنیا پێوەری دیاریکردنی مافی سروشتی گەلاڵەکراوو دەسەلاتی تێزە دینی و دەسەلاتخوازەکان لەم بوارەدا بێ نرخ راگەیەنرا. بەلام ئەم کارە چلۆن بە ئەنجام گەیشت؟ بۆ وەلامدانەوەی کورت و فرموڵەکراوی ئەم پرسیارە، دەبێ چاوێك بە هێڵی سەرەکی تێکۆشانی هزری بیرمەندانی رۆشنگەری بخشێنین. ئێمە لەم توێژینەوەدا، بە بیروڕای هەندێك لە هزرڤانانی چاخی رۆشنگەری لە مەڕ مافی مرۆڤ ئاماژە دەکەین.

**توماس هوبز: پاراستنی ژیان وەك بابەتێکی سەرەکی.**

تۆماس هۆبز *(Thomas Hobbes (1588-1679)* بیرمەندی بریتانیایی سەدەی حەڤدەیەم، لە گرنگترین بەرهەمە سیاسیەکەیدا "لیڤیایان" فەلسەفەی سیاسی خۆی گەلاڵە کردووە. هەڵبەت رەنگە لە یەکەم تێڕوانیندا، دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان بیروڕای هۆبز و ئەندێشەی مافی مرۆڤدا بڕێك سەیر بێتە بەرچاو، چونکە زۆربەی توێژەرانی مێژووی هزر، هۆبز وەکو بیرۆکە دارێژی تیۆری حکومەتی رەها دەناسن. ئەگەرچی هۆبز بە تێگەیشتنێکی ئەمڕۆیانە، فەیلەسوفێکی مافی مرۆڤ نییە، بەلام بێگومان دەتوانین ریشەگەلێکی بێگەرد لە هزری سەردەمی نوێ سەبارەت بە مافی مرۆڤ لە بیروڕا و بۆچوونەکانی هۆبزدا بەدی بکەین. بۆ ئاشنابوون لە تێڕامانەکانی هۆبز، خوێندنەوەیەك لەسەر هەندێك چەمکی یاسایی لە بیرکردنەوە قووڵەکانی ئەودا، وەك "دۆخی سروشتی"، "مافی سروشتی"، "یاسای سروشتی" و "پەیمانی دەوڵەتی" پێویستە.

هوبز لە میتۆدی توێژینەوەی تایبەتی خۆیدا، لە خاڵی سفرەوە دەست پێدەکات کە لەوێدا هێشتا هیچ جۆرە مافێکی تایبەتی و سیستمێکی دەوڵەتی گرنگی نییە. ئەو ئەم جۆرە دۆخە بە "دۆخی سروشتی" ناوزەد دەکات. کەوا بوو بۆ هۆبز، "دۆخی سروشتی"بە تەواوی خاوەن پێکهاتەی

میتــۆدیو نمونــە ئاســایە و نــابێ لەگــەڵ سەردەمێکی ڕاستەقینە لە مێژووی مرۆڤایەتی یەکــسان بگــیردرێ. لــەم دۆخــە سروشــتیە گریمانییەدا، هەموو مرۆڤەکان ئازاد، یەکسان لە بەرانبەری یاساو خاوەن سەربەستین تاوەکوو زەوق و خۆشــی خۆیــان تــا ئــەو جێگەیــە لــە دەسەلاتیان هەیە، بێ هیچ بەربەستێك درێژە پێبدەن، لە دۆخی سروشتیدا، هەر مرۆڤێك لەم "ماڤ سروشتی"یە بەهرەمەندە کە بە تایبەتی و پتر لە هەر شتێك بۆ بنچینەییترین ماڤ خۆی، واتا "پاراستنی خۆی" تێبکۆشێت. کەوابوو، هــوبز "مــاڤ سروشــتی" بــەم جــۆرە پێناســە دەکات: مرۆڤ بۆ پاراستنی خۆی ئازادە لــە دەســەلاتی کــەڵك وەربگرێــت. بــەپێی ئــەم تێگەیــشتنە، مــرۆڤ سەربەســتە لــەوەی بــۆ پاراســتنی خــۆی ســود لــە هــەر هــەنگاو یــان ئامێرێـك كـە هێـزی هەڵـسەنگاندن و ئـەقلانی خـۆی بـە راسـتی دەزانێـت وەربگرێـت. بـەلام لــەوەی کــە تێــڕوانینی هــۆبز بــۆ مــرۆڤ زۆر ڕەشــبینانەیە و مــرۆڤ بــە گــورگی مرۆیــی دەزانــێ، روونــە کــە دۆخێکــی ئاوەهــا، واتــا "دۆخــی سروشــتی" ئــەنجامێکی جگــە لــە دووبەرەکییــەکی بــەردەوام لەســەر هــۆگری و مــەیلی جــۆراو جــۆر و بەتایبــەتی لەســەر بەکارهێنانی کەرەسەکان نابێت. هۆبز ئەم دۆخە دووبەرەکییـە بەردەوامـە بـە "شـەڕی هـەمووان دژی هەمووان" ناوزەد دەکات.

ئێـستا دەتـوانین بپرسـین کـە ئـەم "دۆخـە سروشتی"یە لە تێڕامانی هۆبزدا، خاوەن کامە کرداری بەڵگاندنە؟ لە وەلامدا دەتوانین بڵێین کە هــۆبز لــە تێڕامــانی نەخــشەی "دۆخــی سروشــتی"دا، بــە دوای ئــەو ئامانجەوەیــە کــە بەشـێوەیەکی رادیکـاڵ، هـەر مـافێکی دانـراوو رژێمێکـی دەوڵـەتی دەبێت ملکەچی ڕاسـتی وە ڕەوا بــوون بکــات. بــۆ ئــەو کــە لــە دۆخــی سروشــتیدا یاســا و پرەنــسیپی دەوڵــەتی گرنگــی نــەبوو، مــرۆڤ تاکــە شــتێکە کــە دەمێنێتــەوە و لۆژیکیانــە دەتــوانێ دواکــار و بنــەمای ئاراســتەکراو بێــت. ئــەم پێگەیــەی مــرۆڤ لــە تێڕامــانی سیاســی هــۆبزدا، دابڕانــە لــە نەریتــە فەلسەفیەکانی رابـردوو کـە تێکڕایــان لەســەر ســتراکتۆرێکی خواناســی (تیولوژیــك) و یــان بووناســی (ئــەنتولوژیك) جێگیر بوون و تێدەکۆشان ماف و یاساکان نە بەدروســتکراوی دەســتی مــرۆڤ، بــەڵکو بــە خوڵقێنراوی سیستمێکی تیولۆژی یان خودایی لە قەڵەم بدەن.

خاڵێکی دیکە لە تێڕامانی سیاسی هۆبزدا، بڕوابـونێتی بە عـەقڵ. ئەگەرچی بەڕای ئـەو لـە "دۆخـی سروشـتی"دا، ئـەو یاسـایانەی مـرۆڤ دایناون یـان سیستمی دەوڵـەتی بـوونی نییـە، بـەلام "یاسـای سروشـتی" زاڵـە. ئـەم "یاسـا سروشتی"یـە لـە گۆشـە نیگـای هـۆبزەوە، رێسا یـان بنەمایەکـە لـە رێگـای عـەقڵی مرۆڤـەوە دۆزراوەتـەوە و بایـەخی بۆ هـەر خـاوەن ئـەقڵێك هەیە. بەم پێیە، لای هۆبز "یاسای سروشتی" ئەوە نیە کە لە ئیرادەی خوداوە یان لـە سەروو مرۆڤــەوە سەرچــاوەی گرتبێــت. بــەڵکو پێویـستێکی گـشتییە کـە بـە هـۆی زانیـاری و عەقڵی خودی مرۆڤەوە پێکهاتووە.

خاڵی سێهەم لە تێڕامانی رامیاری هۆبزدا، مەسەلەی ڕەوابوونی دەوڵەتە. بە پێی تیورەی

"پەیمانی" هوبز، دەوڵەت ڕەوابوونی خۆی بەو کەسانەوە بەستۆتەوە کە بەقازانجی پێکهێنانی دەوڵـەت و کۆتـایی پێهێنـانی مەترسـی و ڕۆژ ڕەشـی و نائـەمنی دەسـتیان لـە مـاڧ سروشـتی خۆیـان هـەڵگرتووە، ئەگـەر بـە بـیری خۆمـان بهێنینـەوە کـە تەنانـەت لـە فەلـسەفەی رامیـاری ئەرەستۆدا، مـرۆڤ "بەشێوەیەکی سروشـتی" بە گیانلەبـەرێکی سیاسـی دەوڵەتـساز پێناسـە کراوە، دەکرێ لـەوە تێبگـەین کە بیری سیاسـی هـۆبز، نـەك تـەنیا دابڕانێکـی ڕەهایـە لـە هـزری سـەدەکانی نێوەراسـت سـەبارەت بـە دەوڵـەت، بـەڵکو تەنانـەت دابڕانـە لـە فەلـسەفەی یونـانی کـۆن و لـە راسـتیدا دەرکـەوتنی هـزری سیاسـی سەردەمی نوێیە، هزرێك کە لە ترۆپکی ئـەودا، دەوڵـــەت چـــیتر دامەزراوەیـــەکی خـــودایی و تەنانـەت سروشـتیی نییـە بـەڵکو خـوڵقێنراوی دەستی مرۆڤە. هـەر ئـەم وەرچـەرخانە لـە بیری سیاسـی هـۆبزدا، گـەلێك زیـاتر لـە چـەرخی رۆشـنگەری و تەنانـەت تـا ئـەمڕۆ، تێگەیـشتنی مۆدێرن لە دەوڵەت بەرجەستە دەکات.

بەڵام لەو لایەنەوە کە هۆبز لە رەوتی شەڕ و کێشە نێـو خۆییـەکانی بـەریتانیا و شـەرەکانی ناسـراو بـە سـی سـاڵە کـە زۆربـەیان خەسـڵەتی مەزهەبیان هەبوو بیری دەکردەوە، بۆ گەیشتن بە سـەقامگیری و هـێمنی بـە پێـی تیـوری بەڵگەنامەکەی خۆی ئەوەندە زێدەڕەوی دەکات و ڕێگـا و دەسـەڵات بـە دەوڵـەت دەدات کـە بـە تـەواوەتی هـەموو مـافێکی تـاك بخاتـە پەراوێزەوە و بە کردەوە بێ بایەخیان بکات. ئەم کـارە یەکێکـە لـەو خاڵـە پارادۆکسی و پـڕ لـە گرژییانەی کە لە ئەندێشەی سیاسی هۆبزدا خۆ دەنوێنێ. هـۆبز لـە لایەکـەوە مـاڧ خۆپاراسـتنی تـاك بـە رەوا دادەنێـت، بـە بـڕوای ئـەو، هـەر مرۆڤێك تەنیا بەو مەرجەی کە بتوانێت خاوەن مـاڧ ژیـان بێـت، دەستبەرداری مـافی سروشـتی خـۆی بـە قـازانجی مـاڧ دانـراوی هـاولاتیبوون، دەبێـت و پـاوانکردنی زەبـر و زەنـگ بـۆ دەوڵـەت بەجێدەهێڵێ. لـە لایـەکی تـرەوە، کاتێك دەوڵـەت دامـەزرا، خـەڵك لـە بەرانبەریـدا بـە چەشـنێك پابەنـد دەبـن کـە هۆیـەکی راسـتەقینە بـۆ وەرگـرتنی مـاڧ خۆیـان بـەدی ناکـەن. سـەرەڕای هەبوونی ئاڵۆزی و پارادۆکس لـە بۆچوونەکانی هۆبزدا، هـۆبز بـە دابـڕان لـە ئەندێشەی سیاسـی کلاسـیکی، پێکهاتەگـەلێکی پتـەوی بـۆ تیـۆری یاسـایی و دەوڵـەت و لـە ئاکامـدا پوختـەبوونی بابـەتی مـاڧ مـرۆڤ لـە سـەردەمی نـوێ دارشـت. گـشت فەلـسەفە سیاسـیەکانی پـاش هـۆبز، لـە درێژەپێـــدان یـــان بەرپەرچـــدانەوەی هەڵـسەنگێندراو و رەخنـەیی، لـە هەمبـەر پرسیارگەلێك هاتوونەتە ئاراوە کە بۆ یەکەم جار لە بیرۆکـەکانی پـەیمان و رژێمی دەوڵـەتی ئـەودا گەلاڵـەکرابوو. نـابێ لـە بـیری بکـەین کـە هـۆبز بەسەرنجدان لە پاراستنی ژیان وەکوو بابـەتێکی سـەرەکی، هـەنگاوێکی پێداگرانـەی لـە ڕێگـای هـزری مـاڧ مـرۆڤ هـەڵگرتووە. لـە سـونگەی ئـەم مەسەلەیەدایە کە هەندێك لە توێژەرانی مێژووی هزر تۆماس هۆبز بە ڕێچکەشکێنی هـزری مـاڧ مرۆڤ لەسەردەمی نوێ ناو دەبەن.

**جۆن لۆك: باوکی مەعنەوی هزری مافی مرۆڤ**

تـەنیا چـەند دەیـە پـاش هـۆبز، جـۆن لـۆك ( *John lock 1632-1704*) فەیلەسـوفێکی تـری

بریتانیایی، له پەرتووکی "دوونامیلکه سەبارەت بە حکومەت" فەلسەفەی سیاسی خۆی بۆ رەخنەگرتن لە بۆچوونەکانی هۆبز خستە ڕوو. تێکڕا جۆن لۆك بە باوکی مەعنەوی تێڕامانی ماف مرۆڤ لە سەردەمی نوێ دەزانن. لۆك بە پێچەوانەی هۆبز – کەمتر گرنگی بە بیرۆکەی پەیمان دەدا و "دۆخی سروشتی" ئەوەندە بە (نێگەتیڤ) نەدەدی. چونکە بە ڕای ئەو لە "دۆخی سروشتی"دا، یەکسانی و سەربەخۆیی مرۆڤەکان لە ئاستی "یاسای سروشتی" گرنگی هەیە و بەبێ ئەم جۆرە یاسایە هیچ کەسێك ماف ئەوەی نییە ژیان، سەلامەتی، ئازادی و موڵکایەتی کەسێکی دیکە بخاتە مەترسییەوە. بە بۆچوونی لۆك، "یاسای سروشتی" واتایەکی جگە لە پاراستنی تەواوی مرۆڤایەتی نییە، لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤەکان ئەندامی هەمیشەیی کۆمەڵگەیەکی سروشتین. کەوا بوو "یاسای سروشتی" ڕێگا نادات کەسێکی تر لەناوببەی. هەر لەم وتەیەی لۆکدایە کە لەم سەردەمە نوێیەدا، هزری ماف مرۆڤ بەشێوەیەکی ئاشکراو ڕووناك خۆی دەنوێنێ.

لەم حاڵەتە، بۆ لۆکیش "دۆخی سروشتی" دۆخێکی نائاسودە و پڕ لە مەترسییە. کەوا بوو، لۆك کارکردنی دەوڵەت لەوە دەبینێتەوە کە ژیان و ئازادی و موڵکایەتی تایبەتی هەموو کەسێك بپارێزێ و گرەنتی بکات.

ئەمانە بۆ لۆك مەزنترین ئامانجەکانی دەوڵەتن. هەر بۆیە، کەسانێك بە ویستی خۆیان دۆخی سروشتی نائاسوودە بەجێدەهێڵن و لە ماف بێسنووری خۆیان بە مەبەستی پێکهێنانی دەوڵەت دەست دەکێشنەوە. بەڵام ئەگەر دەوڵەت بەهەر هۆیەك، چ بەهۆی سنوور بەزاندنی دوژمنی دەرەکی و چ بە هۆی گەندەڵی و هەرەسی نێوخۆیی، توانای جێبەجێکردنی ئەم سێ ئامانجەی واتا ژیان، ئازادی و موڵکایەتی نەبوو، چارە چی دەبێت؟ ئەم پرسیارە بۆ مەسەلەی ماف مرۆڤ بایەخێکی یەکجار گرنگی هەیە.

ئەگەرچی لۆکیش وەکو هۆبز بۆ دامەزراندنی دەوڵەت ڕوو لە بیردۆزی پەیمان دەکات، بەڵام بۆ پارێزگاریکردن لە ژیان، ئازادیو موڵکایەتی خەڵك، پێکهاتەی ئەم دەوڵەتە بە وردی دەخاتە ژێر تێڕامانی قوڵی خۆیەوە.

لە کاتێکدا هۆبز دەوڵەتی بە دەسەڵاتێکی ڕەها تەیار کردبوو، لۆك بۆ پارێزگاریکردن لە ماف تاکەکەس لە بەرانبەر دەوڵەتدا، بە هزری لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی دەوڵەت دەگات. لۆك دەخوازێ کە دەزگای یاسادانانی دەوڵەت، یاساگەلێك بچەسپێنێ کە بۆ هەمووی خاوەن بایەخ بێت و هەر هەمووی لە بەرانبەر یاسادا یەکسان بن. ئەو هەروەها خوازیاری دامەزراندنی دەزگایەکی سەربەخۆ و بێلایەنە کە لە بوارە ناکۆکەکاندا بەپێی یاسا هەڵوێست بگرێت. سەرەڕای ئەوەش، ئەو دەیەوێت دەزگایەك ئەرکی بەڕێوەبردن و بەکارهێنانی یاسا دیاریکراوەکان وەئەستۆ بگرێت. ئەم سێ دەزگایە ئەمڕۆ لە گشت دەوڵەتە مۆدێرنەکان بوونیان هەیە و کاریان پێدەکرێ.

بەم پێیە دەبێ لۆك بە داڕێژەری بیرۆکەی لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانیش بزانین کە

هەڵبەت لە دواییدا لەگەڵ شارڵ مۆنتیسکیۆ هزرڤانی فەرەنسی پوختە دەبێ و بە لووتکە دەگات. لۆك تێدەکۆشێ هاوسەنگیەکی خۆپارێزانە لە نێوان دەسەڵاتە دەوڵەتیەکاندا پێکبهێنێ تاوەکو ئەوان لەم کەناڵەوە هەندێك دەسەڵاتی یەکتر پووچەڵبکەنەوە و مافی تاك نەخەنە مەترسییەوە، پتر لەوەش بۆ دابینکردنی مافەکانی ناچار بکرێن. بەم جۆرە روون دەبێتەوە کە مەسەلەی ئازادییە تاکە کەسیەکان لای لۆك زۆر گرنگترە لە پێکهاتەکانی سیستەمی سیاسی. لێرەوە هەر تەنیا لە رێگای دابەشکردنی پێکهاتەی دەسەڵاتی دەوڵەتی، بەڵکو لە رێگای چەسپاندنی نێوەرۆکی ئەوانە هەوڵ دەدات تا لە خزمەت ماف و ئازادییە تاکە کەسیەکان، دەسەڵاتی دەوڵەت مەرجدار بکات. بەڕای لۆك، دەوڵەت بۆی نییە ژیان، ئازادی و موڵکایەتی هیچ کەسێك بخاتە مەترسییەوە، مادام کە ئەم کەسە ژیان، ئازادی و موڵکایەتی ئەوانیتری لەکەدار نەکردبێت. لۆك لە تێرامانە قوڵەکانی خۆیدا بە ڕاشکاوی سنووری دەسەڵاتەکانی دەوڵەت دیاری دەکات.

خاڵێکی تری جێی تێرامان لە هزری سیاسی لۆك، پرسی ڕەوابوونی دەوڵەتە، لە تێزی لۆکدا، لە ڕاستیدا دەوڵەت "باوەڕپێکراو" و نوێنەری خەڵکە. ئەم مەسەلەیە واتایەکی جگە لەمەی نییە کە دەسەڵاتی راستەقینە لە دەستی خەڵکدایە و ئەوە خەڵکە کە خاوەن دەسەڵاتداریێتی راستەقینەیە. لە هەر شوێنێك کە دەوڵەت لە متمانەی خەڵك کەڵکی خراپ وەرگرێت یان توانای بەدیهێنانی سێ ئامانجی ژیان، ئازادی و موڵکایەتی تایبەتی نەبێ، دەشێت دەسەڵات بە خاوەنە رەسەنەکەی واتا خەڵك بگەڕێنێتەوە.

سەرەڕای ئەوەش، لۆك بۆ تاکە کەس مافی خۆڕاگری لە بەرانبەر دەستدرێژی دەوڵەت بەڕەوا دەزانێ. لە روانگەی لۆکدا، لە هەر جێگایەك هێزە دەوڵەتیەکان – چ یاسادانان چ بەڕێوەبەری– هێرش بکەنە سەر مافی تاکەکەس و تاکە کەس نەتوانێت لە رێگای هەڵبژاردن یان لەسەر کار لابردنی ئەم دەزگایە بەرگری لەو دەستڕێژیانە بکات، ئەوە مافی پێدەدرێت کە لە بەرانبەر دەوڵەتدا بەرگری لە خۆی بکات. لەبەرئەوەی ئەم جۆرە سنووربەزاندن و دەستدرێژییانە کە لەلایەن ئۆرگانە دەوڵەتیەکانەوە ئەنجام دەدرێن، شکاندنی پەیمانە و دیسان کۆمەڵگە بۆ "دۆخی سروشتی" دەگەڕێنێتەوە کە لەوێدا هەرکەس ناچارە خۆی مافی خۆی بستێنێ. بەڕای لۆك، لەم بارودۆخەدا ئەوە خەڵك نین کە شۆڕش دەست پێدەکەن، بەڵکو ئەوە دەوڵەت و دامەزراوە دەوڵەتیەکانە کە لە رێگای پێشێلکردنی بەردەوامی مافی مرۆڤ سەرکێشی بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنن. بە وتەیەکی دیکە، ئەوان لە رێگای هەڵسوکەوتی خراپ بە کردەوە دەستیان لە رەوابوونی خۆیان کێشاوەتەوە. کەوابوو ئیدی بوارێکی یاسایی بۆ گوێڕایەڵی و فەرمانبەری دەوڵەت نامێنێتەوە. پێویستە سەرنجی ئەوەش بدەین کە لۆك لە مافی بەرگری خەڵکدا، رەگەزێکی شۆڕشگێرانە نابینێتەوە، چونکە مەبەست لە خۆڕاگری شتێك نییە جگە لە گەڕانەوە بۆ بارودۆخی یاسایی رابردوو کە لەوێدا سیستمێکی سیاسی پارێزەری مافی

خـەڵك بـوو. لـۆك بـۆ پێـشگیریکردن لەسـەر هەڵدانی شۆڕش و یاخی بوون، پێشنیاری بە خـوولی کـردن و سـنووردارکردنی مـاوەی حکومـەت دەکـات، ئـەم داخوازییـەی لـۆك لـە دیموکراسـیە مودێرنـەکانی ئـەمڕۆدا مەسەلەیەکی روون و بەڵگەنەویستە.

هەنووکە دەتوانین بەو تێبینیانەی سەرەوە کۆبەندییـەك لەمـەڕ ئەندێـشەکانی جـۆن لـۆك سەبارەت بە مافی مرۆڤ ئەنجام بدەین:

یەکـەم لـۆك بـە پێـچەوانەی هـۆبز، پـاش دامەزراندنی دەوڵەت "مافی سروشتی" بێ کەڵك ناکات. بەم پێیە لای هۆبز، "دۆخی سروشتی" یەکسانی و ئـازادی بـۆ هـەموو کـەس ڕەچـاو دەکـات و بـەردەوام کـارکردی نۆرمـاڵی خـۆی دەپارێزێ. چونکە بەڕای لۆك، تاك بەو پێش مەرجە بە پەیمانی دەوڵەتی وەفادار دەمێنێتەوە کـە دەوڵـەت ژیـانی بپارێزێـت و بەرژەوەنـدی گشتی کۆمەڵگاش رەچاو و دابین بکات.

دووەم ئەگـەر دەوڵـەت نـەتوانێت ئاسـودەیی هاووڵاتیـان مـسۆگەر بکـات و ژیـان و ئـازادی و موڵکایەتیان بپارێزێت، ئەوە پـەیمانی دەوڵـەتی بـێ بایـەخ دەبێـت و خـەڵك دەتـوانن داوای مـافی سروشتی یان "مافی مرۆیی" خۆیـان لـە دەوڵـەت بکەنەوە. لە روانگەی لۆکدا، مافی مـرۆڤ هـەڵگری مافگـەلێکی وەك "ژیـان"، "ئـازادی" و "موڵکایەتی تایبەت"ییە. لە کاتێکدا ئەم مافە بنـچینەییانە دابـین نـەکرێت، ئـەوە دەوڵـەت بـێ بـەهاو بایـەخ دەبێـت و خـەڵك مـافی گـۆڕانی حکومەتی پێدەدرێ.

ئەوەی لۆك لایەنیکەم بەشێوەیەکی شاراوە لەو مافانەی مرۆڤەوە دەست پێدەکات کە قابلی سپاردن نین سێهەم، لۆك بۆ وەدەستهێنانی مافی مرۆڤ، شێوەی کاتی دەگرێتەبەر. ئەو پێی وایە دەوڵەت نەك تەنیا دەبێت ڕێز لە مافەکان بگرێت بـەڵکو پێویـستە لەسـەری کـە دەستەبەریـشی بکـات. بـۆ ئـەم مەبەسـتە هێـزە دەوڵەتیـەکان دابەش و مۆڵەتی حکومەت سنووردار دەکات.

بە کورتی دەتوانین بڵێین لـە مێژووی هـزردا، لەتـەك جـۆن لـۆك دەرۆینـە قۆناغێکـەوە کـە بەشـێوەیەکی راسـتەقینە بـاس لـە مـافی مـرۆڤ دەکرێـت. بـەڵام ئەمـە هێـشتا لوتکـەی پوختـەبوونی هـزری مـافی مـرۆڤ لـە سـەردەمی رۆشـنگەری نییـە. مۆنتـسکیۆ، رۆسـۆ و کانـت هەرکام بە شێوەو میتۆدی خۆیانەوە ئەم هزرە بەرەو پێش دەبەن.

## مۆنتـسکیۆ: دابەشـکردنی دەسـەڵاتەکانی دەوڵەت لە خزمەت دەستەبەرکردنی ئازادی.

شارل مونتسکیۆ *charles louis de secondat* *(de montrsquieus (1689-1775* بیرمەنـدێکی فەرەنـسییە کـە تێکـڕا ئـەو بـە سیاسـیترین فەیلەسوفی چەرخی رۆشنگەری پێناسە دەکەن. بایـەخی بیرۆکـەکانی مۆنتـسکیۆ سـەبارەت بـە مافەکانی مرۆڤ، لە بەیاسایی کردنی پەیوەندییە مرۆییـەکان و لێکجیاکردنـەوەی دەسـەڵاتە دەوڵەتیـەکان دەردەکـەوێ. مۆنتـسکیۆ لـە ژێـر کاریگـەری بۆچـوونەکانی لۆکـدا، نێـوەڕۆکی تیـۆری لێکجیاکردنـەوەی دەسـەڵاتە دەوڵەتیـەکان پوختـە و رێـك و پێـك دەکـات. بابـەتی رێپێـشاندەر لـە هـزری مۆنتـسکیۆ دەسـەڵاتی رەهـای یاسـایە کـە هـەموو دونیـا و پێکهاتەکانی دەگرێتەوە.

مۆنتسكیۆ یاسای ئەقڵ، کە کاریگەری لەسەر مرۆڤ هەیە و ڕۆحیشی دەگرێتەوە، بە سروشتیش گرێ دەدات. بەم پێیە، ئەقڵ لە سروشتیشدا زاڵ دەبێت و مۆنتسكیۆ بە "یاسای سروشتی" ناوی دەبات. بەڕای مۆنتسكیۆ بۆ مرۆڤ گرنگە کە بنەماکانی ئەم جۆرە یاسایە بدۆزێتەوە و بزانێت چ پێوەندییەکی بە ئەقڵی ئەوەوە هەیە، پاشان بە تێگەیشتنێکی ژیرانە لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و ژیانی خۆیدا بەکاریانبهێنێت تەنها بەهۆی ئەمەوەیە مرۆڤ دەتوانێت خۆی لەو پێشداوەریانە بپارێزێت کە ڕێگرن لەوەی خۆی وەك خودێکی عەقڵانی و یەکگرتوو لەگەڵ یاسا عەقڵانیەکانی خوڵقاندندا، بناسێت.

بەڕای مۆنتسكیۆ هۆی ئەم جۆرە پێشداوەرییانە، بەستراوەیی مرۆڤ بە ئۆتوریتەو سەرچاوەگەلی دەسەلاتە دینی و دەوڵەتیەکانە. ئەم پێشداوەرییانە لە ویستی دوور لە عەقڵ چاوگە دەگرن و ئەرکی سەرشانی مرۆڤایەتییە کە بە یارمەتی ڕۆشنگەری خۆی لەو زنجیرە ڕزگار بکات. گرنگترین بەرهەمی مونتسكیۆ، واتا "روحی یاساکان" بۆ ئەم مەبەستە ڕۆشنگەرییە تۆمار کراوە.

مۆنتسكیۆ لەو بڕوایەدایە کە سنووردارنبوونی مرۆڤ، دەبێتە سنوردارێتی و پێویستیەك کە لە هەموو زیندەوەرەکاندا هاوبەشە، بەسەر مرۆڤیشدا دەسەپێت. لە بەرانبەر ئەمەدا مۆنتسكیۆ پێی وایە ئازادی مرۆڤ، مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی دیکە جیا دەکاتەوە و پێگە و ڕێزی تایبەتی پێدەبەخشێت. سنورداربوون لەلایەك و سەربەستی لە لایەکیترەوە دەتوانن مرۆڤ بخافڵێنن بۆ ئەوەی خیانەت لە عەقڵی خۆی بکات، و ڕێگا بە ویست و مەیل و خۆشییەکانی ژیان بدات تاوەکوو بەسەر ئەقڵیدا زاڵ بن. بەلأم مرۆڤ بەهۆی عەقڵی خۆیەوە خاوەن ئەو توانایەشە کە لە ئازادیدا ئەو یاسایانەی تایبەتە بە ژیانی خۆیەوە، بناسێتەوە و پەیڕەویان لێبکات. چونکە دۆزینەوە و ناسینی هوشیارانەی یاسا گونجاوەکان و هەوڵدان بۆ بەرەسمی کردنیان دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی مرۆڤ بە سروشتی ڕاستەقینەی خۆی بگات. واتا گەیشتن بە زاتێکی بیرمەند کە بە باشترین شێوە چارەنووسی سیاسی – کۆمەڵایەتی خۆی دیار دەکات.

مۆنتسكیۆ یاسا دیاریکراوەکان بۆ ژیانی پراکتیکی مرۆڤ بە دوو بەشی: یاسا سروشتیەکان و یاسا بابەتیەکان پۆلێن دەکات. یاسا سروشتیەکان کە بۆ گشت مرۆڤەکان لە هەموو سەردەمێك و لە هەر بارودۆخێك گرنگیان هەیە بریتین لە پێویستی بە ئاشتی، دۆزینەوەی خواردەمەنی بە مەبەستی زیندوو مانەوە و پاراستنی بوونیەتی، مەیل بۆ ڕەگەزی بەرامبەرو حەزکردن بە ژیانی کۆمەڵایەتی. ڕاستەوخۆ پاش ئەوەی مرۆڤەکان دەچنە ناو ژیانی کۆمەڵایەتیەوە، پێویستە یاسا سروشتیەکان بۆ یاسا بابەتیەکان بگۆڕێت و لە تەك کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا بیگونجێنێت. بەڕای مۆنتسكیۆ، یاسا بابەتیەکان بەشێوەیەکی دەزگایی پێویستە پێوەندییەکانی خوارەوە ڕێك و پێك بكات:

1- پێوەندی نێوان کۆمەڵگایەك لەگەڵ کۆمەڵگایەکی تر کە مۆنتسکیۆ بۆ خۆی ئەو پێوەندییە لە ژێر ناوی ماف نەتەوەکان (ماف نێو نەتەوەیی) کۆبەندی دەکات.

2- پێوەندی نێوان کەسانێك کە حکومەت دەکەن لەگەڵ کەسانێك کە بەسەریاندا حکومەت دەکرێ، مۆنتسکیۆ ئەم پێوەندییە لە ژێر ناوی ماف سیاسی و دەوڵەتی کۆبەندی دەکات.

3- پێوەندی نێوان هاووڵاتیانی شارێك کە مۆنتسکیۆ لە ژێر ناوی ماف مەدەنی کۆبەندی دەکات.

بەلأم سەرەڕای ئەم پۆلێنکردنە لە مەڕ رێك و پێککردنی پێوەندییە کۆمەلأیەتیەکان، پێویستە تێڕامانی مۆنتسکیۆ سەبارەت بە جۆری حکومەت بۆ خەملأندن و پوختەکردنی هزری ماف مرۆڤ زۆر بەرز بنرخێنین. مۆنتسکیۆ بە گشتی سێ جۆر سیستمی حکومەتی لێکجیادەکاتەوە کە بریتین لە: کۆماری، پاشایەتی و دیکتاتوری. مۆنتسکیۆ پێی وایە کە کۆماری دەتوانێت لە فۆرمی دیمۆکراسی و ئەریستوکراسی خۆی بنوێنێ. هەڵبەتە لە لای مۆنتسکیۆ ئەریستوکراسی بەهای مێژوویی خۆی لە دەست دەدات. کەوا بوو ئەو لە تێڕامانەکانی خۆیدا، پتر بە شوێن ئاڵترناتیڤێکدایە لە نێوان پاشایەتی مەشرووتەو سیستمی کۆماری. بەلأم ئەوەی بۆ مۆنتسکیۆ پێش لە جۆری حکومەت گرنگە، کاکڵ و نێوەرۆکی حکومەتە، ئەگەرچی مۆنتسکیۆ مەیلی بەرەولای پاشایەتی مەشروتەیە و دژ بە دیموکراسی ڕادیکاڵە و پێشنیاری یاسایەکی بنەچەیی مامناوەندی دەکات، بەلأم لە تێڕامانەکانیدا دیمۆکراسی وەکو ڕێسایەکی بنەمایی لە نێوەرۆکی حکومەت گرنگی و بایەخێکی سەرەکی هەیە.

مۆنتسکیۆ بۆ گشت سیستمە حکومەتیەکان رێساگەلێکی دامەزراندووە. بە بڕوای ئەو رێسای سیستمی دێمۆکراتێك، ڕەوند (فضيلت *virtue .morality*)ە. دیمۆکراسی بۆ پاراستنی ئەو ڕەوندە، پێویستی بە فەرمی ناساندن و پابەندبوون بە رێسای یەکسانی هاووڵاتیان هەیە. هەڵبەتە مۆنتسکیۆ چاوپۆشی لە جیاوازی کۆمەلأیەتیەکانی هاووڵاتیان ناکات، و بە سەرنجدان بە توانا جۆراوجۆرەکانیان و هەروەها پێگەی جیاوازی کۆمەلأیەتیان، یەکسانی تەواو بە دوور لە راستی دەزانێت و لەسەر ئەو بڕوادایە کە تەنیا لە کەناڵی زەبر و زەنگەوە یەکسانی تەواو مسۆگەر دەبێت. مۆنتسکیۆ هاوکات لەو بڕوایەدایە کە ئەگەر دیمۆکراسی بیەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، نابێت رێگە بە جیاوازییە کۆمەلأیەتیەکان بدات بۆ ئەوەی ڕەهەندی ڕادیکاڵی بەخۆوە بگرن. بەم پێیە مۆنتسکیۆ خوازیاری یەکسانییەکی کۆمەلأیەتی رێژەییە. لای مۆنتسکیۆ، سروشتی دیموکراسی لە کەناڵێك دەردەکەوێت کە لەودا خەڵك خاوەنی بەرزترین دەسەلأتی یاسادانانی دەوڵەتییە. خەڵك ماف و ئەرکی دیاریکردنی بناغەی سەرەکی دەوڵەت و هەروەها شێوەی هەڵوێست وەرگرتنەکانی پێدەدرێت. بە واتایەکی تر، ماف بڕیاردانیان لەسەر دەستور هەیە. لە لێکدانەوەکانی مۆنتسکیۆدا ئەگەرچی خەڵك ناتوانن وەکو کەسانی پسپۆڕ مەسەلەکان

بناسن، بەڵام بنەمای تێگەیشتنێکی ئەقڵانیان تێدا هەیە کە بتوانن پشتی پێببەستن و بە خواستی خۆیان کەسانی پسپۆر لە بواری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا هەڵبژێرن. کەسانێك کە دەتوانن کارە حکومەتیەکان لەسەر بنەمای ئیرادەی ئەقڵی گشتی راپەڕێنن. بەڕای مۆنتسکیۆ، لەم شێوازەی هەڵبژاردندایە کە خەڵك بۆ خۆیان باڵادەست دەبن و دەتوانن بڕیاری چارەنوسساز لەسەر پاشاکان بدەن. پاشاگەلێك کە لەناو کۆشکەکانیاندا بە گۆشەگیری ژیان دەکەن و خۆیان بە دەوڵەت پێناسە دەکەن. لە سۆنگەی ئەم جۆرە توێژینەوەو شرۆڤەکردنی دیموکراسیدایە کە مۆنتسکیۆ بە هزری لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دەگات. ناوبراو بۆ بەربەرەکانێی دیاردەی سیاسی پاشایەتی ڕەها، گەلاڵەیەکی سیاسی دادەڕێژێت کە لەسەر بنەمای ویستی ئازاد و ڕێزگرتنی مرۆڤ پێك دێت. بەم پێیە، ئازادی ڕێکخەر و ڕێپیشاندەری تیۆری لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانە. هەرچەندە بە تەنیا ئەم لێکجیاکردنەوە گرەنتی سەربەستی مرۆڤ ناکات، بەڵام بە یارمەتی و نێوبژیوانی ئەو و دامەزراندنی سێ دەسەڵات کە هەریەکە دەسەڵاتی ئەوی تر کۆنترۆڵ و سنووردار بکات، ئازادی گونجاو دەبێت. مۆنتسکیۆ سەرەتا دەزگا جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت لێکجیادەکاتەوەو بەسەر سێ دەزگای یاسادانان، بەڕێوەبەری و دادوەری دابەشیان دەکات. پاشان هەریەکە لەو سێ دەزگایانە بە ئۆرگانێکی دەوڵەتی دەسپێرێت هەر بۆیە زۆرێك لە پسپۆڕانی فەلسەفەی سیاسی پێیان وایە کە مەبەستی مۆنتسکیۆ لەم پۆلبەندیە پێکهێنانی هاوسەنگییە لە نێو دەوڵەتدا، هاوسەنگییەك کە سەرەڕای دابەشکردنی بەرپرسایەتیەکان کاریگەری لەسەر بەرتەسك و سنوردارکردنی دەسەلاتە دەوڵەتیەکان بەجێدەهێڵێت.

بە کورتی دەتوانین بڵێین، بە سەرنجدان لە راستییە مێژووییەکانی ئەو سەردەمە، هزری مۆنتسکیۆ لە پەراوێزی ئەم مەسەلەدا خولاوەتەوە کە باشترین میکانیزمی دەستەبەرکردنی ئازادی تاکەکەس بدۆزێتەوە. مۆنتسکیۆ چارەیەك لەم بوارەدا دەخاتە ڕوو کە لەسەر بنەمای لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتە دەوڵەتییەکان پێکهاتووە، و لە ڕەوتی مێژووییدا بە یەکێك لە گرنگترین ئامرازەکانی دەستەبەرکردنی مافی بنەچەیی مەدەنی دەژمێردرێت.

**ژان ژاك رۆسۆ** ( *jean jacques Rousseau 1712-1778*) هزرڤانێکی سویسییە کە لەسەدەی هەژدەیەم و لە لوتکەی سەردەمی رۆشنگەری ئەوروپا ژیانی بەسەر دەبرد. بیرۆکەکانی رۆسۆ لە بواری سیاسی، ئەدەبی و پەروەردەییەوە کاریگەری مەزنی لەسەر هاوچاخەکانی هەبووە. رۆسۆ ساڵانێك لە پاریس ژیاوە، رۆڵی هزری ئەو، وەك یەکێك لە ڕێ پێشاندەرانی ئامانجەکانی شۆڕشی مەزنی فەرەنسە، حاشای لێناکرێت. رۆسۆ یەکەمین فەیلەسوفی رۆشنگەرییە بەشێوەی دیاریکراو چەمکی ماڤی مرۆڤ بەکاردەهێنێت بەڵام ئەم چەمکی لەلای ئەودا واتایەکی تایبەتی و سنوورداری هەیە. بە گشتی دەتوانین بڵێین تیرامانی رۆسۆ رادیکالانەترە لە تێڕامانەکانی هۆبز، لۆك و

مۆنتسکیۆ. ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێت کە هەندێك لە توێژەرانی مێژوویی هزر ڕۆسۆ بە درێژەدەری نەریتی هزری سەردەمی ڕۆشنگەری نەزانن. ڕۆسۆ بۆ زۆربەیان بە ڕەخنەگرێکی فەلسەفەی ڕۆشنگەری ناسراوە. ئەم خاڵە بۆ ئەو تێبینیانە کە ئەم نوسینە بە شوێنیاندا دەڕوات، نادروستو بێ بناغەیە، بەڕای ڕۆسۆ چاوپۆشیکردنی مرۆڤ لە سەربەستی، بە واتای چاوپۆشیکردن لە خەسڵەتی مرۆڤایەتی و "مافی مرۆڤ"ە. ئازادی، وەك ئازادی ئیرادە نابێ چاوپۆشی لێبکرێت، چونکە ئەم ئازادییە پێشمەرجی مرۆڤ بوونەو بە ڕێسای ڕەوشتی مرۆڤایەتی دەژمێردرێت. بەم پێیە، ئێمە لای ڕۆسۆ ئاڵوگۆڕێك لەسەر چەمکی مرۆڤ بەدی دەکەین، مرۆڤ لای ئەو تەنیا لە کاتێکدا بە واتای ڕاستەقینە مرۆڤە کە سەربەست بێت. ئەو پێی وایە هەموو مرۆڤەکان لە کاتی لەدایکبوونیاندا ئازاد و یەکسان بە دونیا هاتوون. ئەم ووتەیەی ئەو بەناوبانگە کە دەیگوت: "مرۆڤ سەربەست لەدایك دەبێت کەچی لە هەموو شوێن و جێگایەکدا زنجیرکراوە". بەم پێیە بۆمان دەردەکەوێ کە ڕۆسۆ لە نەریتی تێزی هۆبزدا، لە مەڕ مافی سروشتی سکولار بیری کردۆتەوە. هەرچەندە کە لە زۆر بواردا لە بۆچوونەکانی هۆبز دوور دەکەوێتەوە.

لە ڕوانگەی ڕۆسۆدا، مرۆڤ لە "دۆخی سروشتیدا" سەرەڕای ئەوەی کە خاوەن ئازادییەکی بێ سنووری ڕواڵەتیە، بەلآم بە واتای تەواوەتی وشە ئازادی نییە. مرۆڤ گیانلەبەرێکە کە لە ڕێگای مەیلە هەراوو خۆویستەکانی ناخییەوە داخوازی و ئارەزووەکانی دیاری دەکات. مرۆڤ کاتێك بە مانای ڕاستەقینە سەربەستە کە بەسەر زاتی ڕەوشتی خۆیدا زاڵ بێت و وەکو "هاوولآتییەك" پەیڕەوی لەو یاسایانە بکات کە بۆ خۆی تۆماری کردوون. ڕۆسۆ پێی وایە لە کاتی گواستنەوەی "دۆخی سروشتی" بۆ "دۆخی هاولآتیبوون" گۆڕانێکی لێبڕاوانە ڕوودەدات. بەلآم ئەم گۆڕانە تایبەتمەندییەکی سروشتی و پوختەیی نییە بەڵکو گۆڕانێکی نۆرماتیکییە. مرۆڤ لە دۆخی هاولآتیدا دەگۆڕێت بۆ زاتێکی ڕەوشتی و پێویستە لەسەری کە کردار و هەڵسوکەوتەکانی لە چوارچێوەی نۆرمەکاندا، بە ئامانجی سەقامگیری کۆمەلآیەتی و بەرژەوەندی گشتی ڕێك بخات.

کەوا بوو ئەگەر ئازادی سروشتی گشت مرۆڤەکان ئازادییەکی ڕەها بێت، ئەوە ئازادی تاك، بەهۆی ئازادی هاولآتیبوونەوە کە کۆمەلآنی خەڵك دیارییان کردووە سنوردار دەبێت، بەم شێوەیە ڕۆسۆ هەوڵدەدات جۆرە هاوسەنگییەك لە نێوان ئازادی تاك و ئازادی گشتی پێك بهێنێت. کە ئەم کارە لە ڕێگای بەرهەمە ناسراوەکەی خۆیدا، واتا "پەیمانی کۆمەلآیەتی" کە لە ساڵی 1762 میلادی نوسراوە، پراکتیزە دەکات.

ڕۆسۆ لە بەرهەمی ئاماژە پێکراودا بە شوێن پرۆژەیەکی دەوڵەتییە بۆ پەیمانی کۆمەلآیەتی کە لەسەر بنەمای ئەودا شێوەیەك ڕێکخستن پێك بهێنێت. ڕێکخستنێك کە نەك تەنیا بەرگری و پارێزگاری لە ئازادی بکات، بەڵکو لە ئاکامی یەکیەتی تاك لەگەڵ ئەوانی تر، ئەو

ئاسته لە ئازادی مسۆگەر بکات کە تاك لە دۆخی سروشتیدا هەیبوو. رۆسۆ پێی وایە ئەوەی مرۆڤ لە ئاکامی ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە لە دەستی دەدات مافی رەهای سروشتیە کە لە هەموو بوارەکاندا خاوەنی بووە، و ئەوەی لەم پەیمانەدا بەدەستی دەهێنێت "ئازادی شارومەندی و موڵکایەتییە بەسەر هەموو ئەو شتانەی کە هەیەتی". کەوابوو دەتوانین بڵێین لە روانگەی رۆسۆدا مرۆڤ ئازادی سروشتی بە ئازادی هاولاتی دەگۆڕێتەوە و لە بەرانبەر لەدەستدانی "ماڤ" رەها، ئاسایش و دەستەبەرکردنی موڵکایەتی تایبەت بەدەست دەهێنێت. ناوبراو هەروەها پێی وایە "ماف" لە دۆخی سروشتیدا کە هێشتا یەکێتییەکی مرۆڤایەتی بۆ پەیرەوکردنی مافەکان پێك نەهاتووە بێ واتایە، و سەرکەوتنی لای "دۆخی هاولاتییە".

هەنووکە دەتوانین بە هەڵسەنگێندراوی بپرسین، دۆخی هاولاتی چۆن دەتوانێت دەستەبەری ئەو ئاستە لە ئازادی بکات کە مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا هەیەتی؟

رۆسۆ هەوڵدەدات لە رێگای جۆرە هاوسەنگی پێکهێنانێك لە چەمکی ئازادی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە. ئەو لە نێوان "ئازادی سروشتی"، "ئازادی هاولاتی" و "ئازادی رەوشتی"دا جیاوازی دادەنێت و پێیوایە ئازادی رەوشتی مرۆڤ دەکاتە حاکمی راستەقینەی خۆی. بەڕای رۆسۆ، پێویستە مرۆڤ لە کۆمەڵگای مرۆیدا گوێرایەڵی یاسایەك بکات کە خۆی تۆماری کردووە. هەروەها پێویستە کە خۆی لە مەیلە خۆرسکی و خوخوازی بەرژەوەندیخوازییەکان رزگار بکات. تەنیا پەیرەویکردن لە یاسایەك کە (خودی مرۆڤ تۆماری کردووە) بە واتای ئازادییە، و مرۆڤ ئەوکاتەی بە واتای راستەقینەی وشە لە کۆمەڵگای هاولاتیدا خاوەن ئازادییە کە هەڵسوکەوتەکانی لە چوارچێوەی رێزگرتن لە یاساکاندا بێت.

بەمشێوەیە رۆسۆ هەوڵدەدات بەشێوەی خۆی لە نێوان سروشت و عەقڵ یان بەدەربڕینێکی تر لە نێوان "ماڤ سروشتی بێ سنور" و "ماڤ عەقلانیانەی سنوردار"دا پردێك دروستبکات. ئامانجی ئەو، گەیشتنە بە هاوسەنگییەك لە نێوان ئازادی سروشتی و ئازادی هاولاتی و ئازادی رەوشتیدا. تەنهاش بەم مانایە رۆسۆ بە مانای ئازادی مرۆڤە.

لە روانگەی رۆسۆدا پێویستە کۆمەڵگای هاولاتی کە بەهۆی پەیمانی کۆمەڵایەتییەوە پێکهاتووە، ئازادی راستەقینە دەستەبەر بکات. رۆسۆ ئەو ئازادییەی بە ماڤ مرۆڤی دەزانێت، لە بیرۆکەی کۆمەڵگای هاولاتی و دەوڵەتی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، بە بەدیهێنراو دەبینێ. ئەمە خاڵێکی گرنگ و سەرەکیە لە تێڕامانەکانی رۆسۆدا. ئەو پێی وایە مسۆگەربوونی هزری ماڤ مرۆڤ لە دەوڵەتی دەرهاویشتە لە پەیمانی کۆمەڵایەتیدا دەردەکەوێت. ئەو دەوڵەتەی رۆسۆ بیری لێدەکاتەوە، هەر لە بنەڕەتدا دەوڵەتێکە ئازادی مرۆڤ لەسەر بنەمای ماڤ مرۆڤ دەستەبەر دەکات. لە ئاکامی ئاوەها بیرکردنەوەیەکدا، داواکردنی پاراستنی ماڤ مرۆڤ لە دەوڵەت، بەهاو تەنانەت بابەتیبوونی نامێنێت، چونکە خودی دەوڵەتی رۆسۆیی

نوێنەری ماف بنەڕەتی و ئازادی تاك بە تاكی هاووڵاتیانە. ماف مرۆڤ لە تێزەکەی ڕۆسۆدا، لەناو دەوڵەتدا تواوەتەوە. چونکە مرۆڤ بە چاوپۆشیکردن لە ماف و دەسەڵاتێك کە لە دۆخی سروشتیدا هەیبوو، خۆی و هێزی خۆی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی مەزنی "ئیرادەی گشتی"، و بەم جۆرە دەبێتە ئەندامێك لەناو جەستەی گشتیدا. "ئیرادەی گشتی" یەك ڕۆحی گشتییە و پێکهاتەیەکی زیندووە لە "من"ە هاوبەشەکان. بەڕای ڕۆسۆ، "ئیرادەی گشتی" وەکو جەستەیەکی مرۆڤە کە هەر ئەندامێکی برینداربێت، گشت جەستەکە بریندار دەکات. هزری ڕۆسۆ لە مەڕ دەوڵەتی ئایدیال، ئیلهامی لە ئامانجی دەوڵەتشار (پولیس)ی یونان وەرگرتووە کە وەکو جەستەیەکی گشتییە. ڕۆسۆ لە هەمان کاتدا دژی کۆیلەیەتییە، پێی وایە "کۆیلەیەتی" و "ماف" دژایەتی توندی یەکتر دەکەن و هێچکات توانای پێکەوە گونجانیان نییە. بەڕای ڕۆسۆ هیچ بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی ڕەوابوونی کۆیلەداری بوونی نییە. ئەگەرچی ڕۆسۆ لە نێوان "هاولاتی" یان پێڕەوانی دیاریکراوی دەوڵەتێك و "مرۆڤ"دا جیاوازی دادەنێت، بەڵام جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەگەر کەسانێك هاولاتییان پێڕەوانی دەوڵەتێك نەبن، ئەوە وەکو مرۆڤ شیاوی ڕێزلێنانن و نابێ پێگەو گەورەیی ئەوان بە هاولاتیبوونیان گرێ بدرێت.

**ئیمانوئیل کانت:** ماف مرۆڤ پێوەری ڕەوابوونی دەوڵەت لە تاوتوێکردنی ڕوانگەی بیرمەندانی چاخی ڕۆشنگەریدا سەبارەت بە ماف مرۆڤ بە ئیمانوئیل کانت *immanuel kant* (*1734-1804*)) فەیلەسوفی ئەڵمانیا دەگەین، کانت لە کۆتایی سالآنی سەدەی هەژدەیەمدا، لە یەکێك لە بەرهەمە پڕ بایەخەکانی لە بواری ماف مرۆڤ "میتافیزیکیای ئەخلاق" بلاوکردەوە. کانت لەم بەرهەمەدا، ئازادی مرۆڤ بە مافێکی سروشتی لە قەڵەم دەدات و پێی وایە مرۆڤ هەر لە کاتی لەدایکبووندا خاوەن ئەم مافەیە، هەروەها لە درێژەی ئەم بەرهەمەدا ئازادی مرۆڤ وەکو مافێکی مرۆیی بە فەرمی دەناسێت. ئازادی بە تێگەیشتنە کانتییەکەی، مادام بتوانێت لە تەك ئازادی ئەوانی تر لە چوارچێوەی یاسایەکی گشتیدا جێگیر بێت، مافێکی سەرەتایی مرۆڤە کە بەهۆی مرۆڤی بوونی لێی بەهرەمەند دەبێت. کانت هەموو بنەماکانی تری ماف مرۆڤ وەکو سەربەخۆی و یەکسانی مرۆڤ لێکجیادەکاتەوە. بەم پێیە، کانت لە فەلسەفە سیاسیەکەیدا، نەك تەنیا بە تەواوەتی دواهەمین پێوەندییەکانی نێوان هزری سیاسی سەردەمی نوێ و ڕابردوو لێکجیادەکاتەوە، بەڵکو زێدەتر لەوەش بە شێوازێکی بەردەوام چەمکی "ماف سروشتی" سەردەمی ڕۆشنگەری ڕادیکالیزە دەکات.

تێڕامانی کانت بۆ مرۆڤ زۆر قووڵە. بەڕای ئەو ئەگەر بتوانین شتێك وێنا بکەین کە بوونی لە خۆیدا بەهایەکی ڕەهای هەبێت، واتە "ئامانجێك بێت لە خۆیدا"، ئەوە دەتوانین ئەو شتە بەسەرچاوەی یاسای یەکلایکەرەوەکان (قوانین قطعي) لە قەڵەم بدەین. هەروەها دەتوانین جەبری یەکلایکەرەوە (بایستەی قطعي *Ketegorischer imprativ*) یان یاسای پراکتیکی

لە کانگای ئەو شتەدا دەربکێشین. کانت لەو بڕوایەدایە مرۆڤ خاوەن ئەو تایبەتمەندیانەیە، وە بە ڕاشکاوانە ڕادەگەیەنێت زاتێکی هۆشیار تەنیا شتێکە وەك ئامانجێك لە خۆیدا، بونی هەیە، نەك وەك هۆکارێك کە ئەم یان ئەو ئیرادەیە بتوانێت بەشێوەیەکی دیکتاتۆرانە بەکاریبهێنێت. کەوابوو، مرۆڤ لە هەموو چالاکییەکانیدا، چ پەیوەندی بەوەوە هەبێت چ پێوەندی بە ئەوەوە نەبێت، پێویستە بە بەردەوامی وەك ئامانج چاوی لێبکرێت. لێرەوە کانت پێیوایە هەموو شتەکان نرخیان هەیە تەنیا مرۆڤە ڕێزو پێگەی هەیە. لەم بارەوە با سەرنج لە پێناسە وردەکەی خودی کانت بدەین: "لە بواری ئامانجەکاندا هەر شتێك، یان نرخ، یان پێگەی هەیە. ئەو شتەی کە نرخدارە، دەکرێت شتێك لەبری دابنرێت بەلآم لە بەرامبەردا، ئەو شتەی لە سەرەوەی هەموو نرخەکان جێدەگرێت و هیچ شتێك لە بری دانانرێت، خاوەن شکۆ و پێگەیە". کانت بەم پێناسەوە خۆی دەخاتە ناوبەرەی نەریتی میتافیزیکی یۆنانی کۆن و یونانیەکان بە سەرنجدان لە زاتی مرۆڤ، لەناو سیستمی جیهانیدا، پێگەی تایبەتیان پێدەبەخشی. لای کانت مرۆڤ بەسەرنجدان لەم پێگەیە، دەبێتە خاوەن بەهایەکی ڕەها کە دەکرێت بە "مرۆڤ پیرۆزی" لە بونی تاك بە تاکی مرۆڤەکاندا ناوبنێین. ناوبراو لە درێژەدا دەڵێت: "ئەگەرچی مرۆڤ بەوشێوەیەی کە دەبێت، پیرۆزنییە، بەلآم لەسەری پێویستە ئەو مرۆڤایەتییەی کە لە ناخیدایە بە پیرۆزی چاولێبکات". کانت دەڵێت: ڕێزگرتنی مرۆڤ لە پێگەی مرۆڤ، بەراورد ناکرێت بەخۆویستی سروشتی ئاژەڵی، چونکە ئاکامی ئەم چەشنە ڕێزگرتنە ئازادییە. مرۆڤ بە پاڵپشتی هوشیاری، تەنیا بونەوەرێکە دەزانێت بە شوێنداچوونی ئامانجە خۆخوازییەکان قازانجی زۆری تێدا دەبێت. بەلآم ئەگەر مرۆڤ بەویستی خۆی و بەپێی ئیرادەی ئازاد، بیەوێت زوڵم و ستەم بەرانبەر هاوچەشنەکانی نەکات و لە ئامانجە خۆویستەکانی دوور بکەوێتەوە، ئەوا نەك هەڵەیە لە یاسا سروشتیەکان، بەڵکو لە یاسا ڕەوشتیەکان پێڕەوی کردووە. ئەم یاسا ڕەوشتیە کە بەهاو پێگەیەکی بەرزی هەیە، تەنیا لە مرۆڤدا بە دی دەکرێت. بەو سنورەی کە کانت لە نێوان پێگە (منزلت) و نرخدا دیاری دەکات، دەتوانین سیٚ تایبەتمەندی بۆ مرۆڤ بە تێگەیشتنی کانتی ئەژمار بکەین:

**یەکەم،** پێگە شێوەیەك پەیوەندییە نەك سیفەت.

بە وتەیەکی تر پێگە شتێك نییە لە مرۆڤدا بەڵکو پێوەندیە لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا. پێوەندیەك کە لە نێوان مرۆڤەکاندا لەسەر بنەمای مرۆڤایەتی بنیادنراوە. هەرکاتێك هەوڵماندا ئەم پێگەیە بە کۆمەڵێك سیفەتەوە ببەستینەوە، ئەوا خەسڵەتە تایبەتیەکەیمان سنوردار کردووە. هەر بۆیە پێویستە باس لە یەکپارچەیی و "لەکە هەڵنەگری" ڕێز و پێگەی مرۆڤ بکەین. هەڵبەتە "لەکە هەڵنەگری" پێگەی مرۆڤ بەو واتایە نییە کە ڕێز و حورمەتی هیچ مرۆڤێك لەکەدار نابێت، بەڵکو بە واتای پێوەندی نەپساوەیە لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا. هەرکەسێکیش پێگەی مرۆڤ

لەکەدار بکات، پێش لە قوربانی، پێگەی خۆی لەکەدار کردووە.

**دووهـــەم،** پێگـە پلـە و دۆخێکـی سروشـتی مرۆڤایەتییە نەك مەسەلەیەکی وەدەستهاتوو. بە واتایـەکی تـر، پێگـەی مرۆڤایـەتی لـە نـاخی مرۆڤـەوە سـەقامگیر بـووە و بەرهـەمی هـەوڵ و لێهـاتوویی نییـە. لـە ئاکامـدا دەتـوانین بڵـێین، توانـــا جەســـتەیی و روحیـــەکانی کەســـێك، ناتوانێت پێگەی ئەو لە هەمبەر کەسانی تر بەرز بکاتەوە.

**سێهەم،** تێگەیشتن لـە پێگـەی مـرۆڤ، هەمیشـە وەکـو ئـەرك بـووە تـاوەکو ئیمتیـاز. مـرۆڤ بـە پێچەوانەی ئاژەڵەوە دەتوانێت کردەی خۆی لـە بەرانبـــەر زاتـــە هۆشـــیارەکانی تـــردا پاســـاو بداتـەوە. ئـەم کـارەش نـە وەکـو چـێژ و بـەهرە، بـــەڵکو وەکـــو ئـــەرکێکی رەوشـــتی شـــیاوی تێگەیـشتنە، سەربەسـتی ئـیرادەی مـرۆڤ، واتـا وەئەسـتۆگرتنی بەرپرسـیارێتی و هەڵسوکەوتی بەرپرسیارانە، ئەمەش بەو واتایە دێت کە مرۆڤ، نەك تـەنیا دەتوانێت بەڵکو ئەرکی سەرشانێتی کە کردەوەکـانی خـۆی لـە هەمبـەر ئـەوانی تـردا، پاسـاو بداتـەوە. کـەوابوو، قبـوڵکردنی پێگـەی مرۆڤ تـەنیا بـە واتـای دەسکەوت نییـە لـە بـواری تیۆریـــــدا، بـــــەڵکو هـــــەڵگری هۆشـــــیاری و تێگەیشتنی پراکتیکی، لێبوردەیی و سـەرنج، و هـەروەها ئـەزموون و لـە خۆبوردەییـە. هاوکـات توانـای پاسـاودانەوەی کـردەوەی خـودی لـە بەرانبـــەر ئـــەوانیتر، شـــێوەیەکە لـــە جـــەبری رەوشـتی. بـەم پێیـە، پێگـە هـەم خـەڵات و هـەم داسەپاندنە بەسەر مرۆڤدا. هـەر بۆیـە کانت، بـە سـەرنجدان بـەم بەڵگانـە، یەکـەمین دەسـپێکی "جـــەبری یەکلاکـــەرەوە" رادەگەیـــەنێت و بـــە چەشـــنی خـــوارەوە فورموڵبەنـــدی دەکـــات: "هەمیشە و هاوکات لـە هەڵسوکەوتەکانی خـۆت و ئـەوانیتر مرۆڤایـەتی نـەوەکو ئامێرێـك، بـەڵکو وەکو ئامانجێك رەچاو بکە".

ئامـاژەمـان بـەوە کـرد کـە کانـت تیـشکێکی نوێی لەسەر هـزری "مـاف سروشـتی" سـەردەمی رۆشـــنگەری هەڵداوەتـــەوە. لای ئـــەو، مـــاف سروشـتی نـەك کـارکردی راڤـەیی یـان شـیکاری، بـــەڵکو کـــارکردی نۆرماتیکیـــشی هەیـــە و لـــە سروشـتی مرۆڤـدا، چ جەسـتەیی و چ دەروونـی، لێکجیاناکرێتەوە. بەڕای کانت، دەبێت مرۆڤ ئـەم مافە بـە مـافێکی بنیاتنـەر یـان دامەزرێنـەر، و بـە واتایەکی دیکە بـە "مـاف ئـەقڵی" بزانێت. کانت پێیوایە ماف سروشتی لەسـەر کۆمـەڵێك بنـەمای پێـــشینەیی یـــان سەربەســـت لـــە ئـــەزموون (اپرپـوری) بنیـادنراوە. کانـت لـە نێـوان مـاف سروشتی سەربەست لـە ئـەزمون کـە هـەمان ماف عەقڵە، و ماف بابەتی واتا ماف تۆمارکراو لەلایەن یاسادانەر، پەیگیرانە جیاوازی دادەنێت. ئەگـەر مـــاف بابـــەتی، لـــە گۆشـــەنیگای سیاســـی و مێژووییەوە بەشتێکی رێژەیی لـە قەڵـەم بـدرێت، ئـەو پێناسـەیە بـۆ مـاف سروشـتی پێـشینەیی دروســـت نییـــە. بـــەم پێیـــە مـــاف سروشـــتی پێـشینەیی سـەربەخۆ لـە بـارودۆخی کـەلتوری، مێـــژوویی، کۆمەڵایـــەتی و دینییـــە. بۆیـــە بـــۆ مرۆڤـــەکان پێویـــستە وەکـــو مـــافێکی رەهـــاو دونیـایی بایـەخی پێبـدەن. کـەوابوو ئـەم مافـە مـافێکی مرۆییـە. هـەروەکو ئاماژەمـان پێـدا ئـەم مافــە مرۆییـــە لـــەلای کانـــت بـــە واتـــای مـــاف بەهرەمەندی لە ئازادییە.

کانت ئەگەرچی لە مەسەلەی هێما پێکراودا هاوبیری رۆسۆیە، بەڵام بۆ ئازادی پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە. ئەو لە هەر دوولاوە سنوورەکانی ئازادی دەستنیشان دەکات، ئازادی تاکەکەس هەر کەسێك، چوارچێوەی بوونی خۆی لە ئازادی هەموو مرۆڤەکاندا دەبینێتەوە. کەوابوو ئازادییە دڵخوازەکانی مرۆڤ لە دوولاوە یەکتر سنوردار دەکەنەوە. بەم پێیە، کانت لە تێفکرینەکانیدا بە چەمکێکی تایبەتی لە ماف دەگات، و بە کۆی هەلومەرجێك پێناسی دەکات کە تیایدا هەڵبژاردنی تاکێك لەگەڵ هەڵبژاردنی یەکێکی دیدا لە ژێر سایەی یاسایەکی گشتی ئازادیدا، پێکەوە دەگونجێنرێن.

کانت لەم پێناسەیەوە، یاسای گشتی ماف دەردەهێنێت و بەم چەشنە فۆرمولبەندی دەکات: "جۆرێك هەڵسوکەوت بکە کە بەکارهێنانی دەسەلأتی ئازادی تۆ، بتوانێت لەگەڵ دەسەلأتی ئازادی ئەوانی تر، لە سەر بنەمای یاسایەکی گشتی کۆببێتەوە".

ئەم خالأنەی سەرەوە دەرئەنجامێکی پڕ بایەخیان لێدەکەوێتەوە. چونکە پێوەر، یاسایەکی گشتی فۆرمولە کراوە کە دەتوانێت بەهۆی زانیاری مرۆڤەوە، جێگەی قبوولی کۆمەلأنی خەڵك بێت. بەلأم ئەم یاسا گشتیە فۆرمولە کراوە، نەك یاسایەکی دانراو، بەڵکو بە سروشتێکی یاسایەکی بنەچەیش دەژمێردرێت کە خەڵك ناچار بە گوێڕایەڵی لە هەموو یاسا بابەتیەکانی تر دەکات. ئەم خەسڵەتە (واتا خەسڵەتی دانانراوی یاسا وەکو پێوەرێکی بنچینەیی)، پێشمەرجی پێویست بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی رەواو شەرعی دەخوڵقێنێت. یاسا دانراوەکان و هەروەها پێوەرەکانی تر، دەتوانن لەسەر بنەمای ئەم پێوەرە بنەچەییەدا سەقامگیر بن، و بەم پێیە، پێوەری بنەچەیی مافی مرۆڤ، هەمیشە گرنگی و بایەخی خۆی دەپارێزێت.

بنەماگەلێکی تر وەکو سەربەخۆیی و یەکسانی، کە کانت لە تەنیشت بنەمای ئازادیدا، بە بنەماگەلێکی مەزنتر ناویان دەبات، بنەماگەلێکی دانراوی دەوڵەتی نین، بەڵکو بنەماگەلێکن هاوچەشنی بنەما بێگەردەکانی ئەقڵ کە لە مافی مرۆڤەوە سەرچاوەیان گرتووە، لە بنەڕەتدا دامەزراندنی هەر جۆرە دەوڵەتێك بە شێوەیەکی یاسایی، گونجاو دەکەن. ئەمەش بۆ خۆی وەرچەرخانێکی مەزنە لە هزری مافی مرۆڤدا چونکە بە گوێرەی ئەم بۆچوونە، هیچ دەوڵەتێك لە توانایدا نییە کە نۆرمە یاسایە ئاماژە پێکراوەکان، یان یاسا بنچینەییەکان دابنێت و یان پێشکەشی بکات. بە پێچەوانەوە، ئەگەر دەوڵەتێك بیەوێت دەوڵەتێکی رەواو مەشروع بێت، پێویستە بناغەکەی وەکو ئەو یاسایانە دابڕێژێت کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێیدا. ئەگەر بەو چەشنەش نەبێت ئەوە وەکو دەوڵەتێکی زۆردار و دیکتاتۆر لە قەڵەم دەدرێت. بەم پێیە کانت پێیوایە ئەگەر دەوڵەتێك بیەوێت دەوڵەتێکی رەوا بێت ئەوە بۆی نییە بنەمای مافی مرۆڤ لەکەدار بکات. لەبەرئەوەی بناغەی مافی مرۆڤ مەرجی مانەوەی خودی دەوڵەت دەبێت. دەتوانین بڵێین کانت بەم چەشنە رێچکەی بەڵگە هێنانەوەی خۆی دەگۆڕێت: ئەوە دەوڵەت نییە کە دەبێت

ئازادیو مافی هاوڵاتی ڕەچاو بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئازادی و پاراستنی مافی تاك و گشت هاووڵاتیانە کە تاکە کۆڵەکەی ڕەوابوونی هەر چەشنە دەوڵەتێکی یاسایی پێکدەهێنێ. ئەم لۆژیکەی کانت، دەرئەنجامێکی بەرفراوانی بۆ هزری قۆناغی نویێ لێدەکەوێتەوە: ئازادی و مافی مرۆڤ، دەبنە پێودانگ و پارسەنگ بۆ هەڵسەنگاندنی ڕەوابوونی دەوڵەت، و ئەم بزاوتە هزرییە – لانی کەم لە چوارچێوەی دەسەلاتی تیۆرییە فەلسەفیەکانی مافی مرۆڤدا، ئێمە تاوەکو ئێستا پێش دەخات. لە سنووری فەلسەفەی مافی مرۆڤدا، تێڕامانی مرۆیی بە یارمەتی کانت دەبێتە پێوەرێکی یاسایی و بنەچەیی بۆ دامەزراندنی دەوڵەت، پێوەرێك کە بۆ ڕەوابوونی دەوڵەتیش ڕەچاو دەکرێت. کەوابوو زێدەڕەوی نییە ئەگەر بڵێین کانت باسە تیۆرییەکانی مافی مرۆڤ تا ئاستێك گەشە پێدەدات کە ئەمڕۆش لەلایەن زۆربەی بیرۆکە داڕێژەرانی مافی مرۆڤەوە، وەکو پێوەرێك چاوی لێدەکرێت.

لە تێڕامانەکانی کانتدا، ئازادی وەك مافێکی بنەڕەتی مرۆڤ، هەڵگری ئەم چەند خاڵەی خوارەوەیە:

1–مرۆڤ سەربەستە بە هەر ڕێگایەك خۆی پێی باشترە، بە شوێن بەختەوەریدا بڕوات. بەلاّم بە مەرجێك مافی ئازادی ئەو کەسانەی کە بە شوێن بەختەوەری خۆیاندان، لەکەدار نەکات. یان تەواوتر بڵێین مرۆڤ بۆی نییە ئەو یاسا گشتییە کە ئازادی تاك تاکی مرۆڤەکان لە خۆ دەگرێت، پێشێل بکات.

2–یەکسانی مرۆڤەکان ڕێسایەکی بنچینەییە و ئیمتیازە میراتی و کۆمەلایەتیەکان بۆ پاساودانەوەی نایەکسانی یاسایی، نەزۆك و بێ واتایە. بەم تێگەیشتنە، هەموو هاووڵاتیان سەربەخۆ لە پێگەی کۆمەلایەتی خۆیان، لە بەرانبەر یاسادا یەکسانن.

3–هەموو هاوڵاتیان لە ڕێگا مافی دەنگدانەوە، مافی بەشداریکردنیان لە کاروباری سیاسی و یاسادانانداا دەبێت.

لە کۆبەندی ئەم تێبینیانەدا، دەتوانین بڵێین، بیرۆکەی "پەیمانی دەوڵەتی" کە لە تێڕامانەکانی تۆماس هۆبزدا گەلاڵە کرابوو، لای کانت دەبێتە پێشمەرجی حاشا هەڵنەگری دەستووری یاسایی و مەدەنی. بەم پێیە، کانت دەڕواتە ریزی نەریتی ڕۆشنگەری لە بیرۆکەی پەیماندا. بەلاّم کانت زیاتر لە ڕێبوارانی هزری پێشووتر بۆی ئاشکرا دەبێت کە وێناکردنی پەیمانێکی دەوڵەتی، هەرگیز بە واتای واقعێکی مێژوویی نییە کە زەمانێك لە شوێنێك ڕووی دابێت یان پێویستە ڕووبدات. بۆ کانت، "پەیمانی دەوڵەتی" بە تەواوەتی یەك "ویستی ئەقڵی"یە کە کار کردی ڕێکخستنی هەیە. ئەم ویستە لەلایەك یاسادانەر بەوەوە پابەند دەکات کە یاساکان بە چەشنێك تۆمار بکات کە گوایا لە ویستی یەکگرتوویی هەموو خەڵکەوە سەرچاوەیان گرتووە. لەلایەکیترەوە، ئەم کار کردەی هەیە کە بەچەشنێك سەیری هاووڵاتی بکەن کە گوایا دەنگی ئەرێنی (پۆزەتیف) بە ئیرادەی یەکگرتوویی هەموو خەڵك داوە.

کەوابوو بە گوێرەی بۆچوونی کانت، پێویستە دەوڵەت هەمیشە شێوەیەك

هەڵسوکەوت بکات کە راستی و ڕەوابوونی، لەلایەن خەڵکەوە قەبوولّ بکرێت، و ئەگەر دەوڵەت بەم چەشنە جولآیەوە، ئیتر بوارێکی یاسایی بۆ دەربڕینی نارەزایەتی لە رێگای زۆرو توندوتیژی نامێنێتەوە. ئەرکی بەرەنگاری ئۆپۆزیسیون، لە چوارچێوەی "ئازادی پێنووس"دا سنوردار دەبێتەوە.

بە دەربڕینێکی دیکە، هەر هاولآتییەك دەتوانێت بۆچوونە رەخنەییەکانی خۆی ئاراستەی رای گشتی بکات، تاوەکو ئەوان لەسەر ڕاست و ناڕاست بوونی دادوەری بکەن. بەم پێیە، بۆمان دەردەکەویّ ئازادی دەربڕین و بیروبۆچوون لای کانت، خاوەن بەهایەکی سەرەکییە. گرنگترین دەزگای کۆنترۆڵی دەسەلآت لای کانت ویژدانێکی هۆشیار و زیندووی کۆمەلآیەتییە. بۆ کانت دواهەمین خاڵی هێزی ماف مرۆڤ، خواستی جیهانشارییە کە ئاکامی تێڕوانینی ئەوە بۆ مرۆڤ وەکو ئامانجێك لە خۆیدا. بەڕای کانت نابێت بابەتی ماف مرۆڤ بە پێوەندییە نێوخۆیەکانی ولآتێکەوە ببەستینەوە. چونکە ماف مرۆڤایەتی، مافێکە کە هەر مرۆڤێك بە هۆی مرۆڤبونەوە، پێی براوە.

"ویستی مرۆڤایەتی" لە روانگەی کانتەوە، هەموو تاکێکی مرۆیی دەگرێتەوە. بەم پێیە، کانت یەکەمین فەیلەسوفی رۆشنگەری ئەوروپایە کە شێلگیرانە داوای پێکهێنانی "کۆمەڵگای هاولآتی جێهانی" دەکات. کانت لە رێگای پێکهێنانی ئەم دامەزراوەدا، بە شوێن پێشگیری لەسەرهەڵدانی شەڕو کێشە سەربازی وماڵوێرانکەرەکانە.

کانت و پێویستی پێکهێنانی "یاسا نێونەتەوەییەکان" بۆ پابەندبوونی هەموو دەوڵەتان، وەبیر دەهێنێتەوە و پەسەندکردنی ئەم چەشنە یاسایانە لە خزمەت پێکهێنانی "کۆمارێکی جیهانی"دا دەبینێتەوە.

کانت پێی وایە ماف مرۆڤ جیهانگیرەو لە یەك جیاناکرێتەوە و بۆ گشت بنەماڵە گەورەکانی مرۆڤ خاوەن بەهاو گرنگییە. خراپ نییە وەبیر بهێنینەوە رێکخراوی "یەکیەتی نەتەوەکان"، کە لە مەودای سالآنی (1920–1946)، لە نێوان دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی سەرکەوتوو لە شەڕی یەکەمی جیهانی و سیانزە ولآتی بێلایەنی دیکەدا پێکهاتبوو، لەسەر بنەمای تێزەکەی کانت بنچینەکەی دارێژرابوو کە پاش کارەسات و ئەزموونە تاڵەکانی شەڕی دووهەمی جیهانی بوو بە "رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان".

**بەرەنجامگیری:**

مرۆڤی سەردەمی نویّ (سەرپشك لە رووی زەوی و دابراو لە پاڵپشتی ئاسمانی" چیدی نەیدەتوانی بۆ پاراستنی خۆی پشت بە چاوگەگەلی ترانسیندێس (متعال) و یان سروشتی ببەستێت. بە ناچار دەبوایە پشت بە خۆی ببەستێت. خودێکی عەقلآنی کە نەك تەنیا لە خۆی بەڵکو لە دیاردەکانی جیهان و کۆی بوونی یان هەموو بوونی بەشێوەیەکی تیۆری و پراکتیکی شی دەکردەوە، لە راستیشدا تەنیا دەیتوانی پشت بە خۆی ببەستێت. ئەمە باروودۆخێکی تازە، بەلآم لە هەمان کاتدا ناخۆش بوو کە تیایدا مرۆڤ تەنیا بە یارمەتی

عــەقڵی خــۆ بنیاتنــەر و مــۆدێرن، دەیتــوانی ڕەفتاری پراکتیکی و یاسایی و ڕەوشتی خۆی لە چوارچێوەی قازانجی کۆمەڵگا و بۆ پاراستنی خۆی دەستنیشان بکات. هەرە پێویست بوو کە وەڵامێك بۆ ئەم خواستەی مرۆڤی مودێرن، بۆ پاراستنی خۆی لەسەر بنەماگەلی ڕەوشتی و یاسایی پتەو بدرێتەوە. وەڵامێك کە لەسەر بنەمایەکی تۆکمەی یاسایی و ڕەوشتی دامەزرابێت. لەم ڕووەوە، عەقڵی مرۆیی تەنیا دەیتوانی پەسەندکەری یاسای خۆی بێت. یاسای زانینی خۆی و ژیان و هەڵسوکەوتی خۆی. بەم پێیە، مرۆڤ، یاسایەکی قبووڵ نەبوو کە لە ئاکامی ئیمان و باوەڕ بە سروش (وحی) سەری هەڵدابێت.

لەم پێناوەدایە کە فەلسەفەی ڕۆشنگەری بونیادە تیۆریەکانی ماف مرۆڤی لە سەردەمی نوێــدا دارشــت و پێــوەر و (شــاخص) پێناسەگەلێکی ڕوونی هێنایە گۆڕێ، فەلسەفەی ڕۆشــنگەری، عــەقڵی مرۆڤــی وەکــو تاکانــە هەڵسەنگێنەری ماف سروشتی زەق کردەوە و کۆتایی بە باڵادەستی تێزە ئوتوریتەگەرایانە لەم بوارەدا هێنا.

لەمــەودوا بــۆ دیــاریکردنی بەرژەوەنــدی مرۆڤــەکان، ئــیرادەی تاکەکــەس یــان خــود کۆمەڵێکی گچکەی نوخبەکان (بژاردەکان) بەس نەبوو. ئەوەی ڕۆژ بە دوای ڕۆژ متمانەی پەیدا دەکرد ئەقڵی هاووڵاتیانی هۆشیار بوو کە بە گوێرەی ڕێنوێنیەکانی ڕۆشنگەری کەڵکیان لە ئەقڵی خۆیان وەردەگرت، و بیرۆکەی ئازادی و یەکسانی هەموو مرۆڤەکانیان کرد بە دروشمی کاری خۆیان کە لەسەر بونیادی سێ کوچکەی ماف : ژیان، ئازادی و ماف خاوەنداریێتی پێکهاتبوو و بونیادگەلێکی پتەویان بۆ هزری ماف مرۆڤ دارشت.

بیرۆکەکانی سەروەری خەڵك و هەروەها لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە چاخی ڕۆشنگەریدا، بوون بە کۆڵەکەی سەرەکی و بنچینەیی هاووڵاتیان. بە هەوڵ و تێکۆشانی فکری و پشوو درێژی ڕۆحی بیرمەندانی ڕۆشنگەری بوو کە هزری ماف مرۆڤ گەیشتە دوا پەلی هەڵکشانی مەعنەوی خۆی.

**سەرچاوە:**

سایتی ایران امروز

پێنجشەممە 17/ازار/1384.

# سەرهەڵدان و جۆراوجۆریی ڕێبازە فیمینیستییەکان

لە فارسییەوە: شنۆ میهرپەروەر

فیمینیزم، ڕەوتێکە خشکەیی لە هەناوی هزرگەلی فەلسەفی و ئیدئولۆژیکی ڕۆژئاواوە سەری هەڵداوەو بە هێنانە گۆڕی ئایدیا و دروشمگەلی بەڕواڵەت مافخوازانە سەبارەت بە ژنان، توانی بە پەلە لە ئاست دونیادا بڵاوبێتەوە و وڵاتە ئیسلامییەکان دابگرێ. بەگوێرەی ئەو شارەزاییەی کە ڕۆژئاوا لە نەریتە قەومی، خێڵەکی و مەزهەبییەکانی وڵاتانی ئیسلامی و حەساسییەتی موسوڵمانەکان لە پێوەندی لەگەڵ ژن هەیبوو، دەستی دایە پڕۆپاگەندە لە ئاستێکی بەربڵاودا. هێندێك لە ڕەوتە ئیسلامییەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ڕەوتی فیمینیزم یەکێك لەو سەدان شمەکەیە کە ڕۆژئاوا بۆ مانەوەو بەردەوام بوونی خۆی لەلایەك و زیاد کردن و هەرمین بۆ پەیدا کردنی خۆی لەلایەکی دیکەوە، بیچمی خۆی گۆڕی و لە شێواز و مۆدیلێکی نوێ بەناوی فیمینیزمی ئیسلامییەوە هاتە وڵاتانی ئیسلامییەوە. فیمینیزم بزووتنەوەیەکە بۆ وەدیهێنانی داخوازییە قانوونییەکانی ژنان کە لە کۆتاییەکانی سەدەی 19ی زایینی و لە درێژەی ناڕەزایەتی دەربڕین لەمەڕ هیندێك لەو نابەرابەرییە کۆمەڵایەتییانە پێك هات و کەوتە تاوتوێ کردنی ئەو نابەرابەرییانە و ڕوانگەی جۆراوجۆریشی پێشنیار کرد، هەروەها بەهۆی بەستراوەیی ڕوانگەکان و بەریانە فیمینیستییەکان بۆ قوتابخانە فەلسەفی و سیاسییەکانی ڕۆژئاوا، لقگەلی جۆراوجۆر لە فیمینیزم بوونەوە کە هەرکام لە ڕوانگەیەکی تایبەت و جیاوازەوە دەڕواننە کێشە حقووقییەکانی ژنان کە گرینگترینیان: فیمینیستە ڕادیکاڵ، مارکسیست، سۆسیالیست، لیبراڵ، پاش مۆدێرن و ئیسلامییەکانن.

لەم وتارەدا هەوڵ دراوە باس لە هۆیەکانی سەرهەڵدان و جۆراوجۆریی قوتابخانە فیمینیستییەکان بکرێ و شێوەی لێکدانەوەیان لەسەر مەسەلە و گیروگرفتەکانی ژنان و ڕێکارە پێشنیار کراوەکانیان بۆ ناساندنی ئەم گرووپانە شی بکەینەوە. بۆ نموونە فیمینیستەکان هۆی ژێردەستەیی و زوڵم لە ژنان بۆ گۆڕانکارییە ئابوورییەکان بەتایبەتی بۆ

پاش ڕێنیسانس دەگەڕێننەوە و تەنیا ڕێگای ڕزگاریی ژنان لە ڕەدکردنەوەی سەرمایەداریدا دەبینن. لەحاڵێکدا کە ڕادیکاڵە فیمینیستەکان سروشتی توندوتیژانەی پیاو و پیاوسالاری بەهۆی کاری سەرەکیی زوڵم کردن لە ژنان و چارەسەریی مەسەلەکانی ژنان لە وەگەڕخستنی خەباتێکی سیاسیی ڕێکخراو دژی ئەم سیستمە بە پێویست دەزانن، بە بڕوای هەندێك لە فیمینیستە ئیسلامییەکان دەبێ ئیمانداری و هێزی ئایینی لێك جیا بکرێتەوە، هەندێکی دیکە ڕاشکاوانە باس لە نیزامی سکۆلار ناکەن، بەڵکوو خوازیاری خوێندنەوەیەك لە ئیسلام و بنەما ئایینەکانن کە بەپێی فەرهەنگی ڕۆژئاوابێ.

ئێستاش گەشتێکی ڕاگەیەنی لەو بوارەی کە فیمینیزم چیە؟ دەست پێ دەکەین و لە سەرچاوەی جۆراوجۆرەوەو دوای ئەم ڕەوتە خشکەییە دەکەوین.

**فیمینیزم چیە؟**

فیمینیزم، بزووتنەوەیەکی ڕێکخراوە بۆ دەست ڕاگەیشتن بە مافەکانی ژنان و ئیدئۆلۆژییەکە بۆ گۆڕینی کۆمەڵگا کە مەبەستەکەی تەنیا وەدیهاتنی بەرابەریی کۆمەڵایەتی ژنان نیە، بەڵکوو خەون بە لابردنی هەر چەشنە زوڵم و هەڵاواردن و جیاوازی دانانێکی ڕەگەزییەوە دەبینێ، هەموو ئەو مەیل و ڕێبازانە کە لەژێر چەتری بەربڵاوی ئەم بزووتنەوەیەدا کۆبوونەتەوە، لەسەر ئەو بروایەن کە ژنان لەگەڵ بێ عەداڵەتی و نابەرابەریدا بەرەوڕوون، بەڵام لە پێوەندی لەگەڵ هۆیەکانی زوڵم و ستەم و چەوسانەوە لەسەریان ڕاڤەی جۆراوجۆر پێشکەش دەکەن و هەر بەو پێیە ڕێکار و شێوازی جۆراوجۆر پێشنیار دەکەن.

یەکەمجار وشەی فیمینیزم (*Feminisme*) بە شێوەیەکی نیمچە شیکراوە و لە بابەتێکی پزیشکیدا بە زمانی فەرانسەویی، بۆ گەشەی ئەندامەکان و تایبەتمەندیی ڕەگەزیی نەخۆشەکان، بەتایبەتی بۆ پیاوێك بەکارهات کە وای بۆدەچوون لە ژن جەستەیی خۆیەوە ئازاری دەکێشا، پاشان ئەلێکساندێر دۆما نووسەری فەرانسەوی، ئەم وشەیەی لە نامیلکەیەکدا لەژێر ناوی "ژن و پیاو"دا سەبارەت بە ژنی مێردار و ئەو ژنانە بەکار برد کە بە ڕواڵەت پیاوانە هەڵسوکەوتیان دەکرد.

فمینیزم وەك زاراوەی سیاسی، لە ساڵی 1837ی زایینییەوە هاتە نێو فەرهەنگی فەڕانسە, هەرچەند ئەم وشەیە ڕواڵەتێکی گشتیی هەیەو تایبەتمەندییەکانی هەڵگری پێناسەو پێکهێنەری ڕێبازێکی تایبەتن، وشەیەکی ڕوون و ساکارە، بەڵام بە هەبوونی ئەم چەمکە گشتییە، لە هێماو نیشانەی بیرۆکەیەکی تایبەت بێبەشە. بۆ تێگەیشتن لە مانای تایبەتی ویستراو لە فیمینیزم، پاشگرگەلێك پێویستن. چونکە ئەم چەشنە پاشگرانەن کە جۆری پەرەسەندن، تایبەتمەندییەکان و مەبەستە دیاریکراوەکان دەستنیشان دەکاو بەم شێوەیە کە بۆ نموونە فیمینیستی ڕادیکاڵ لە فیمینیستی سۆسیالیست جیادەکاتەوە. لە باسە ئاکادیمیکەکاندا فیمینیزم بە مانا گشتییەکەی بریتییە لە هەر چەشنە داخوازییەکی قانونی و کۆمەڵایەتیی ژنان، بەڵام

ئـەوەی کـە ئـەمڕۆ وەك فیمینیـزم باسـی لێـوە دەکرێ، فیمینیزم بە مانای تایبەتییەکەیەتی کە بزووتنەوەیـــەکی بەتـــەواوی سیاســـی. ئیدئۆلۆژیکییـــە کـــە لـــە لایـــەن ناوەنـــدە تایبەتییەکانـــەوە پـــشتیوانیی لێـــدەکرێ. وا باشتریـشە بڵـێین پـێش ئـەوەی کـە قوتابخانـە ئیدۆلۆژییـــەکی ســـەربەخۆ بـــێ، بزاڤێکـــی کۆمەڵایەتییە بۆ وەدەستهێنانی مافەکانی ژنانی چەوســاوەی ئــەوروپاو ڕۆژئــاوا. لــە دەیــەی 1840ی زایینیـدا، بزووتنـەوەی مافـەکانی ژنـان لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانـدا سـەری هەڵـداو هـەوڵی دا پێگـەی ژن لـە کۆمـەڵگای ئـەمریکادا دیــاری بکــا کــە خوازیــاری لەبەرچــاوگرتنی بنــەماکانی ئــازادیو بەرامبــەری لــە پێوەنــدی لەگــەڵ ژنانــدا بــوو، پــێش لــە ســەرهەڵدانی بزوتنــەوەکانی داکۆکیکــەری مافــەکانی ژنــان، نووســەرانی ژن ســەبارەت بــە نابەرامبــەریو بــی عەداڵەتیــە کۆمەڵایەتییــەکان، گــەلێك بابــەتیان نوســـیبوو. لـــە راســـتیدا دەســـتپێکی ئـــەم بزووتنەوانـــەو سەرچـــاوەی ســـەرهەڵدانی بزووتنەوەی فیمینیزم، هەر ئەم نوسراوانە بوون کە بە پێکهێنـانی گۆڕانکارییـە کولتوورییـەکان، بواریـــان بـــۆ جموجـــوڵی ژنـــان لـــە پێنـــاو وەدەستهێنانی داخوازییەکانیاندا ڕەخساند.

بـۆ نموونـە دەتـوانین نـاوی خـاتوو" مێـری وێڵـــستن کرافـــت" نووســـەری دابینبـــوونی مافـەکانی ژنـانو "سـێمون دۆبـوار" نووسـەری کتێبی "ڕەگەزی دووهەم" بێنین. لە کۆبەندێکی گشتیی پێناسـەی فیمینیزمـدا دەتـوانین بڵـێین: گـەلێك بزووتنـەوەی چـالاکی بـواری مافـەکانی ژنـان، چ لـە جیهـانی ڕۆژئـاواداو چ لـە وڵاتـانی ئیـسلامی، لــە نارەزایــەتی بــە هێنــدێك لــە نابەرابەرییە کۆمەڵایەتییەکان پێکهاتن، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات بوونە ڕەوتگـەلێکی کولتووری کـە بـە پێـی بۆچـوونە ناسـراوە باوەڕییـەکان، کەوتنـە لێکدانـەوەی نابەرامبەرییـەکانی ژنـانو ئامانجە ژنانەکانیان. ئەمڕۆژە وشـەی فیمینیـزم بـە داکـۆکیکردن لـە مافـەکانی ژنـان لـە سـەر بنەمای ئامانجی بەرامبەری مانا دەکرێتەوە.

**هۆیەکانی سەرهەڵدانی فیمینیزم:**

فیمینیـــزم وەك ڕێبازێـــك کـــە هـــەوڵی پێشخستنی مافەکانی ژنان دەدا، پێویستیی بە خوێندنـــەوەی مێـــژوویی و کۆمەڵایـــەتی، فەرهـەنگیو مێـژووی ڕۆژئـاوا هەیـە کـە لـەم باسەی ئێمە ناگونجێن، بەڵام بۆ هەڵسەنگاندنی هۆیـەکانی سـەرهەڵدانی فیمینیـزم ناچـارین چـــەمکی ژنو مافـــەکانی لـــە ڕوانگـــەی مێژووییەوە بـە کـورتی بـاس بکـەین. لـە ڕۆمـی کۆنـدا، ژنـان مـافی کۆمەڵایـەتییان نـەبووو لـە میراتیش بێ بەش دەکران. ژن لە دوای مردنی مێردەکـــەی وەك کەلوپەلـــەکانی دیکـــە بـــۆ میراتگرەکـانی دەمایـەوە، ڕۆمییـەکان لەگـەڵ ئەوەی کە لە بواری یاساو مافەوە پێشکەوتنی زۆریان وەدەست هێنابوو، بەڵام بیروڕای گشتی ســـەبارەت بـــە ژنـــان لـــە توندوتیـــژیو سەختگیرییەوە نزیك بوو.

لە دێموکراسی ئاتێندا ژنان لەگەڵ کۆیلەو بەرەڵاکانـدا یەکـسان بـوونو مـافی دەنگـدانو خاوەنداریّتی ئابووریان نەبوو. بە هەرەسهێنانی ئیمپراتوورییەتی ڕۆم، فەزای کۆمەڵایەتی لە ژێر کاریگەریی کولتووری مەسیحییەتدا تا رادەیەك

لــەبار بــوو، لەگــەڵ ئــەوەی کــە ســەدەکانی نێوەڕاست قۆناغی حەسانەوەی ژنانی ئورروپای کـۆن بـوو، بـەڵام سـەدەکانی شـەش و حـەوتی زایینـی کـە هاوکـات بـوو لەگـەڵ پەرەسـەندنی بیروبـاوەڕی مەسـیحییەت بـە چـاوی ڕێـزەوە دەیڕوانیە ژن، بە شێوەیەك کە توانی بۆچوونی دواکەوتوانەی پێش مەسیحییەت سەبارەت بە ژن بگـۆڕێ. چونکە ئـەم ئاییـنە لەسـەر بناغـەی ژنێــك بــە نــاوی مەریــەم (د.خ) پێکهێنــرا، لەسەدەکانی دەیەم و یازدەهەمی زایینیدا، ژنان هێـدی هێـدی هاتنـە نێـو کاروبـاری سیاسـی، حکوومەتی و قەزاییەکانەوە. ئەم قۆناغە هاوکات بوو لەگەڵ هاتن و بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە ئەورووپادا، کە چوونەسەری ڕێزی مافەکانی ژنان و مافە ماددی و مەعنەوییەکان و فەرهـەنگی ئـەورووپایی لەگـەڵ خـۆی هێنـا. لەسـەدەکانی سـێزدەهەم و چـواردەهەمی زایینیـدا پێکهاتـەی کۆمەڵایــەتی و ئــابووریی ئــەورووپا گــۆڕانی بەسـەردا هات کە بووە هـۆی بەرتەسکردنەوەی مافەکانی ژنـان و هاتنە خواری ڕێـزو حورمـەتی ژنـی ئـەورووپایی لێکەوتـەوە، زۆرتـرین قۆنـاغی هێــرش بــۆ ســەر ڕێــزو کەرامــەتی ژن و مافــە مـاددی و مەعنەوییـەکانی لـە ڕۆژئـاوا لـە دوای ڕێنیــسانس بــوو، قۆناغێــك کــە بــە مردنــی شارسـتانییەتی ژن نـاوی لێ دەبـرێ. لووتکـەی ئــەم هێرشــانە لــە ســەدەکانی یازدەهــەم و شـازدەهەمی زایینیـدا بـوو، لـەم قۆنـاغـە ژنـانی داهێنــەر لــە مەیــدانی زانــست و هونــەرو ئەدەبیاتدا، ناچارن شوێنەوارو بەرهەمـەکانیان بـە نـاوی پیاوانــەوە ئیمــزا بکــەن. بـۆ وێنــە دۆزینەوە گرینگەکانی "تێکۆبراهە" لە بواری بە ئەستێرەناسیدا بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوونە زانستییەکانی خوشکەکەی بوو.

لەسەدەکانی هەڤدە و هەژدەی زایینیدا کە هاوکات لەگەڵ خێراتربوونی سێکولاریزاسیون لـە ئـەخلاق و فەرهـەنگ، ئـاڵوێری کۆیلـەکان و هــــەژاربوونی بەشــــێك لــــە مرۆڤایــــەتی و کۆکردنــەوەی سـامان، حورمــەتی مــرۆڤ لــە ئــەورووپا، بــە ڕێــژەی بەرهــەمهێنانی کــاڵا و پاشـکەوتە ماددییـەکانی هاتـە خـوارەوە، لـەم نێـوەدا، بـارودۆخی ژنــان لــە چـاو پیــاوان دژوارتــرو خــراپتر بــوو، ژنــی ڕۆژئــاواییش فیمینیزمـی بـە تاکـە پـشتیوانیی قـانوونی و ڕێزوحورمەتی لە دەست چوونی خـۆی دادەنا، ڕەخنـە لـە یاسـا ناعادڵانـە و نادادپەروانـەکان، پێکهاتـەی دەسـەڵات، فەرهـەنگ، بایەخـەکان و دابونەریتـە پیاوسـالارەکانی کۆمـەڵگا دەزانـێ. دەتوانێ ڕەوتی مێژوویی سەرهەڵدانی فیمینیزم بە دووبەشی سەرەکیی ناودێر بە شەپۆلە دوو لایەنەکان پۆلێن بەندی بکەی. شەپۆلی یەکەمی فیمینیــزم تیــشك دەخاتــە ســەر بزووتنــەوە فیمینیــستەکانی کۆتــایی ســەدەی نــۆزدە و سـەرەتای سـەدەی بیستەمی زایینـی. تـەوەری چالاکییەکانیان وەدەستهێنانی مـافی یەکسان بۆ ژنان و بە تایبەت مافی دەنگدان بوو، شەپۆلی دووەم لـە کۆتاییـەکانی دەیـەی 60 و تـەواوی دەیــەی 70ی ســەدەی بیــستەمی زایینــی، نارەزایەتییــەکی ســەرلەنوێیە دژی نــەبوونی یەکسانی ژنان.

ئەم دوو شەپۆلە فیمینیستییە پێیان وایە کە بیاڤگەلێکن کە هـەڵگری بیروباوەڕەکـان، مێـژوو هەنگاوگەلی تایبەتی خۆیانن. بەڵام لە کردەوەدا

لـه نێـوان ئـەم بیروبـاوەڕو کردەوانـەدا هـیچ یەکگرتنێك بەدی ناکرێ.

لــــەبواری هۆیــــەکانی ســـــەرهەڵدانی جۆراوجــۆریی ڕێبـــازە فیمینیــستییەکانەوە، بەتایبــەت لـــە هەلومەرجێکـــدا کـــە ئـــەوان خەباتی خۆیان لە پێناو ئازادی و ڕزگاری ژن لە ستەمو چەوسانەوەی پیـاوان تـەرخان کـردوە، دەبێ بڵێین هەرکام لەو بیروباوەڕ و قوتابخانانە بەپێی هەلومەرجی سەرهەڵدان و ئاستی توانای خۆیان، لە چوارچێوەی قوتابخانەیەکی تایبەتدا ڕەنـگ و بـۆن و کـەش و هـەوای ئـەو قوتابخانـە هـــزری _ فەلـــسەفییەیان وەرگرتـــوە و ئـــەم هەمەکییـە گشتییە جێی متمانەیـە، بە گوێرەی زەمینەی گەشەی خۆی کەوتۆتە ژێر کاریگـەریی هۆکـار و فاکتورگـەلی دەوروبەرەکـەی. بـە وتـەی "دریـــك ویلفـــورد" باشـــترە لـــەجێی زاراوەی فیمینیـست، لـە زاراوەی فیمینیـستەکان کـەڵك وەربگیردرێ، چونکە لایەنگرانی فیمینیستی بە ڕادەیــەك زۆرن کــە نــاتوانرێ لــە چــەمکێکدا کۆبکرێنەوە.

لەو سۆنگەیەوە کە فیمینیستیەکان بـەپێی پرنـسیپەکانی قوتابخانـە هـزری- فەلـسەفی و سیاسییەکان ڕوانگەکانی خۆیان پەرەپێدەدەن و هۆیـەکانی ژێردەسـتەیی ژنـان ڕاڤـە دەکـەن و لێکیان دەدەنەوە، دەبێ هۆیـەکانی سەرهەڵدانی و جۆراوجــۆریی ڕوانگــە فیمینیــستەکان لـــە بەســـتراوەیی بزووتنـــەوەکانی داکۆکیکـــاری مافـەکانی ژنـان، بـەم قوتابخانەیـەوە بـزانین. لەلایــەکی دیکــەوە بــوون و ســەرهەڵدانی ئــەم قوتابخانــە جۆراوجــۆرە فیمینیــستانە ئــەوە دەردەخـا کـە فیمینیـزم بەتـەنیایی قوتابخانـەو ئیدئۆلۆژییـەکی سـەربەخۆ نیـە، بـەڵکوو تـەنیا ڕەوتێکــی مێــژوویی و کۆمەڵایەتییــە. هـــەموو فیمینیستەکان لەسەر ئەو بڕوایەن کە ڕەگـەزی ژن بـــەردەوام لەلایـــەن پیاوانـــەوە کەوتۆتـــە دووچـاوەگی و هـەڵاواردن، بـە شـێوەیەك کـە تانوپۆی فەرهەنگ و مێژووی خەڵکی لە زۆربەی هەرەزۆری ناوچەکانی جیهاندا چوەتە خوارێ، زۆرێـك لـە هەڵـسوکەوت و دابونـەریتی خـەڵکی خستۆتە ژێـر بانـدۆری خۆیـەوە بەچەشنێك کە ژێــر چــەپۆکی ژنــان بــە هــەموو لایەنــەکانی فەرهــەنگی نەتــەوە جۆراوجۆرەکــانی دنیــاوە دیـارە. ئەمـە ئـەو ئاسـتەنگە هەمەکییەیـە کـە ســــەرجەم ڕێبــــازە فیمینیــــستییەکان، چارەســەرکردنی بـە ئـەرکی سەرشـانی خۆیـان دەزانـن، بـەڵام لـە قۆنـاغی پێـشکەش کردنـی گەڵاڵـەو بەرنامە بۆ چارەسەریی ئەم گیروگرفتە تووشـــی ناکۆکیگـــەلی بەرچـــاو هـــاتوون، بـــە شێوەیەك کە هیچ پێناسەیەکی یەکگرتوویان لە فیمینیـزم نیـە. خـاتوو "ڕۆژە کـاوز" یـەکێك لـە فیمینیستە بەناوبانگەکان لەم بارەوە دەڵێ: "من بۆخۆشم ئێستاکەش تێنەگەیشتم کە فیمینیـزم چیە؟ دەکرێ بڵێین، هیچ پێناسەیەکی سەرەکیی بیرۆکـەی فمینیزممـان لـە دنیـای ڕۆژئـاوادا نیـە. مەگــەر تــەنیا لــەو ڕادەیــەی کــە ژن بــەهۆی پێناســـەی ڕەگەزییـــەوە لـــە دنیـــادا، تووشـــی هـــــەڵاواردن هـــــاتوەو بـــــەردەوام بـــــەهۆی ڕەگەزەکەیـەوە چ لـە ڕووی پێداویـستیی ژنانـە و بە گشتی ئینسانییەکانەوە خراوەتە پشتگوێ و تا ئـەم ئاسـتەش دەتـوانن ڕێککـەون، بـەڵام ئـەم ڕادەیـەش زۆر نـاڕوون و گـشتییەو پـاش ئـەوە، هـــەموو شـــتێك لـــەبواری فیمینیزمـــدا ئـــاڵۆز و

پڕکێشە دەبێ. بە ئاوڕدانەوە لە نێوەرۆکی مەیلو لایەنگریی فیمینیستەکان، دەتوانین لەوە تێبگەین کە تێکڕایان بە شێوەیەك بڕوایان بە ئامانجی بەرابەریو یەکسانی هەیە.

خاتوو "نەییرەی تەوحیدی" نووسەری "فیمینیزم، دیموکراسی و ئیسلامخوازی" باوەڕی وایە کە دەکرێ چەند خاڵێکی هاوبەش بدۆزینەوە کە جێگای ڕەزامەندیو پەسەندی هەموان بن. بۆیە پێناسەی ناوبراو لە فیمینیزم بەم شێوەیەیە: بڕوا بە یەکسانیو بەرابەریی مافەکان، دەرەتانەکان، پێداویستیو پێگەی کۆمەڵایەتیی ژن و پیاو و هەوڵدان بۆ لەنێوبردنی دەسەڵاتخوازی ڕەگەزیو پیاوسالاریو کۆتایی هێنان بە ستەم، هەڵاواردن و جیاوازیدانان دژی ژنان. کەوابوو ئەوەی کە هەموو فیمینیستەکان بڕوایان پێیە و خاڵی هاوبەشیان لە دوو مەسەلەدا کورت دەکرێتەوە: یەکەم ئەوەیە کە ژنان بەهۆی ڕەگەزییەوە تووشی هەڵاواردن و جیاوازیدانان هاتون، دووەمیش ئەوەیە کە جیاوازیو هەڵاواردن دەبێ لابچێ کە مەرجی ئەمەش چاکسازییە لە سیستمە ئابووری، کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان. لە هەمان کاتیشدا هەموو فیمینیستەکان، لە دوو مەسەلەی بنەڕەتیدا پێکەوە هاوڕا نین کە ئەم جیاوازیو ناکۆکییانەش بونەتە هۆی پێکهاتنی گرووپ و دەستەی جۆراوجۆری فیمینیستی.

ئا): هۆکارگەلی ژێردەستەیی ژنان

ب): ڕێگاچارەی چاکسازی لە بارودۆخی ژناندا

## ڕێبازە فیمینیستییەکان

### 1ـ فیمینیزمی لیبڕاڵ:

ئەم قوتابخانەیە لەو باوەڕەدایە، کە بۆ وەدیهێنانی مافەکانی ژنان، دەبێ لە چوارچێوەی حکوومەتە لیبڕاڵەکاندا خەبات بکرێ. بەپێی ئەم ڕوانگەیە، دەسەڵاتی ئەم چەشنە حکومەتانە دەسەڵاتێکی ڕەوایە، بەڵام ئەو مافو ئیمتیازانەی کە پێشکەشیان دەکا دەبێ هەموو ژنان بگرێتەوە، لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە لەسەر ئەو بڕوایەن کە ئەوە ڕۆڵە ڕەگەزییەکان ئەو قەزاوەتە بەروەختە پڕ لە جیاوازییەو ئەو ڕوانگە جۆراوجۆرە لەمەڕ جیاوازییە سروشتییەکان، ڕەگەزو پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان چارەنووسی جۆراوجۆر بۆ ژنو پیاویان لێدەکەوێتەوە. جا بۆیە، لیبڕاڵەکان دژی ڕۆڵە نەگۆڕەکان لە بنەماڵەو کۆمەڵگادان. لیبڕاڵەکان، گرنگییان بە ئازادیو کردەوەو چێژ وەرگرتنی خۆتەوەرانەی تاکەکان داوەو سەبارەت بە ڕۆڵی دایکایەتیو هاوسەری لە بنەماڵە نەریتییەکاندا، لەو ڕووەوە کە مەیلو ئارەزووەکانی تاکەکانی بنەماڵە بەرتەسك دەکاتەوە، ڕەش بینن. بە بڕوای ئەوان بە چاکسازیی یاساکانو پێکهاتەی سیاسیو کۆمەڵایەتی، دەتوانرێ بنەمای کۆمەڵگایەکی دادپەروەرانە دابنرێ، ئامانجی ئەوان وەدیهاتنی کۆمەڵگایەکی دوو ڕەگەزییە. کۆمەڵگایەك کە ئەندامەکانی لە باری ڕەگەزەوە نێر یان مێن. بەڵام تایبەتمەندییە ژنانەو پیاوانەکان، بە شێوەیەکی زەقو بەرچاو دەرناکەون. ئەوان لەسەر ئەو بڕوایەن لە ڕێگای

گۆڕینی یاساکان و پێکهێنانی دەرەتانگەلێکی زیاتری پەروەردەیی و ئابووری و تێکەڵبوونی ژنان بە کاروباری کۆمەڵایەتی، دەتوانرێ ئەم ئامانجە وەدی بهێنرێن.

**2- فیمینیزمی مارکسیستی:**

تەوەری سەرەکیی سەرەنجی مارکسیست. فیمینیستەکان، گرینگیدان بە رۆڵی ناکۆکییە چینایەتی و گۆڕانکاری کەرەستەی بەرهەمهێنان لە گۆڕانی پێکهێنانی گۆڕانکارییە فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەکانە.

فیمینیزم بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوونی ژنانێکە کە مارکسیسمیان پەرە پێداوە، تا بتوانن روونکردنەوەیەکی باشیان بۆ ژێردەستەیی و کەڵك وەرگرتن لە ژنانیان لە کۆمەڵگا سەرمایەدارەکاندا پێ بێ.

بە بڕوای مارکس، لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتیدا، بنەماڵە وەك چوارچێوە و پێکهاتەی بنەماڵەیی ئێستا نەبوو، خەڵك بە شێوەی تۆڕی گەورەی خزمایەتی پێکەوە بوون و لێك گرێ درابوون. بە سەرهەڵدانی خاوەنداریێتیی تایبەت و هاتنە ئارای ئابووری و شوانکاری و گاوانی، شکستی مێژوویی رەگەزی ژن، دەستی پێکرد، پیاوان ئیدیعای خاوەنداریێتیی کەرەستەی بەرهەمهێنانیان دەکرد و دابینکردنی هێزی کار وای لێکردن کە هاوسەر و منداڵەکانیان بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە.

روانگە مارکسیستییەکان، پێڕەویکردنی ژن لە پیاو بۆ مەسەلە ئابوورییەکان دەگەڕێنێتەوە. لە دوای مارکس، ئێنگلس دەستی دایە نوێگەری لە ئیدئۆلۆژی و روانگەکانی قوتابخانەی مارکسیزم تا بیرۆکەیەك گەڵاڵە بکا کە داکۆکی لە مافی ژنان بکا. لە روانگەی گشتیی مارکس و ئێنگلسدا جیاوازییەکی ئەوتۆ نابیندرێ، بە بڕوای ئەوان، بنەماڵە یەکەمین سازیی دامەزراوەی کۆمەڵایەتییە کە بە شێوەیەکی نادادپەروەرانە کاری تێدا دابەش بووە، و دەبێ لە نێو بچێ. مارکس دەڵێ: "بنەماڵە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی سیستمی سەرمایەداری و بە شێوەیەکی روونتر لەبەر خواستی پیاوان بۆ دەستاو دەستکرنی میرات بۆ میراتگرانی راستەقینە پێك هات".

بەپێی بۆچوونی فیمینیست مارکسیستەکان، گۆڕانکارییە ئابوورییەکان سەرچاوەی ژێردەستەیی ژنان و شۆڕشی پیشەسازی و رەتکردنەوەی سەرمایەداری، رێگای رزگاربوونی ژنان لەبارودۆخی ئێستایە.

**3- فیمینیزمی رادیکاڵ:**

لایەنگرانی ئەم بزووتنەوەیە لەسەر ئەو باوەڕەن کە هیچ دامەزراوەیەك نیە کە پیاوان دەستی تێوەرنەدەن و خۆیان تێهەڵنەقوڵتێنن، بۆیە هەر لایەنێکی ژیانی ژنان کە ئێستا بە ئاسایی دەژمێردرێ، دەبێ بە شك و گومانەوە لێی بڕوانین و وەدوای دۆزینەوەی رێگایەکی نوێ بۆ وەگەڕخستنی کاروبارەکان بین. کاکڵەی بیروباوەڕی فیمینیزمی رادیکاڵ، ئەوەیە کە نابەرامبەرییە رەگەزییەکان، بەرهەمی سیستمێکی دەسەڵاتداریێتیی و پیاوسالارین و لە گرنگترین شێوەکانی نایەکسانیی کۆمەڵایەتین.

"سیمون دۆبوار" لە کەسایەتییە رادیکاڵە بەناوبانگەکان دەڵێ: هیچ مرۆڤێك بە ژنی یا پیاوی لەدایك نابێ، بەڵکوو بە درێژایی ژیان شوناسی ژنانە یان پیاوانە بوون، وەردەگرێ. تەنیا جیاوازییە فیزیۆلۆژیکەکان ژن و پیاو لە بواری بیۆلۆژییانەوە جیا دەکەنەوەو جیاوازییە زەینی و رۆحییەکان و ناکۆکییەکان لە روانین و لێهاتووییەکان، بە گشتی بەرهەمی پێوەندییە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکانن. بەم پێیەو بەو هۆیەی کە سروشتی نەگۆڕی مرۆڤایەتی وجوودی نیە، دابەشکردنی ئەرکەکان بە ژنانەو پیاوانە هەڵەیە. رادیکاڵ فیمینیستەکان، هۆی ژێردەستەیی ژنان بۆ سروشتی توندوتیژانەی پیاو دەگەڕێننەوەو لەسەر ئەو بڕوایەن کە پیاوان، لەم تایبەتمەندییەی خۆیان بۆ کۆنترۆڵی ژنان کەڵك وەردەگرن.

"مێری دیلی" راپۆرتێکی بەڵگەنامەیی لەو کارەساتانە کە پیاوان لەو زەبروزەنگە بۆ کۆنترۆڵی ژنان کەڵکیان وەرگرتووە، دەخاتە بەرچاو.

ناوبراو بە تیشك خستنەسەر نەریتی "سوتی" لە هێند (ژن لەگەڵ تەرمی مێردەکەی دەسووتێندرێ)، لە چوارچێوەگرتنی لاقی کچە ساواکان لە چین، خەتەنەکردنی کچان لە هێندێك لە وڵاتانی ئافریقایی و... ئازارو ئەزییەتی ژنان لە لایەن پیاوان و هەروەها کەڵکوەرگرتن لە پاڵهێزی توندو تیژی بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەوان لەو نموونانەن کە "مێری دیلی" ناویان دەبا. ئەم گرووپە فیمینیستیە لەسەر ئەو باوەڕەیە کە نایەکسانی و نابەرامبەریی ژنان بنج و بناوانی قووڵی لە نێو فەرهەنگ و کەلتوورو زەینەکاندا هەیەو جا بۆیە شۆڕش لە قانوونەکاندا بەبێ لەنێوبردنی ریشەی فەرهەنگی، نابێتە مایەی لاچوونی نابەرامبەری و تەنیا مەرهەمێکە بۆ برینە قووڵەکانی رەگەزی مێ. ئەمان ژنان هان دەدەن شوناسێکی نوێ بۆ خۆیان بخەنەروو کە لەسەر بنەمای ژنانەیی راستەقینەی ئەوان پێکهاتبێ و بانگهێشت دەکەن، کە بۆ شێوازێکی نوێ لە داهێنان و خوڵقاندن کە پشت بە خوشکایەتی و شوناسی خۆیان ببەستن. ئەوان دوو رەگەزێتی رەت دەکەنەوە، چونکە لەسەر ئەو باوەڕەن پڕ بایەخترین تایبەتمەندی و خەسڵەتەکان ئەوانەن کە تایبەت بە ژنانن. لە روانگەی ئەوانەوە ژنان دەبێ جیا لە پیاوان بژین چونکە تەنانەت لە ئەوپەڕی پێوەندییە خۆشەویستییەکانی نێوان ژن و پیاودا، دەسەڵاتی پیاو حاکمە. هێزی نێرینە لە رێگای بەردەوامی بە دامەزراوەکانی بەخێوکردنی منداڵ، کاری ماڵەوە، عیشق و ژیانی هاوبەش و کاری جینسی، قورس و قایم و پتەو دەبێ. "شولامیت فایرستۆن" هۆی ژێردەستەیی ژنان بە درێژایی مێژوو بۆ مەسەلەی بیۆلۆژیکیی ژنان، بارودۆخی تایبەتی زاوزێ، سووڕی مانگانەی ژنان و بەخێوکردنی منداڵ و...دەگەڕێنێتەوە. بەڵام دەڵێ: تەکنۆلۆژیی نوێ، رێخۆشکردن بۆ منداڵبوون بەبێ تێکەڵبوونی جەستەیی، پەروەردەکردنی ئاوڵەمە"جنین" لە دەرەوەی منداڵدان و گەورەکردنی منداڵ لە دەرەوەی بنەماڵە، دەست و باڵی ژنان ئاوەڵا دەکا، لەم پرۆسەیەشدا بنەماڵە وەك یەکەیەك بۆ زاوزێ و ئابووری لە نێودەچێ و کۆمەڵگایەکی بە بێ

دیاریکردنی ڕەگەز دروست دەبێ، بەڵام زۆرێك لەوان پێ زیاتر لە بەرەی خۆیان رادەكێشن و تایبەتمەندییە بایەخدارەكان تایبەت بە ژنان دەزانن. هەر بۆیە ئامانجی ئینسانیی ئەوان ئامانجی ژنانە. بەڵام نە ئەو ژنەی كە لە ژێر دەسەڵاتی سیستمی باوك سالاریدا بێ. رادیكاڵەكان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە تەنیا شۆڕشی ڕەگەزی مێینە دژی ڕەگەزی نێرینە، بە كاریگەر دەزانن. لەم پێوەندییەدا خەباتی سیاسیی رێكخراو دژی ڕەگەزی نێرینە چ لە چوارچێوەی گشتی (كۆمەڵگا) و چ لە چوارچێوەی تایبەتی (بنەماڵە) بە پێویست دەزانێ. هەر بۆیە لەسەر ئەو بڕوایەن كە بەردەوام لە لایەن پیاوانەوە حاشا لە فەرهەنگ، زانست و تێگەیشتنی ژنان، حاشای لێكراوەو زانستی پیاوانە بۆ برەوپێدان بەو ئیدئۆلۆژییانەی كە ژن بچكۆلە دەكەنەوەو بەوە دەیناسێنن كە كاری ماڵەوە دەكا، بە كار براوە.

**4ـ فیمینیزمی سۆسیالیستی:**

ئەم ڕێبازە تێكەڵاوێكە لە دوو ڕێبازی فیمینیزمی ماركسیستیو رادیكاڵ كە لەسەر ئەو بڕوایەیە هەم سیستمی ڕەگەزیەتی باوك سالاریو هەم سیستمی سەرمایەداریش لە چەوساندنەوەو زوڵم كردن لە ژنان ڕۆڵیان هەیە. ئەوان هۆی ستەم لەسەر ژن بۆ ڕەگەز، نەژاد، تەمەنو نەتەوە دەگەڕێنێتەوەو نەبوونی ئازادیی ژنانیش بە بەرهەمی ئەو كۆنترۆڵو چاودێرییانەی دەزانن كە دەسەڵاتە گشتیو تایبەتییەكان لەسەریان بەڕێوەیان دەبەن.

بە بڕوای ئەم گرووپە، لە هەموو كۆمەڵگاكاندا، ڕەگەزی نێر بەسەر ڕەگەزی مێدا پێوەندییەكی باندەستانەی هەیە، بەڵام ئەم پێوەندییە لە سیستمی سەرمایەداریدا وەك سەرمایەداریی باوك سالارانەی لێ هاتوە كە قووڵایی زوڵمو چەوساندنەوە پیشانی ژنان دەدا. ئەوان بۆ ڕزگاریی ڕەگەزی ژن، داوای باشبوونی سیستمی ئابووریی كۆمەڵگاو دەسەڵاتی سوسیالیزمو هەروەها چاكسازی لە چوارچێوەی فەرهەنگیو هەڵسەنگاندنی دەروونیو ڕۆحیی كۆمەڵگاو لابردنی دابەشبوونی كاری ڕەگەزی لە هەموو ئەو شوێنانەی كە دەسەڵاتیان بەسەردا دەكرێ، دەكەن. كەوابوو دەتوانرێ بگوترێ فمینیستی سۆسیالیستی، سیستمی ئابووریو دەسەڵاتی باوك سالارانە، بە هۆی سەرەكیی ژێردەستەیی ژنان ناو دەباو خەباتی چینایەتیو ڕەگەزی بە ڕێگاچارەسەری كێشەی ژنان دەزانێ.

**5ـ فیمینیزمی پۆست مۆدێرن:**

لە كۆتاییەكانی دەیەی 70ی زایینیدا، دەستەیەك لە فیمینیستەكان سەرقاڵی داكۆكیكردن لە بنەماڵە، ڕۆڵی دایكو جیاوازییە سروشتییەكانی ژنو پیاو بوون،و دانیان بە چاككردنی ڕوانگەكانی پێشووی خۆیاندا نا، ئەوان لەم بوارەدا كتێبو وتاری جۆراوجۆریان نووسی كە ڕەنگو بۆنی پەژیوانیو گۆڕان لە ڕوانگە فیمینیستییەكانیاندا پێوە دیار بوو. ئەو فیمینیستانەی كە پێشتر بنەماڵەیان بە زیندانێك بۆ ژنان بە حیسێب دەهێنا، ماڵیان بە كاناڵێكی پێوەندی كە ژنان دەتوانن لەو

کانالەوە خواستو پێداویستییە سۆزدارانەو روحییەکانیان دابین بکەن، ناوبرد.

"ئاشتین" لە کتێبی (پیاوی گشتیو ژنی تایبەتی)، هێرشی کردۆتە سەر ئەو رادیکاڵ فیمینیستانەی لە هەوڵی سیاسی کردنی ژیانی تایبەتو داکۆکی لە تەوەری ژیانی تایبەتیو بنەماڵەو منداڵو دایکایەتی وەك ئەرکێکی پڕبایەخو چەند لایەنەو گرانو شادی هێنەر ناوبردوە.

ڕێژەخوازیی لقێکی سەرەکیی روانگەی پۆست مۆدێرنەکانە. لە روانگەی پۆست مۆدێرنەکانەوە هەموو قوتابخانەیەکی هزری کە داوای تێگەیشتنی راستییەکان لە شێوەیەکی گشتیدا دەکا، هەم سەرت لێدەشێوێنێو هەم فریوت دەدا. ئەوان پێیان وایە هەر قوتابخانەیەکی هزری کە میتۆدی ژنان بۆ تێگەیشتن لە خۆیان کە باوەڕی بە تێگەیشتنی یەك لایەنە لە کێشەکان هەبێ، هەم سەرلێشێوێنەو هەم خاپێنەر. ئەوان تێکۆشان بۆ دامەزراندنی هەرچەشنە قوتابخانەیەکی فیمینیستیی تایبەت رەت دەکەنەوە. ئەوانە ئەو هۆیانەن کە کاریگەرییان لە سەر یەك هەیە. بۆ نموونە: تەمەن، بالا، چین، رەگەزو فەرهەنگ کە هیچ هەوڵێك بۆ کۆکردنەوەی ئەم هۆیانە لە چوارچێوەی ئیدئۆلۆژییەکی یەکگرتوو ئیمکانی نیە. لەم روانگەیەوە هەر فەرهەنگێك بۆ زاڵبوون بەسەر گیروگرفتەکانی کۆمەڵگای خۆی، وەڵامی خۆجێی هەیە، کە دەبێ تەنیا لە چوارچێوەی ئەو فەرهەنگەدا چارەسەر بکرێن، بۆیە ژنان دەبێ لە هەلومەرجو ناوچەی جۆراوجۆردا، لە بەرامبەر باوکسالاریدا رابوەستن. هێندێك لە روونـاکبیرانی ئەم گرووپە پێداگری لە سەر پاراستنی تایبەتمەندییەکانی ژنان دەکەنو لەسەر ئەو بڕوایەن کە ژن پێویستی بە بنەماڵەو بەهرەمەندبوون لە نیعمەتی منداڵ هەیە. پۆست مۆدێرنیزم هۆی ژێردەستەیی ژنان بۆ بوونی ئەو هەڵسوکەوتانە دەگەڕێنێتەوە کە لە سەرەتای لەدایك بوونەوە لە نێوان کچو کوڕ رەچاو دەکرێن، لەم رووەوە، کۆمەڵگای مافخواز بە کۆمەڵگایەکی دوورەگەزی کە یەکسانیی مافەکانی ژنو پیاوی تێدا دابین کرابن، ناودەبا.

**6-فیمینیزمی ئیسلامی:**

لە کۆتاییەکانی سەدەی 19ی زایینیەوە، فیمینیستە رۆژئاواییەکان لە رێگەی بەرهەمەکانی نووسەرانی موسڵمانی شارەزا بە کولتووری رۆژئاواوە چوونە وڵاتە ئیسلامییەکان. لەوانەیە وڵاتی میسر یەکەمین وڵاتی ئیسلامی بێ کە هزرە فیمینیستییەکان رێیان تێکەوتبێ. لە گرنگترین ئاسەواری خوێندنەوەی ژنی ئەم قۆناغە دەتوانین ئیشارە بە کتێبی "المرأة الجدیدة" لە نووسینی قاسم ئەمین بکەین. ئەو لە هەوڵی ئەوەدابوو کە بەپێی روانگەیەکی نوێخوازانە بکەوێتە لێکدانەوەو گرنگیدان بە دەقە ئایینیەکان. کارێك کە ئەمڕۆ زۆربەی فیمینیستە ئیسلامییەکان پێوەی سەرقاڵن. واتە بەشێکی گرینگ لە هەوڵی خۆیان بۆ خەبات لە نێوخۆی ئایین تەرخان کردوەو روانینی ژنانەیان بۆ دەسەڵات هەیە. فیمینیزمی ئیسلامی لە سەرەتادا، نووسەرانی گرنگیی بە تەندروستیی ژنانو پاشان وەك مافی ژنانیان هێنایە گۆڕێ.

دیاردەی فیمینیزمی ئیسلامی کە بۆخۆی خاوەنی بنەماگەلی تیۆرێکی تایبەتەو لە سەر بنەمای جیهانبینییەکی پێناسەکراو خەریکی هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی ئایین و بنەما ئایینیەکانەو بە دوو هۆ فورمی وەرگرت.

ئەلف: پێکهاتەی ئایینی و مەزهەبیی کۆمەڵگا کە روانینێکی تایبەتی سەبارەت بە ژن هەیە:

ب: سیستەمی حکومەتی ئایینی کەبەپێی ئەو، مافە ئیسلامییەکانی وەك مافە جەزایی، مەدەنی و، سیاسییەکان پراکتیزە دەکرێن، کە پیادەکردنی ئەم مافانە لە سیستەمی کۆمەلایەتییدا ئاڵۆزییەکی لە نێو روانگەی سوننەتی و نوێ سەبارەت بە مەسەلەکانی ژنان پێك هێناوە. دەتوانرێ بگوترێ کە لە وڵاتی ئەفغانستاندا فیمینیزمی ئیسلامی بەرهەمی هاوبەشی رووناکبیرانی نێوخۆو دەرەوەی ئەو وڵاتەیە. هێندێك لە لێکۆڵەران و راڤەکاران، باس لە گرووپێکی سێهەم دەکەن، وەك ئەندامی پێکهێنەری فیمینیزمی ئیسلامی کە ژنانی ئایینی و رووناکبیر لەخۆدەگرێ وە زیاتریان لە ناوەندی کارو بەڕێوەبەردنی کاروبارەکان لەگەڵ مەسەلەکانی ژنان ئاشنا بوون. لەم بارەوە، ئەوان کەمتر لە پێگەی تیۆریکەوە دەکەونە راڤەی کێشەکانی ژنان و زۆریان خۆیان بە فیمینیست نازانن، بەڵکو لەسەر ئەو بڕوایەن، دەبێ بۆ گارانتی و درێژەدان بە رۆڵی رێبەریی ئیسلام، لەگەڵ پێشکەوتنەکانی دنیای ئەمڕۆدا هاوئاهەنگی بکرێ. ئەوان لە بواری ئینتیما هزرییەکانەوە، زیاتر مەیلیان بۆ بیرۆکەی یەکسانیی مافەکانی ژن و پیاو هەیە. ئەم کەسانە زیاتر خۆیان بە ئایین خوازو شەریعەتڤان دەزانن و لە زۆربەی مەسەلەکاندا وەدوای حوکمی شەرعی و فیقهی دەکەون کە لە روانگەی ئەوانەوە نزیکترە. ئەوان کۆنڤانسیۆنی لابردنی هەرچەشنە هەڵاواردنێك دژی ژنان کە لە گرینگترین دەسکەوتەکانی فیمینسیتی سەدەی بیستەم دێتە ئەژمار، بە گشتی بە بەڵگەیەکی پێشکەوتوو دەزانن کە تەنیا لە هێندێك نموونەی لاوەکیدا پێویستی بە چاکسازی هەیە، ئەوان بڕوایەکی قووڵ و قایمیان بە ئیسلام هەیە، بەڵام بڕوایان لە قۆناغی زەینی و بیرەکییەوە نەگۆڕدراوە بۆ پانتایی پراکتیك. بەم هۆیەوە ئەوان لە بیاڤی هزرو ئەندیشەو کردەوەدا تووشی پارادۆکس و دووکەسێتی هاتون.

فیمینیستە ئیسلامییەکان، لەسەر ئەو بڕوایەن بۆ پێشگیری لە سێکۆلاریزەکردنی کۆمەڵگاو ئیسلام، تەنیا دەبێ سەرلەنوێ خەریکی بە ئیسلامی، فەرهەنگی بن، نەك کاروباری سیاسی، ئابووری. لەم نێوەدا ژنان رۆڵی سەرەکییان هەیە، چونکە وەك هەڵگرانی سەرەکیی فەرهەنگ چاولێدەکرێن، لەم رووەوە سەرپۆش و حیجاب تەنیا نیشانەی شەرم و حەیا نین، بەڵکوو شێوە بەرگرییەکن لە ئیسلامییەکان کە لە هەولی ئەوەدان، ژن لە بواری بەرپرسایەتی سیاسی، کۆمەلایەتی و فەرهەنگییەکان و نیشاندانی ژن وەك پارادایمێك کە وێڕای پاراستنی چوارچێوەی داوێن پاکی، وەك پیاوان بەشدارییەکی چالاکانەیان لە مەیدانی بەرپرسایەتیگەلی کۆمەلایەتی و سیاسیدا هەبێ.

ئەم ئامانج و ئارەزووە هی ژنانی ئایینی و مەزهەبییە، بەڵام ئەوەی کە ئایا لە راستیدا لە کردەوەشدا بەپێی ئەم رێوشوێنە هەڵسوکەوتیان کردوە یان نا؟ دەبێ بە چاوی گومان و دوو دڵییەوە لێی بڕوانین. زیاتر فیمینیستە ئیسلامییەکان باس و بیرۆکەکانی خۆیان لە رێژەیی بوونی فەرهەنگییەوە دەبینن بەو مانایەکی کە هەر کۆمەڵگایەك بۆ چارەسەری مەسەلەو گیروگرفتەکانی خۆی، وەڵامێکی خۆجێی هەیە کە دەبێ لە چوارچێوەی فەزای فەرهەنگیی خۆیدا بکەوێتە بەر دادوەری. لەم پێوەندییەدا دەتوانرێ بگوترێ کە فیمینیستە ئیسلامییەکان تا رادەیەك لە ژێر کاریگەریی بیرۆکەو تیئۆرییەکانی پۆست مۆدێرنیزمەکاندان. هەروەها فیمینیستە ئیسلامییەکانی نێوخۆش لە هێنانە بەرباسی روانگەکانی خۆیاندا، بە شێوەیەك کەوتوونەتە ژێرکاریگەریی رەوتگەلی دەرەکی، بە شێوەیەك کە وەك پردی پێوەندیی نێوان گرووپە فیمینیستیەکانی دەرەوەی وڵات لەگەڵ کۆمەڵگای ژنانی نێوخۆ هەڵسوکەوت دەکەن. فیمینیستی ئیسلامی پیاوسالاری بە باس و مەسەلەیەکی سەرەکیی ژنان لە بنەماڵەو کۆمەڵگا دەزانێ. لە پێناوی ئامانجە یەکسانیخوازانەکاندا خەبات دەکەن. دان بە جیاوازییەکانی ژن و پیاوی موسوڵمان لە حوکمە ئیسلامییەکاندا دەنێن. چەمکەکانی وەك: ئۆمانیزم، سیکۆلاریزم، مافی مرۆڤ و یەکسانیی ژن و پیاو لەگەڵ لێکدانەوە بەردەوامەکانی دنیای رۆژئاوادا شیدەکەنەوەو هەوڵ دەدەن بە پێشکەش کردن و خوێندنەوەی نوێ لە ئایەتەکانی قورئان، خوێندنەوەیەك لە ئایین کە نموونەو پارادیمە ناسراوەکانی رۆژئاوا نزیکتر بێتەوە، پێشکەش بکەن.

## ئامانج و بنەماکانی سەرهەڵدانی فیمینیزم

لەوەڕا کە پێکهاتەی ئایینی و مەزهەبی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان، ئیزنی چالاکی بە فمینیزم نادا، بزوتنەوەی فمینیزم بۆ مانەوەو درێژەدان بە چالاکییەکانی خۆی ناچارە، بڕواو خواست و داواکارییەکانی خۆی لە چوارچێوەی ئیسلامدا بگونجێنێ و بە زمانی ئایینی راڤەیان بکا. روانگەی ئەم بزوتنەوەیە بۆ ئایین روانگەیەکی جیاوازو، ئایین بە جودا لە سیاسەت دەزانێ و زۆر بە پارێزەوە باسی خوێندنەوەیەکی نوێ لە ئایین دەکەن. بیروباوەڕی ئەوان لە باسی بەرابەریی مافەکاندا یەکسانەو لەم پێوەندییەدا هەنگاو بۆ نەهێشتنی سنوورە رەگەزییەکان هەڵدەنێن. دیارە هەڵسەنگاندنی روانگەی فمینیزمی ئیسلامی، وێڕای باسکردنی پێگەی ژن لە روانگەی ئیسلامییەوە، لەباری هاتنە سەر دنیاوە، جیاوازییەك لە نێوان ژن و پیاودا نابینێ و هەردوو بە خاوەن ئیختیارو ئەرك لەخۆگرو بەرپرسیار دەزانێ کە بۆ کامڵبوون دەبێ هەنگاو بنێن. لەم وتارەدا هەوڵ دەدرێ، گرینگترین مەبەستەکانی ئەم بزوتنەوە لەم پێوەندییەدا بۆ گەیشتن بە مافی وەك یەك، رەدکردنەوەی بەکەم زانینی ژنان، یەکسانی و بەرابەریی نێوان ژن و پیاو، خۆ بە زیاتر زانینی پیاو بەسەر ژنداو وەدەستهێنانی بەرابەریی و هەروەها لە دوایین بەشی ئەم وتارەش لە

**روانگــەی ڕێنوێنییــەکانی ئیــسلامەوە فمینیــزم هەڵدەسەنگێنێ کە ئیسلام لەسەر بنەمای وەحی بونیــادنراوە، بــەڵام فمینیــزم مــرۆڤ دەکاتــە سەرچاوەی شەرعو وەحی بە پێویست نازانێ. فمینیزم خوازیاری مافی وەك یەك لە نێوان ژن‌و پیــاو لــە هــەموو کاروبارەکاندایــەو خوازیــاری کۆمەڵگایەکــە لــەودا ژن‌و پیــاو، ســەرووتر لــە ڕەگــەز، لە هــەموو بەرپرسایەتییەکان، ڕۆڵی وەك یەك هەڵبژێرن. فمینیزم تایبەتمەندییە ژنانەکان بــە تایبەتمەندیگــەلی باشــترو بــاتر دادەنــێ‌و ڕەگــەزی نێرینــە بــە هــۆی ژێردەســتەیی ژن دەناسێنێ. لە حاڵێکدا کە لە ئیسلامدا، ژن‌و پیاو لەیەك ڕەگەزن، بەڵام لە بواری ئەرك‌و مافدا جیاوازن، تایبەتمەندییە ژنانەو پیاوانەکان هیچ کام لەوی دیکە زیاتر نیەو ئیسلام نەهێشتنی زوڵم‌و ستەم لەسەر ژنان لە ڕێگای گۆڕانی ڕوانگەکان، شارەزایی ژن‌و پیاو بە مافەکانیان‌و کەســایەتیی یــەکترو نوســین‌و کۆکردنــەوەی بەرنامــە ئەخلاقییــەکان دەزانــێ. ئێــستاش لەسەرچــاوەی جۆراوجــۆرەوە چــاوێك بــە گــرینگترین ئامانجی بزوتنەوە فمینیستیەکاندا دەخشێنن.**

**گرینگترین ئامانجی بزووتنەوە فیمینیستییەکان:**

**سەرەرای ئەوەی کە فمینیزم بزوتنەوەیەکی فیکریــی یەکدەســت نیــە، بــەڵام هــەموو فمینیستەکان تێدەکۆشن بیرۆکەیەك بدۆزنەوە تــا لــە ژێــر تیــشکیدا ژنــان پێگــەی خۆیــان بدۆزنەوەو بۆ ڕزگاری خۆیان تێبکۆشن، لەو ڕووەوە کە لێکۆڵەرەوە فمینیستەکان خوازیاری کۆتایی هێنانی ستەم‌و چەوسانەوە لەسەر ژنانن، هاوڕان. تیئۆرییە فمینیستییەکان دەبێ بایەخگــەلێك بێننــە بــەرباس کــە لــە ڕوانگــەی ئەخلاقییەوە جێگای پەسند بن. تیئۆریگەلێك کە لە ڕاستیدا یەکگرتوو بن، بەڵام هەموو بیرۆکە فمینیــستییەکانی ئێــستا لەســەر ئــەوەی کــە دەتوانێ چ شتێك بە بەڵگە بهێننەوە؟ دەبێ چ شــتێك بــاس بکــەی‌و شــیی بکەیتــەوە؟ و کــام باس‌و شیی کردنەوە ڕوون کەرەوەیە؟ بیروڕای جیاوازیــان هەیــە. بــەو حاڵەشــەوە دەتــوانی فمینیزم بە بزوتنەوەیەك بۆ دەست ڕاگەیشتن بە مافــەکانی ژنــان‌و ئیدئۆلۆژییــەك بــۆ ئــاڵوگۆڕی کۆمــەڵگا دابنێــی‌و مەبەســت‌و ئامانجیــشی لابردنــی هــەموو جــۆرە جیــاوازی دانــان‌و هەڵاواردنێکی ڕەگەزیی‌و چینایەتیە لەسەر ژن، فمینیزم لە قۆناغی هزرو گەڵاڵەکردنی بەرنامەدا بۆ ئەو ئامانجانەی تێدەکۆشێ:**

**1-هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی مـافی وەك یـەك لەگەڵ پیاوان.**

**یەکەمین نارەزایەتییەکانی کۆمەڵگای ژنانی کرێکار، لە کارگەی چنین‌و ڕستنی نیۆیۆرك لە هەلومەرجێکی نالەباری کاردا لە ڕێکەوتی 8ی مارســی ســاڵی 1857ی زایینیــدا بــە شــێوەی بزووتنەوەیەکی فەرهەنگی‌و کولتووری دەستی پێکــرد‌و خوازیــاری حەقدەســت‌و مووچــەی وەك یــەك‌و یەکــسان لــە گــەڵ پیــاوان بــوو. ئــەوان یەکــسان بــوونی مووچــەی حەقدەســتی ژن‌و پیاویــان وەك هێمــای بەرابــەری دوو ڕەگــەز دەناسی. لە شەپۆلی یەکەمدا ژنان لەسەر ئەو بڕوایــە بــوون کــە دەتــوانن لــە چوارچــێوەی کۆمــەڵگای ئێــستا دا، پێگــەی خۆیــان**

باشـــتر بكـــەن، دروشمـــەكانیان رزگـــاریو وەدەســـتهێنانی مـــافی وەك یـــەك و یەكـــسان لەگەڵ پیاوان بوو.

حاڵەتی گشتیی باسەكە پێوەندی بە مافی ئابووریی ژن لـە كۆمـەڵگادا هەیـە، بـە تایبـەتی وێڕای ئەو هـەمووە بەربەستە توندە ئابووریو كۆمەڵایەتییانـەی كـە بنجیـان لـە دڵـی مێـژوودا داكوتـــاوە. ئەگـــەر، بـــە درێـــژایی ســـەدەكان دەســـەڵاتداران، مـــافی خاوەندارییـــەتییان بـــۆ ژنانیـان لەبەرچـاو نـەدەگرتو پـاش پێكهێنـانی ژیـــانی هاوبـــەش، ژنیـــان بـــە گوێڕایـــەڵو خزمـــەتكارو پیـــاوانیش بـــە خاوەنـــدارو فـــەرمانڕەوای ئـــەو دەزانـــی، فمینیـــزم لـــەم روانگـەوە نارەزایـەتیو هاوارێكـە بـەم هـەموو نابەرامبـەریو نایەكـسانیە، بـە تایبـەتی بـەو نادادپەروەرییـە ئابوورییانـەو ئـەو هەڵاواردنـە ئابوورییانـەی لەمـەڕ ژنـان كـە رەگو ریشەیەكی قووڵیـان هەیـە. كـە تەنانـەت پـاش نارەزایـەتیی بەربڵاوی ژنان لە سەدەكانی رابردووەوە تا ئەمڕۆ لـــە زۆربـــەی وڵاتانـــدا، بیرۆكـــەی بەرامبـــەریی حەقدەســـتو مووچـــەی ژنو پیـــاو هێـــشتا وەدی نەهاتوە.

**2-هەوڵدان بۆ رەتكردنەوەی بەكەم گرتنی ژنان:**

لـە رابردوویـەكی كۆندا بە هـۆی رێگـرتن لە خوێنـــدنی ژنـــان و بارهێنـــان لـــە هاوكێـــشە ئابوورییـــەكانو پـــۆلێن بەنـــدی بایەخـــە كۆمەڵایەتییـــەكان، ژن بـــە بوونـــەوەرێكی ژێـــر دەســتە دەژمێـردرا. لــە زۆربــەی نموونەكانــدا، سەرچاوەی مافەكانی ژنان شێوە روانگەیەك بوو كە ژنی بە رەگەزی دووەم دادەنا.

لـــە ئـــایینی زەردەشـــتیدا، ژنێـــك كـــە منداڵەكەی بە مردوویی لە دایك بایە، نەدەبوا تا ســـێ شـــەو رۆژان دەســـتی بـــۆ هـــیچ شـــتێك ببردبایـەو لـە پـاش ئـەوەش دەبوایـە بـە میـزی مانگا خـۆی شوشتباو برێك لەوەشی خواردبا، تا خاوێن بایەوە.

لە ئایینی یـەهوودییش پەیكـەری حـەوایان بـە سەرچـاوەی هـەموو دەردە بێدەرمانـەكانو خـــەمو خەفەتـــە دڵتەزێنـــەكانی مرۆڤایـــەتی دەناساندو لەسەر ئەو بڕوایە بوون كە ژن لە لای خودا، كەساسو داماو، لـە خوڵقانـەوە ناتـەواوو لـە پاداشیـشدا زیانكـارو زەرەرمەنـدە، و لـە سوننەتو دابونـەریتی عەشیرەتدا، ژن گـوێ لـە مستێكی بێ دەسـەڵاتە، لە ئاست مێردەكەیدا. هەڵبـژاردنی هاوسـەر بـۆ ژیـانی هاوبـەش بـە دەســت بـاوكو دایكـی كـچە بـوو، و تـەڵاقو جیابوونـــەوەش تـــەنیا لـــە رووی مـــەیلو پێخۆشـبوونی پیـاوەوە بـەڕێوە دەچـوو. لـە ئـایینی مەسـیحییەتدا تـەنیا مریـەمیان بـە مرۆڤێكـــی خـــاوەن روحـــی هەمیـــشەییو هەتاهـەتایی دەزانـیو ژنـانی دیكـەیان لـە نێـوان مـرۆڤ و چـوارپێ دادەنـا. قەشـەكان لـە كۆمـەڵگای ئـایینی فەڕانـسە لـە سـاڵی 586ی زایینیـدا پـاش باسـێكی زۆر سـەبارەت بـە ماهییـەتی ژن، گوتیـان ژن مرۆڤـە، بـەڵام بـۆ خزمـەت كـردن بـە پیـاو خوڵقـاوەو لـەدایك بـوو. ژن لە باوكو مێرد میراتی پێنادرێو تـەنیا بـۆ زاوزێو پـــەروەردەو گـــەورەكردنی منـــداڵو ئیـدارەی ماڵ بەكەڵكە. لـە زۆربـەی ناوچـەكانی ئـــەفریقادا، زكـــوزاكردن، چـــنینی حەســـیر، چـــاندنی گیـــا و ئاوداشـــتنی زەوی ئـــەركی

سەرشانی ژنانن. زیاتر منداڵان بە قسەکانی دایك گرنگی نادەنو بۆ بچوکترین مەسەلە تەنانەت شەقەزللەش لە دایکیان دەدەن، سەیرو سەمەرەتر لە هەمووان ئەوەیە کە ژن بۆ خۆی ئەم باودۆخە بە شتێکی ئاسایی و دادپەروەرانە دەزانێ.

3-پێداگری لە سەر نەبوونی یەکسانیی و بەرامبەریی نێوان ژن و پیاو:

یەکێکی دیکە لە ئامانجەکانی فمینیزم، لە ئەسڵی باڵادەست نەبوونی پیاو بەسەر ژندایە کە لەچاو ئامانجەکانی دیکەی فمینیزم روانینێکی مەنتیقیترە، چونکە لەسەر بەرابەری و یەکسانیی نێوان ژن و پیاو هاوڕان و بەلانی کەمەوە لە روانگەی ئاناتۆمییەوە ژن و پیاو بە جیاواز دادەنێ. ئەم روانینە یان کاریگەری لە روانگەکانی پاش مودێرن هەیە کە لەسەر ئەو بڕوایەن لە شوناسی ژنانەدا، چ لە روانگەی ژیان و چ لە روانگەی کۆمەڵایەتیشەوە، توانایی پۆزەتیڤ و باشی هەیە کە رۆڵی دایك، توانایی بارهێنان و بەرپرسایەتی ژنان دەباتە سەرێ و لەم روەشەوە ئەوان بەگشتی حاشا لە سیستمی بنەماڵە دەکەن. بەڵام لە هەمان کاتدا داوای رۆڵی یەکسانی ژن و پیاو لە ئەرك و بەرپرسایەتییەکانی بنەماڵە و کۆمەڵایەتیدا دەکەن.

4-هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی مافی یەکسانی:

بیرچەوتی و روانگەی زاڵمانەو چەوسێنەرانەی هێندێك لە سیاسەتمەداران بۆتە هۆی ئەوەی کە پێشێلکردنی مافە رەواکانی ژنان و چەسپاندنی بێ بەشییەکانیان شێوەیەکی قانوونی بە خۆیەوە بگرێ. ئەوپەڕی ئەم هەڵاواردنە لە مەسەلەکانی بنەماڵەدا وەك پێکهێنانی ژیانی هاوبەشی، جیابوونەوەو بژێو، خۆی دەردەخاو هەر بۆیە کۆبوونەوە ناڕەزایەتییەکانی ژنان بەو شێوەیەی کە باوە، پێشینەیەکی دوورو درێژی هەیە، واتە لە کاتی دەرکەوتنی سیمۆن دۆبوارو گەڵاڵەی بیرۆکەی یەکسانیی ژن و پیاو کە لە چوارچێوەی رێبازی فەلسەفیی ئیگزیستانسیالیزمدا هاتە بەرباس. داوای یارمەتیی توێکاری زانستی و فیزیۆلۆژیك بۆ سەلماندنی بەرابەریی دوو رەگەز کرا. دەتوانین گرینگترین داخوازییەکانی ئەم روانگەیە لە 8 داوادا باس بکەین.

1. مافی دەنگدانی ژنان،
2 . نەهێشتنی لەشفرۆشی
3. بەفەرمی ناسینی مافەکانی ئەو منداڵانەی کە تەنیا باوك یان دایکیان هەیە
4. ئازادی لەباربردنی کۆرپەڵە
5. مافی هەبوونی منداڵ لە پیاوی دڵخوازی خۆیان
6. بە فەرمی ناسینی ئازادی چێژ وەرگرتنی جنسی
7. مافی بەقەشە بوونی
8. بەفەرمی ناسینی *Homosexual*(هم جنس گرایی) هۆمۆسێکشواڵ

لەوەی ڕا کە هێندێك لە داخوازییەکانیان لەگەڵ ئایینە ئاسمانییەکان و سیستمی بنەماڵە دژایەتیان هەبوو. هەر بۆیە لە سەرەتاوە خواست و داواکارییەکانیان لەگەڵ ناڕەزایەتییەکی زۆردا، بەرەو ڕوو بوو.

**بنەماكانی فمینیزمە ئیسلامییەكان:**

پێویستە لە سەرەتادا باسی خوێندنەوەی فمنیزمە ئیسلامییەكان بۆ فمینیزم بكەین. بە بڕوای ئەوان فمینیزم بزووتنەوەیەكی كۆمەڵایەتیی یەكسانیخوازە، نەك بزووتنەوەیەكی ئیدئۆلۆژیك. لەوەڕا كە فمینیزم بەدەر لە لایەنگریی ئیدئۆلۆژیك نیە، دەتوانرێ بە پاراستنی پێناسەو شوناسی ئیسلامییەوە فمینیزم بێ و هەم داكۆكیی لە ماف و ئازادییەكانی ژنانیش بكا. ئەوان رەخنە لە فمینیزمی رۆژئاوایی دەگرن و بە پێشكەش كردنی رێكارێك بۆ هەموو ژنانی جیهان بە لەبەرچاو گرتنی مەرجی فەرهەنگی و ناوچەیی لەسەر ئەو بڕوایە بوون كە جێبەجێ نابێ.

**خوێندنەوەی ئایین:**

فمینیزمی ئیسلامی، لە هەوڵی ئەوەدایە كە لە چوارچێوەی رێوشوێنە ئایینیەكاندا داكۆكی لە مافەكانی ژنان بكا. هێندێك، فمینیزمی ئیسلامی وا لێك دەدەنەوە، كە لەبواری یەكسانیی و دادپەروەریی رەگەزی لە چوارچێوەی بایەخە ئیسلامییەكاندایە. بە شێوەیەكی گشتیی فمینیستە ئیسلامییەكان بەتایبەت فمینیستەكانی دەرەوەی وڵات، باوەڕیان بە جیایی دین لە سیاسەت هەیە بەڵام هێندێكیان بە ڕاشكاوی باس لەو مەسەلەیە ناكەن، بەڵام دەستیان داوەتە خوێندنەوەیەكی نوێ لە ئایین. كە بە رادەیەكی زۆر هاوتەریبی لەگەڵ فەرهەنگی نوێ مسۆگەر دەكا، خوێندنەوەیەك لە ئایین كە كاروباری كۆمەڵایەتی بە پێگەی هەڵسووڕانی بیرمەندان و كارێكی عورفی دەزانێ. لەمەڕا بۆمان دەردەكەوێ كە پاشگری ئیسلامی لە پاش وشەی فمینیزم، لە نێوەرۆكدا بەرتەسكت ناكاتەوەو سنوورت بۆ دیاری ناكا. واتە ئیسلامی بوونی فمینیزم بەو مانایە نیە كە لقە فمینیستییەكان هەموو ئامانج و رێكارەكانی خۆیان لە ئیسلام وەرگرتبێ. بەڵكوو نیشانەی بەدواداچوونی ئامانجە فمینیستییەكان و ئەو رێكارانەیە كە خۆیان لەگەڵ ئەدەبیاتێكی تا رادەیەك ئایینی رێك دەخەن، نە ئەوەی كە ئایین بە پاڵوێنەی ئەندێشەی مرۆڤایەتی بزانن.

ئەم دەستەیە كە ئیشارە بە سێكۆلار بوون ناكەن، گۆڕانكاری حكومگەلێ لە شەرعدا بە پێویستی بەدواداچوون دەزانن و لەسەر ئەو بڕوایەن كە روانگەكان لە حوكمە شەرعییەكانەوە بۆ مەبەستە ئایینیەكان بێ و بەو پێیە دەبێ، سەرلەنوێ راڤەی وانە ئایینییەكان بكەین.

**خوێندنەوەی یەكسانی و بەرامبەری:**

یەكسانی لە روانگەی فمینیستە ئیسلامییەكانەوە، رێك هەر ئەو مانای وەكهەڤی و بەرامبەرییە دەبەخشێ كە ئەوان لە هەڵوێستەكانی خۆیاندا بۆ هەڵگرتنی سنوورەكانی نێوان دوو رەگەز رەچاویان دەكەن، واتە یەكسانی بەو مانایە كە لە نێوان دوو مرۆڤی هاورەگەزدا دێتە گۆڕێ، دەبێ هەر بەو واتایەش بۆ ژن و پیاو لەبەرچاو بگیردرێ.

هێندێك لە فمینیستە ئیسلامییەكان بە ئاشكرا ڕادەگەیەنن، كە جیاوازییە سروشتییە

جێگیربووەکانی نێوان ژن‌وپیاو نابێ ببنە هۆی جیاوازیگەلی شەرعی و حقووقی لە نێوانیاندا، دەبێ بڵێین یەکسانی بەو مانایەی سەرەوە، نەتەنیا پێگەیەکی ئاینیی نیە، بەڵکوو بەپێچەوانەی یاسا و ڕێنماییە ئایینیەکانیشە.

ئەوەی ئایین پێی لەسەر دادەگرێ، دادپەروەری و ژنیش وەك پیاو، مرۆڤێکە کە خاوەنی لێهاتوویی و بەهرە مرۆڤانەیەکانە. خواوەند بەپێی حیکمەتی خۆی بۆ ڕێکخستنی کاروباری کۆمەڵگا هێندێك جیاوازیی لە خولقاندندا بۆ ژن و پیاو لەبەرچاو گرتووە و چاوەروانیی جۆراوجۆری لەم دوو رەگەزەش هەیە و ئەرکی جیاوازیشی بۆ دیاری کردون.

لەهەرحاڵدا ئەوەی کە لە پێگەی ئایینییەوە دەتوانرێ دانی پێیدا بهێنرێ، هاوسەنگی و هاوترازییە نەك وێکچوونی. فمینیستە ئیسلامییەکانی نێوخۆی وڵات خوازیاری دژە ژنی یان بەرامبەری لە هەموو بوارەکاندا نین، هەر بەم هۆیەوە پێداگری لەسەر پێگەی بەرزی ژن لە ماڵدا دەکەن، و بە بڕوای ئەوان ئامانجی بزووتنەوەی ژنان دەبێ لەگەڵ رۆڵەکان و ڕێزدانان بەرامبەر بە ئەرکە جیاوازەکانی ژن و پیاو بێ.

**خوێندنەوەی ئازادی:**

ئازادی، چەمکێکە کە فمینیستە ئیسلامییە توندڕەوەکان زیاتر لە سەری سوورن. لە روانگەی ئەوانەوە ئازادی پێوەندییەکی قووڵی لەگەڵ تاك تەوەریی بەمانا رۆژئاواییەکەی هەیە و لە کولتووری رۆژئاواوە هەڵهێنجراوە، لەم روانگەیەدا، مرۆڤەکان ئازادن لەوەی کە بە نیازن بەرێوەی ببەن تا ئەو رادەیەی کە ئازادی کەسانی دیکە پێشێل نەکەن. بەڵام پێداگریی فمینیزمە ئیسلامییەکان لەسەر پاراستنی بایەخە مەعنەوییەکان، ئەوان لە روانگە لیبرالیستییەکان جیا دەکاتەوە، چوونە دەرەوەی ژن لە ماڵ بە ئیزنی مێرد هەم بەهۆی بەرتەسککردنەوەی ئازادیی ژن و هەم بەهۆی ئەوەی کە لەسەر بنەمای رەگەز و جیاوازیی دانەرانەیە، هەڵوەشاوەیە.

دەتوانی لەروانگەی فمینیستەکانی نێوخۆوە، باسی ئازادیی زیاتر لە پۆششی دڵخوازو پێویستیی چاکبوونی پێوەندیی بنەماڵەیی بناسی، دەنا ئەوان لە باسی تێئۆریکدا، نەکەوتوونەتە شرۆڤەکردنی چەمکێکی راست و دروست لە ئازادی. بەبڕوای ئەوان ئەو حوکمانەی کە بە ڕواڵەت سنووردارو بەرتەسکراو دێنە بەرچاو، لە راستیدا بەدوای پەرەپێدانی ئازادییە مرۆڤایەتییەکاندان. بۆ نموونە، حیجاب و داپۆشین بە یەکێك لەو ڕێگایانە دەزانێ کە دەبێتە یەکێك لە کۆسپەکانی سەر ڕێی گەشەکردن و تێکەڵ بە کێشە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا دەبێ.

**خوێندنەوەیەك لە بنەماڵە:**

فمینیزمی ئیسلامی پێداگری لەسەر پاراستنی بنەماڵە و رۆڵی دایکایەتی و ئەرکی ژن لەوێدا، دەکا و هەر بەم هۆیە دژایەتی لەگەڵ هۆمۆسێکسوال دەکا و لەم روانگەوە بنیادی بنەماڵە و دایك لە بنەرەتدا گیروگرفت خولقێن نیە، لایەنگرانی ئەم روانگەیە لە بنەماڵەی نەریتی کە لەسەر بنەمای پیاوسالارییە، رەخنە

دەگـرن، ئامـانجی ئـەوان پێکهێنـانی بنەماڵەیـە لەسـەر بنـەمای بەرابـەریی رۆڵـەکانو دژایـەتی لەگەڵ سەرپەرشتیی پیاو، ئەوان دیموکراسی لە بنەماڵــەدا بــە جێگرەوەیــەکی گونجــاو بــۆ سەرپەرشتیی پیاو دەزانن.

**هەڵسەنگاندنی فمینیزمی ئیسلامی:**

لـە زۆر بـواردا فمینیزمـی ئیـسلامی، لەگـەڵ بنــەماکانی ئیــسلامدا یــەك ناگرێتــەوەو لــە روانگــەی کۆمــەڵگاوە وەلا نــراوە، گیروگرفتــی ژنـان لـە کۆمـەڵگا ئیسلامییەکاندا لەلایـەك بـۆ کولتــووری کۆمەڵایــەتیو نــەریتی نابــەجێیو دواکەوتوانـەو بـە رێكوپێـك نەچوونی بەرنامـە ئیــــسلامییەکان دەگەرێتــــەوەو لەلایــــەکی دیکەشـەوە بـۆ شـارەزا نـەبوونی ژنـان لـە مافـە کۆمەڵایـەتیو ئیسلامییەکان. ژنـان بـەو هۆیـەی کــە کەرەســتەو ئیمکانــاتی پێویــستیان بــۆ بەرێوەچوونی یاساکان لەدەستدا نییە، تووشی بێبەشـیو چەوساندنەوە هـاتوون. ئـەوەش بـەو مانایــە نییــە کــە ژنــی موســوڵمان بــۆ وەدەستهێنانی مافەکانی خۆی پەنا بۆ فمینیزم ببا، چونکە ئیسلام لە بواری نێوەرۆكو بنـەماوە زۆر دەوڵەمەندەو بۆ پاراستنی رێزو حورمـەتی ژن،هیچ پێویستی بە فمینیزم نیە.

فمینیزمــە ئیــسلامییەکان لــە جیــاتی دۆزینــــەوەو چارەســــەری مەســــەلەو گیروگرفتــەکانی توێــژی ژن بکـەن، بـە شـوێن قـەیران خولقانـدنو پێکهێنـانی دردۆنگـی بـۆ ژنانی موسوڵمانن.

فمینیزمـی ئیسلامی، وەك بزووتنەوەیـەك بـە گشتی لـە دوو لایەنـەوە تـەنگی پێهەڵچنراوەو ناتوانــێ وڵامــدەری پێویــستییەکانی ژنــانی موسوڵمان بێ. 1. لەبای ئەندێشەو ئیدئۆلۆژیو بناغەی زانستییەوە لاوازە. 2. لـە میکانیزمێکی گونجـاوو وشـیار بـۆ هەڵوێـست ناسـی مەسـەلە نوێیـەکان بـێ بەشـە، لـەم رووەوە یـان تـەنیا بـە هێنانی شتە گشتییەکان قەناعەت دێنێ، یان بە شـێوەیەکی پاسـێڤ قـسەی خـەڵکانی دیکـە دووپــات دەکاتــەوە. بۆچــوونی لایــەنگرانی فمینیزمــی ئیـسلامی، بـاس لـەوە دەکـەن کـە ژمارەیــەکی زۆر لــەوان لــە هەلومــەرجی کۆمەڵایـەتی، ئـابووریو فەرهـەنگیو گرووپـە جۆراوجۆرەکانی ژنـان، ناسـیاریی باشـیان نیـە. دەبێ ئاگادار بین فمینیزمە ئیسلامییەکان کە بە دروشمـی داکۆکی لـە مافـەکانی ژنـی موسـوڵمان هاتونەتـە مەیـدان لـە هەڵـسەنگاندنی مەسـەلە حقوقییــەکانی ژنــان، گەلاڵــەکردنی مەســەلەو گیروگرفتــــــەکانیان، رێگادۆزینــــــەوەو چارەســــەرکردنیان، نابــێ وردە کولتــــورە ناوچــەیی، زمــانیو ئایینیــەکان لەبەرچــاو نـەگێردرێن. راسـتە کـە فمینیـزم لـە کۆمـەڵگا ئیسلامییەکاندا کـەم تـا کورتێك وەك دیاردەیـەك سەری هەڵداوەو توانیویـەتی روانگـەی کۆمـەڵگا سـەبارەت بـە مەسـەلەکانی ژنـان تـا رادەیـەك بـۆ لای خـۆی راکێـشێ، بـەڵام دەبـێ ئـەوەش لـەبیر نـەکرێ کـە سـنووری ئـەم چـالاکییانە تـا ئـەو جێگایەیە کە هێڵەسوورە ئایینییەکانو نەریتی کۆمـەڵگا نەبـەزێنێ. ژمارەیـەك لـە فمینیـستە ئیــسلامییەکان جیاوازییــە بیۆلۆژیکــەکانی ژنوپیــاو بــە ئاســاییو سروشــتی دەزانــنو کاریگــەریی ئــەم جیاوازییانــە لــە هێنــدێك نموونـەدا قـەبووڵ دەکـەن، ئـەوان دەبـێ سـەرنج

بدەنە کاریگەریی ئەم جیاوازییانەو ئەمە هەمان قبوولکردنی هاوسەنگیی نێوان پێکهاتن و تەشریعە، کەوابوو دەستێوەردانی ئایین لە بواری ژیانی مرۆڤ مەسەلەیەك نیە کە هیچ بیرمەندێك و شارەزایەکی ئایینی، دژی بێ، چونکە چاکسازیی کۆمەڵگا لە بەرژەوەندیی و بەختەوەریی ئەویشدا کاریگەرە، لەوەی کە لەنێوان دنیا و پەسلاندا پێوەندییەکی قایم و پتەو هەیە، کاروباری کۆمەڵایەتیش لە چوارچێوەی دەسەڵاتی شەریعەتدایە.

**ژن لە روانگەی ئیسلامەوە:**

ئیسلام وەك پیاو چاو لە ژن دەکا، کە سێ تایبەتمەندی هەیە وەك: بەرپرسیاریەتی، دەسەڵات و پێگەیشتوویی. قورئان باس لە ژنانێك دەکا کە هاوقسەو نزیکی فریشتەکانن و جێی سەرنجی پێغەمبەرانن. ئەمەش سەلمێنەری کەسایەتیی بەرزو پیرۆزی ژنە، ژن و پیاو دوو بوونەوەری کۆمەڵایەتین و خوازیاری پێوەندیگرتن لەگەڵ کەسانی دیکەن، تا لە سایەی ئەم پێوەندییەدا خەریکی بە ئەنجام گەیاندنی ئەرك و خواستەکانیان بن و لە کۆتاییدا لە بوارگەلی جیاجیاوە گەشە دەکەن. لە کولتووری ئیسلامییدا هەرکام لە تاکەکانی کۆمەڵگا پێگەیشتوویی خۆیان لە پێگەیشتوویی کەسانی دیکەی کۆمەڵگا دەزانن و هەر بۆ ئەم مەبەستەش ئیسلام بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی زیندوو، لەسەر پێویستی هاوئاهەنگی و دۆستایەتی بەرامبەر لە پێوەندیدا، بەتایبەتی لە پێوەندی لەگەڵ ژن و پیادا پێی داگرتووە.

**هەڵسەنگاندنی فمینییزم:**

جۆراوجۆریی لایەنگرانی فمینیزمی و جیاوازیی بیرو ئەندێشەکانیان لەگەڵ یەکتر، ئەو راستییە دەسەلمێنێ کە فمینیزم تەنیا دەتوانێ لەبواری داکۆکیکردن لە مافەکانی ژنان بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بێ، نەك رێبازو ئیدئۆلۆژییەکی تایبەت. لەوەی ڕا کە بزووتنەوەی فمینیزم لە هەناوی رێنسانسەوە هەڵقولاوەو لەسەر بنەمای جیهانبینی رۆژئاوایە، مرۆڤ بە سەرچاوەی شەرع و سەربەخۆ لە وەحی دەزانێ، کەوابوو لای هیچکام لە فمینیستەکان باوەڕ بە وەحی و دەسەڵاتداریێتی ئایین لە سیستمی مرۆڤایەتیدا وەبەرچاو ناگرێ. تەنانەت لە نێوان هێندێك لە گرووپە فمنیستییەکاندا، بیروبڕوای وا گەڵاڵە دەکرێ کە لە چوارچێوەی هیچ ئایین و مەزهەبێکدا بۆ باسکردن نابێ و نایەتە گۆڕێ، بۆ نموونە بە فەرمیی ناسینی هاوڕەگەزبازی (*Homosexual*) و مافی لە باربردنی کۆرپەڵە.

لە کۆی ئەم بابەت و باسانەدا دەگەینە ئەو ئاکامە کە فمینیزم، بزووتنەوەیەکی ئۆمانیستی و مرۆڤانەیە. بڕوای بە یەکسانیی و وەکیەکی پێداویستیی و دەرەتانەکاندا هەیە.

لەوەی ڕا کە پەرەپێدانی خۆشبژی و کاروباری ماددی یەکێکە لە بنەماکانی جیهانبینی رۆژئاوا، مەبەستی هەموو فمینیستەکان پێکهێنانی کۆمەڵگایەکە کە لەودا جیاوازیدانان لەسەر بنەمای رەگەز، جێگای خۆی بداتە یەکسانی، تا ئامانجی یەکسانی و بەرابەری و کەڵك وەرگرتن لە خۆشگوزەرانی

ماددی بێتەدی. کۆمەڵگایەکی باش لە روانگەی ئەوانەوە کۆمەڵگایەکە جیاوازیی رۆڵەکان لەگەڵ یەکسانیی لە هەموو بوارو چالاکییەکاندا دەبێ گۆڕانی بەسەردا بێ و لە مەیدانی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا، ژن و پیاو وەك یەك رۆڵ ببینن، بەبێئەوەی لە پێ ئەسپاردنی رۆڵە کۆمەڵایەتییەکاندا، هەستە دەروونییەکان، توانایی و لێهاتووییە هزری و جەستەییەکانیان کاریگەرییان هەبێ، لەم پێوەندییەدا فمینیزم دەتوانێ ژنان لە چوارچێوەی بنەماڵەوە بهێنێتە گۆڕەپانە کۆمەڵایەتییەکانەوەو بیانخاتە جێگەو پێگەیەکی بەرواڵەت یەکسان و بەرامبەر لە شوێنی کارو فێربوون.

لە رۆژئاوادا، ژن بە هیوای گەیشتن بە سەربەخۆیی ئابووری و دەسەلات، وەدوای فمینیزم کەوت، بەلام بێجگە لە تێکشکانی کۆمەڵایەتی هیچی دیکەی وەچنگ نەکەوت. "نیکۆلاس دەیویدسێن" لەم پێوەندییەدا پێناسەیەکی جوانی هەیە: هەرچەند پێشتر، زۆرجاران لەگەڵ ژن وەك کالا مامەڵە کراوە، بەلام ئەورۆکە ژن لە بنەڕەتدا متمانەی رەگەزی خۆی لەدەست داوەو ئەگەر پێشتر هۆی بێ بایەخ بوونی ژنان پیاوان بوو، بەلام ئێستاکە خۆیان هۆی سەرەکین، ئەگەر دوژمنی مێژینەی رەسەنایەتیی مەسەلەی رەگەزیی بوو، بەلام دوژمنی ئێستاکەی نەبوونی رەسەنایەتی و بەرابەری لەگەڵ پیاوە.

لەوەڕا کە ژن و پیاو لە بواری روحیی و خۆشەویستییەوە پێکەوە، جیاوازن ، لە بواری کۆمەڵایەتییەوە خاوەن کارامەیی جیاوازن، یان بە شێوەیەکی دیکە توانایی و لێهاتوویی و رۆڵ و مافە کۆمەڵایەتییەکانیش ئاڵوگۆڕیان بەسەردا بێ، فمینیستەکان زیاتر بڕوایان بە یەکسانی و بەرابەریی رەگەزی نێرو مێ هەیەو هەر جۆرە جیاوازییەك رەت دەکەنەوە. لە روانگەی ئیسلامەوە، کۆمەڵگای ئامانجخواز، کۆمەڵگایەکی دوو رەگەزییە کە ژن و پیاو نەك تەنیا لە پێناسەو هەڵسوکەوتدا تا رادەیەك لە یەکتر جیاوازن، بەڵکوو لە کردەوەکانیشیاندا هەڵسووکەوتگەلی وەك یەك و زۆر جاریش رەفتاریان جیاوازە. هەر بۆیە ئەگەر مەبەست لە یەکسانیی ژن و پیاو لە ماف و توانایی کۆمەڵایەتیدا وەك ئەو نموونانە بن کە باس کران، ئیسلام نەك تەنیا ئەوەی بەدڵ نیەو پێداگری لەسەر ناکا، بەڵکوو ئەم لایەنە بۆ هیچ کام لەو دوو رەگەزە بە باش و بەکەڵك نازانێ.

هێندێك لە فمینیستەکان تایبەتمەندییە ژنانەکان بە باشترین تایبەتمەندی ناودێر دەکەن و بڕوا کردن بەم باشترین تایبەتمەندییە پێویستی بەو بابەتە هەیە کە ژن و پیاو لە سروشتی خۆیاندا هەڵسوکەوت و تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆیان هەیەو ئەمەش هەر ئەو باسەیە کە فمینیستەکان خۆیان لە پابەندبوون پێیەوە دەدزنەوە. فمینیستەکان هێندێك خووخدەی ژنانە لەوانە وەك گوێڕایەڵی و شوێنکەوتوویی پیاوان بە تایبەتمەندییەکی نەرێنی و خراپ دەزانن، کە کۆمەڵگای پیاوسالار بەسەریاندا سەپاندوە. بەلام دەبێ بپرسین کاتێك ئەوەمان قبووڵ کرد کە تایبەتمەندییە ژنانەو پیاوانەکان لە ژێر کاریگەریی سیستمی پیاوسالاردا گەشەیان کردوە، بۆچی یەکێك لەم دووانە تایبەتمەندیی

باشتریان هەیە؟ بە پێی باوەڕە ئیسلامییەکان، لەو جێگایەی کە تایبەتمەندییە ژنانو پیاوانەکان بنجی لە سروشتی هەردوو رەگەزی نێرو مێ داکوتاوە، تایبەتمەندییەکی پێویست بە بەڕێوەبردنی بەرپرسایەتییە تایبەتەکان کە ناتوانرێ هیچ کامیان بە ئەرێنی یان نەرێنی و بە باشتر لەوی دیکەیان دابنرێ، ئەم تایبەتمەندییانە ئەو کاتە شێوەی نەرێنی بە خۆیانەوە دەگرن کە بێ جێ بەکار ببردرێن. فمینیستەکان، هۆی زوڵم کردن لە ژنانو ژێردەستەیی و چەوسانەوەیان دەگەڕێننەوە بۆ پیاوان. فمینیستە رادیکاڵەکان پیاوان بە هۆی پیاو بوونیانو هەبوونی تایبەتمەندیی بیۆلۆژیکی تایبەت، بە هۆکاری چەوسانەوەی رەگەزی دەزانن و لەسەر ئەو باوەڕەن جیاوازیی رەگەزیی، هۆکاری رەگەزی زاڵو سەرکەوتوو بە درێژایی مێژوو بووە. لە لایەکی دیکەشەوە گرووپێک لە فمینیستەکان هەموو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، بنیاتنراو لەسەر چەوسانەوەو زوڵم دەزانن و لەسەر ئەو باوەڕەن کە زەنجیرەیەکی پێکەوە گرێدراو لە زوڵمو زۆریو ملکەچی لە نێو گرووپەکانی نەریتی، قەومی، رەگەزی، ئایینیو نەژادییەکاندا دەتوانرێ ببینرێ.

پێداگری لەسەر سەربەخۆیی ژنانو دوژمنایەتی لەگەڵ پیاو، پێش ئەوەی ببێتە هۆی وەدەستهێنانی ماف بۆ ژنان، دەبێتە هۆی پێکهێنانی پارادۆکس لە نێوان دوو رەگەزداو ژنان لە سەرنجدان بەو هۆ سەرەکییانەی دواکەوتوویی خۆیان کە دەسەڵاتو شێوەی هەڵسوکەوتو ئەخلاقی ماددیو روحی سەرمایەدارییە، وەدوا دەخا. لەم ململانێیەدا هێندێک لە سیاسەتمەداران و سامانداران زۆرترین قازانج دەکەنو بەکردەوە دەبنە کۆسپ لەسەر رێگای دیاریکردنی چارەنووسی خەڵکیدا. رێبازی ئیسلام، ئەفراندنو خوڵقاندن بە شتێکی ژیرانەو مەبەستدارو، جیاوازییەکانیش بە پێکهێنەری پێکەوە گونجانو ئارامیی دەزانێ، لە روانگەی ئیسلامەوە هەر جۆرە پێوەندییەک لە نێوان تاکەکاندا کە ئاکامەکەی جیاوازیی لە لێهاتووییەکانی لێ بکەوێتەوە، بەشتێکی زاڵمانە دەزانرێ.

کارامەییەکانی مرۆڤەکان کە دەبێتە هۆی داگیرکردنی تاکەکان لە یەکترەوەو لە ئاکامدا جیاوازی لە ئاست بژێویو ژیاندا، تا ئەو رادەیەی کە مافە راستەقینەکانی تاکەکان پێشێل نەکەنو دژی مافە ئاساییەکانی مرۆڤ و سروشت نەبێ، قبووڵە. هۆیە سەرەکییەکانی زوڵم کردن لە ژنانو ژێردەستەییان چین؟ لە هەڵسەنگاندنی مەسەلە مێژووییو ئایینیەکان دەتوانرێ چەند هۆی گرینگ بۆ راڤەکردنی ژێردەستەیی ژنان بهێنینەوە وەک:

1. بێبەش بوونی ژنان لە خۆ ناسین.
2. بێبەشن بوونی ژنان لە بەباشی ژیان.
3. دەمارگرژی پیاوان.
4. پیاوسالاریو بێعەداڵەتی پیاوان دەرهەق بە ژنان.

5ـ بڕوا نەبوونی پیاوان بە توانایی و لێهاتوویی حەستەییو هزرییەکانی ژنان لە بەڕێوەبردنی بەرپرسایەتییە کۆمەڵایەتییەکاندا.

6ـ تێنەگەیشتن، لە خۆرازی بوونو خۆ بە بازنە دیتنەوەی پیاوان.

ئیسلام ڕێگای نەهێشتنی زوڵم کردن لە ژنان لە خەباتی سیاسی لەگەڵ ڕەگەزی نێر، ئالوگۆڕە ئابوورییەکان، خەباتی چینایەتیو شۆڕش لە یاساکانو ڕاهێناندا نازانێ، بەڵکو یەکەم هەنگاو لە نەهێشتنی زوڵم لەسەر ژنان بە چاکسازی زەینییەکان دەزانێ، جا ئەو کات بە چاکسازیی کولتووری، بوارو هەلی شارەزایی ژنانو پیاوان لەگەڵ کەسایەتیی ڕاستەقینەو شکۆمەندیی مرۆڤی خۆیان دەرەخسێنن. لە هەنگاوی دواتردا دەبێ سەرنج بدرێتە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان ژنانو پیاوان، بایەخو تایبەتمەندییە ژنانەو پیاوانەکان بە فەرمی بناسرێ، بۆ ئەوەی چاوەڕوانییەکان لەوان واقعبینانە بن. ڕێوشوێنە حقوقییەکان لەسەر بنەمای وانە ئایینەکانو گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی کۆمەڵایەتی کۆبکرێتەوەو سیستمێکی بەڕێوەبەریی بەهێز دابمەزرێ.

**کۆبەند:**

1ـ فمینیزم، بزووتنەوەیەکی ڕێکخراوەییە کە لەسەر بنەمای فەلسەفەی ڕۆژئاوا، داڕێژراوەو ئامانجەکەشی نەهێشتنی هەموو جۆرە زوڵمو ستەمێك لەسەر ژنانو وەدەستهێنانی مافەکانیان لە سیستمی کۆمەڵایەتیدایە.

2. فمینیسم ڕەوتێکی ئۆمانیستیە.

3. فمینیسم لە ڕۆژئاوادا بە هۆی دووری ژن لە لایەنی مەعنەویو لەبەر ئەوەی کە بە باشی دانەڕێژراوەو تیۆریزە نەکراوە، لە ڕۆژئاوادا ئێستا شاهێدی زۆرترین ڕادەی توندو تیژیو بەکەم گرتنی ژنانین، سووکایەتیی کردن، چەوسانەوەی ئابووریی، ڕووتو قووت کردنەوەی ژنە جوانەکانو دانایان لە پشتو نێرینەکان بەکەرەستە کردنی ڕەگەزی مێینە، ئەو نموونانەن کە شوناسی فمینیسمی بردۆتە ژێر پرسیار.

4. زوڵمو بەکەم گرتنی ژیارە کۆنەکان، بیری چەواشەکارانەی خاوەنانی سەروەتو سامانو دەسەڵات، بیروبۆچوونی دواکەوتووانەو چەوسانەوەی سیستمی سەرمایەداری، لەو هۆکارانەن کە بوونەتە هۆی ڕابوونی ژنانو پێکهاتنی بزووتنەوەی فمینیسم.

5ـ دەبێ هۆی جۆراوجۆریی لایەنگری فمینیستی بگەڕێنیتەوە بۆ لایەنگریی ئەوان لە ئەندێشە سیاسیو فەلسەفییەکانی ڕۆژئاوا، هەر لایەنگریو مەیلێکی فمینیستی بە پێی ئەو ڕوانگەیە، کێشەکانی ژنان لێك دراوەتەوە.

6. لە قۆناغی ئایدیاو ئامانجدا، هەموو لقە فمینیستیەکان خوازیاری بەرابەریی ژن لە هەموو بوارە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانو لابردنی دەسەڵاتخوازیی ڕەگەزی، بەربەرەکانیی لەگەڵ دژە پیاوی، کۆتایی هێنان بە جیاوازیدانانو توندو تیژی دژی ژنان بە یەکێك لە ئامانجەکانی خۆیان دەزانن، بەڵام زۆربەی ئەم ئامانجانە، تەنیا هەر لە ئاستی بیرۆکەو زەیندا ماوەتەوە.، بەکردەکی بەڕێوە نەچوون.

7. فمينيسمی ئيسلامی، دياردەيەكی نوێيە كە لەسەر بنەمای سيكۆلاريزمو نوێخوازی لە كۆمەڵگا ئيسلامييەكاندا بنيات نراوەو كەوتۆتە لێكدانەوەو راڤەی وانە ئايينييەكانو بەراوردكردنی بابەت ناسينی مەسەلەكانی ژنانو لەوەڕا كە لەگەڵ بارودۆخی ئايينی، كولتووریو كۆمەڵايەتيی كۆمەڵگا ئيسلامييەكان ناتەبايە، نەيتوانيوە وەڵامدەری پێداويستيەكانی ژنی موسڵمان بێ، فمينيسم لە بواری جيهانبينی لەگەڵ ئيسلامدا بۆ بەراورد كردن ناكرێ. ئيسلامو فمينيسم دوو چەمكی تەواو جيا لە يەكترن، بنەماو ئيدئۆلۆژيیو ئامانجو كاركردی جياوازيان هەيەو هيچكات پێكەوە ناگونجێن.

8. گرينگترين ئامانجەكانی فمينيسم، هەوڵ بۆ نەهێشتنی هەر جۆرە جياوازيدانانو هەڵاواردنێك دژی ژنان، وەدەستهێنانی بەرابەريی حقووقی، يەكسانيی ژنو پياو، يەكسانی لە مافو حقوقدا، يەكسانيی رەگەزيیو بەفەرمی ناسينی (*Homosexual*)و لەبار بردنی كۆرپەڵە.

**سەرچاوە:**

سايتی: ***www.ariayemusic.com***

SARDAM No. 49 2007

# میتۆدەکانی زانستی سیاسەت

عبدالرحمن عالم

لە فارسییەوە: محەمەد کەریم

**1-مەسەلەی میتۆدۆلۆژیا:**

هەتا پێش سەدەی نۆزدە زانستی سیاسەت وەکو بەشێکی زانکۆ، تەنها لە سوید هەبوو، پاشان لە ئەمریکا و دواتر لە ولآتەکانی تر سەریهەڵدا. سەرهەڵدانی وەکو بەشێکی زانستی سەربەخۆ و نوێ، ئەنجامی رزگاربوونی زەین و بیری خۆرئاوا بوو لە سیستمە سەرو سروشتیەکان. ئەم سیستمانە دیاردە کۆمەلآیەتیەکانیان کردبووە پاشکۆی (بیری سەرو سروشتی و ڕاستیە ئەخلاقیەکان)[1]. هۆکاری سەرەکی ئەم رزگاربوونە، بەکارهێنانی میتۆدی زانستی بوو لە لێکۆڵینەوە کۆمەلآیەتیەکاندا.

لە دێرزەمانەوە، بیریارە سیاسیەکان بایەخیان بە مەسەلەی میتۆدولۆژیای لێکۆڵینەوە سیاسیەکان دابوو. ئەفلاتون، ئەرستۆ، مەکیاڤیللی، بودین، هۆبز، ڤیکۆ، مۆنتسکیۆ و کەسانی تر، هەریەکەیان پرەنسیپ و میتۆدی تایبەتی خۆیان هەبوو. لە دوای گەشەکردن و گۆڕانی لێکۆڵینەوە سیاسیەکان وەکو لقێکی زانستی سەربەخۆ، مەسەلەی میتۆدولۆژیا بە جدی بایەخی پێدرا. ئۆگەست کۆنت باوەڕی وابوو کە تەکنیکە راستەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی دیاردە کۆمەلآیەتیەکان بریتین لە بینین و ئەزموون و بەراوردکاریی. لەلایەکی ترەوە جۆن ستوارت میل باوەڕی وابوو ئەزموون میتۆدی ئەندازیاریی ڕووت گومڕامان دەکەن و تەنها میتۆدی راست بۆ لێکۆڵینەوەی سیاسی، میتۆدی پێوانەکاری دیاریکراوو میتۆدی مێژووییە. بەهەمان شێوە (بلونشلی – *Bluntschli*) باوەڕی وابوو تەنها میتۆدە مێژوویی و فەلسەفیەکان راستن، ئەگەرچی دژی بەکارهێنانی میتۆدی

ئەزمونگەریی نەبوو شانبەشانی میتۆدی فەلسەفی – مێژوویی. سیلی لایەنگری میتۆدی (ئیستقرائی) دەکرد. جەیمس بریس (*bryce*) دەیوت میتۆدە راستەکان بریتین لە بینین، ئەزموون، میتۆدی مێژوویی و پراکتیکی[2]. گارنەر لەگەڵ ئەوەدا کە میتۆدەکانی تری بێبایەخ نەدەزانی، بایەخی بە میتۆدی پراکتیکی و بەراوردکاریی دەدا کە بە باوەڕی ئەو " هێندە بەرفراوانە کە پرۆسەی عەمبارکردن، رێکخستن، چینبەندی، هاوئاهەنگی و فرێدان و بەراوردکاریش لە خۆ دەگرێ" بەم پێیە وا ڕای دەردەبڕی کە میتۆدی مێژوویی تەنها "شێوەیەکی تایبەتیە لە میتۆدی پراکتیکی"[3].

چارلز مەریام، چوار قۆناغی سەرەکی و رەوتی گەشەکردنی زانستی سیاسەت و میتۆدەکانی لە ئەمەریکا دەستنیشان کرد. بە قسەی مەریام هەتا ساڵی 1850 میتۆدی فەلسەفی و بەراوردکاریی جێگای بایەخی زۆربوون. لە ساڵی 1850 تا 1900 میتۆدی مێژوویی و پراکتیکی بەکارهێنران. لە 1900 تا 1923 تێڕوانین (مشاهدە) و لێکۆڵینەوەو پێوانەکاریی ئەو میتۆدانە بوون کە چەندان جار بەکارهێنران. لە 1923 بەدواوە، لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆجیای دیاردە سیاسیەکان بەشێوەیەکی فراوان پەسەندکرا. ئەگەر گۆڕانە زانستیەکانی سەراپای جیهان لەبەرچاو بگیرێ، ئاشکرا دەبێ کە ئەو میتۆدانەی ناویان هات هەموو مامەڵە و میتۆدە جۆراوجۆرەکانی لێکۆڵینەوەی سیاسی لەخۆناگرن. دەتوانرێ ئاماژە بۆ میتۆدی دیالەکتیکی مارکسیزمیش بکرێ کە دیاردەکان لە پەیوەندیی ناوەکی و بەرامبەردا هەڵدەسەنگێنێ[4].

مۆنتی پاڵمەر و هاوکارانی، بەکارهێنانی میتۆدی زانستییان لە لێکۆڵینەوەی سیاسیدا وەکو لێکۆڵینەوەکانی دیکە بە پێویست زانی و بۆ ئەم میتۆدە، لەبەرچاوگرتنی ئەم خاڵانەی خوارەوەیان داواکردووە کە دەبێ هەموو میتۆدێکی زانستی ئەم خاڵانەی تێدا بێت:

1–پێناسەی وردی زاراوە زانستیەکان و چەمکە سەرەکیەکان.

2–لێکۆڵینەوەکە دەبێ لە قاڵبی ئەو تیۆرانەدابێ کە قابیلی ئەزمونن.

3–لێکۆڵینەوەکە دەبێ قابیلی دووبارەکردنەوە بێت.

4–لێکۆڵینەوەکە دەبێ لەو دەمارگیرییە بەدوور بێ کە لە بەها تایبەتییەکانی توێژەرەوە سەرچاوە دەگرن[5].

دەتوانرێ بگوترێ کە هیچ مامەڵە و میتۆدێك بە تەنیا ناتوانێ بەشێوەیەکی گونجاو لە مەسەلەکانی مەیدانی زانستی سیاسەت بکۆڵێتەوە. لەم ڕووەوە مەسەلەی میتۆدۆلۆژیا بایەخێکی زۆری هەیە، چونکە دەبێ بە بەکارهێنانی میتۆدێ یان چەند میتۆدێکی گونجاو لە دیاردە سیاسیەکان بکۆڵرێتەوە. بەبێ بەکارهێنانی میتۆد، زانینی دیاردە سیاسیەکان قورس دەبێ، بەهای ئەنجامەکانیش بەندە بە میتۆد و شارەزاییەوە لە بەکارهێنانی میتۆددا.

ئەگەرچی خودی زاراوەی (میتۆد) لە تەمومژ بەدوور نییە، بەڵام دەتوانین بڵێین بریتییە لە کردەوەی عاقڵانە و لۆجیکی زەین لە ڕێگەی

گەڕان بەدوای زانست لە واقیعدا، لە مانا هونەریەکەیدا، بۆ کۆکردنەوەی پێدراوەکانیش بەکاردێت، هەروەها دەشێ بەمانای ئەو کەش و هەوا گشتیەش بێت کە بەسەر بەدواداچوونی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەدا زاڵە. لە زۆر لایەنەوە میتۆد روانگەی لێکۆڵەر یان توێژەر دەردەخات.

**2-میتۆدەکانی زانستی سیاسەت:**

میتۆدە پەسەندکراوەکان یان کارپێکراوەکان، بریتین لە:

أ-میتۆدی مێژوویی.

ب-میتۆدی بینین.

ج-میتۆدی ئەزمونگەریی.

د-میتۆدی پراکتیکی یان بەراوردکاریی.

هـ-میتۆدی فەلسەفی.

بەکورتی لە هەریەکە لەم میتۆدانە دەکۆڵینەوە.

**أ-میتۆدی مێژوویی:**

ئاشکرایە کە رەگ و ریشەی زۆر لە رووداوەکانی ئەمرۆ دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو. لەم ڕووەوە، لێکۆڵینەوەی زانستیانەی دیاردەو دەزگا سیاسیەکان، شێوازی مێژوویی دەکات بە شتێکی پێویست. بەهای شێوازێکی لەمجۆرە لەو راستیەدایە کە نەك تەنها رابردوو روون دەکاتەوە و ئەو توانایەمان پێدەبەخشێ چەند ئەنجامێك بەدەست بێنین کە شایانی متمانە بێت بەڵکو چەند پرنسیپێکی بنەڕەتی بۆ خوێندنەوەی ئاینده فەراهەم دەکات. لە رۆژگاری هاوچەرخدا، چەند بیریار و توێژەرێکی پێشرەو و دیار مێتۆدی مێژووییان بەکارهێناوە لەوانە دەتوانین ناوی باتیستاڤیکۆ و مونتسکیۆ و ساڤنی و هێنری ماین و جۆن سی لی و فریمان بهێنین.

مرۆڤەکان ئەزموونی نەوەکانی پێشوو – میراتی کۆمەڵایەتی – هەڵدەگرن و دەیپارێزن. مێژوو، بریتیە لە تۆمارکردنی ئەزموونەکانی رابردوو. بۆچوونێکی بێهوودەیە ئەگەر وا بزانرێ بەبێ لێکۆڵینەوە پێشینەکان دەتوانرێ راستی بەدەست بهێنرێت. لە ڕاستیدا شێوازی مێژوویی ئاسۆی بیرکردنەوە فراوانتر دەکات و روانین چاکدەکات و دیدگایەك سەبارەت بە رووداوەکان دەهێنێتە ئاراوە کە دەتوانرێ بە هەستی مێژوویی ناوبرێ. هەر بۆیە هەندێك سوورن لەسەر ئەوەی کە میتۆدی لێکۆڵینەوەی زانستی سیاسەت دەبێ مێژوویی بێت. لە روانگەی ئەمانەوە، لێکۆڵینەوەی واقیعی مێژوویی بەشێکی لە جیابوونەوە نەهاتووی فێرکردنی سیاسییە.

بە باوەڕی ئەرستۆ و (مارکسیش) بۆ زانینی هەرشتێ دەبێ قۆناغەکانی سەرەتا و گۆڕان و گەشەکردنی ئەو شتە ببینین (مارکس پەیوەندیی بەرامبەری ناوەکیشی دەخاتە سەر) دەوترێ ئەم میتۆدە دروستکەرە، بنچینەی زانینی دەزگا سیاسیەکانە.

بەڵام دەبێ لە بەکارهێنانی میتۆدی مێژووییدا زۆر وریا بین، چونکە رەنگە ببێتە هۆی گەشبینیەکی فکری سەبارەت بەوەی کە ئێستا روودەدات، یان بەردەوامە، لە هەموو شتێ باشترە. دەبێ سەبارەت بەم گەشبینییە ئاگامان لە کامڵبوونی مێژوویی بێت. مێژوو دەتوانێت پرۆسەکە دەست نیشان بکات، بەڵام

نـــاتوانیٚ بـــەهای ئـــەنجام دیـــاری بکـــات. مێژوو بریتییە لە تۆمارکردنی شتێك کە بووە و چۆن هاتۆتە ئاراوە، ناتوانێت بڵێت کە دەبیٚ ببیٚ بەچی.

هەڵـەی "پەرەسـەندوخوازەکان" ئەوەیـە کـە زیـادەڕەوی لــە بایەخــدان بــە تەعمیرکردنــدا دەکـەنو ئـەو ڕاسـتیە لەبەرچـاو نـاگرن کـە کامڵبوونی مرۆڤ تەنها یەك ڕێگای نییە. دەبیٚ ئــەو بــاوەڕە زۆر بــاوە بخرێتــە ســەر ئــەم کەموکورتیە کە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە. لە ڕاستیدا ئەم باوەڕە نیوەی ڕاستیە، نیوەکەی تـری ئەوەیـە کـە مێـژوو هـەرگیز خـۆی دووبـارە ناکاتــەوە. هەلومــەرجی ڕوودانــی ڕووداوەکــان هـیچ کـاتیٚ دووبـارە نابێتـەوە. بـەم پێیە ئەگـەر یـەکێك بڵێت ئـەوەی لـە ڕابـردوودا ڕوویـداوە لـە ئایندەشــدا ڕوودەداتــەوە، کاولکــەری گیــانی زانستیانەی توێژینەوەکەیە.

**ب-میتۆدی بینین (مشاهدە):**

ئەم میتۆدە، هـەروەکو لـە ناوەکەیـەوە دیـارە، بریتییە لە بەوردی بینینی ئەو دیاردانـەی لەبەر لێکۆڵینەوەدان. لۆرانس لۆویـل (*L. Lowell*) زۆر جـەختی لـە توانـای بینـینی زانسـتی سیاسـەت دەکردەوە، جەختکردنەوەکەی بەهیچ شێوەیەك بێهۆ نییە، چونکە بەشێکی گرنگ لە لێکۆڵینەوە سیاســیەکان لــە شــیکردنەوەی ئــەو دەزگــا سیاسیانە پێکدێت کە لە ئارادان و ئـەم کـارەش پێویـستی بـە ئـەنجامی بینـینی بێگومانـە. بـە بینـــینی ڕاســـتەوخۆ و چـــاوپێکەوتن لەگـــەڵ یاســـادانەران و سیاســـەتمەداراندا دەتـــوانریٚ باشــتر لــە ڕووداوە سیاســیەکان بکۆڵرێتــەوە.

زانیـاری ناڕاسـتەوخۆ دەشـیٚ جێگـەی متمانـە بێت یـان نـا. جـەیمس بـریس سـەردانی هـەموو ئـەو وڵاتانـەی کـرد کـە دەیویـست لـە دەزگـا سیاسـیەکانیان بکۆڵێتـەوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە چاوی بەکاربەدەستانی ئەم وڵاتانە کەوت. ئەمە بـووە هـۆی ئـەوەی لـە نزیکـەوە کـاری دەزگـا سیاسـیەکان ببـینیٚ و سـەبارەت بـە واقیعـی کارکردنیـان زانیـاری بەدەسـتبێنیٚ[6]. هارۆڵـد لاسکیش هەوڵیدا سوود لەم میتۆدە ببینیٚ. بەم پێیــە بایــەخی بینــینی ڕاســتەوخۆ تــەواو لەبەرچاوە.

بـەڵام میتـۆدی بیـنین دژواری زۆری هەیـە. سـی لـی بـە دەستنیـشانکردنی ئـەم دژواریانـە ڕایگەیاند کە زانینی ڕاستەقینەی ڕاستیەکان لە زانـستی سیاسـەتدا لـە زانـستەکانی تـر پـڕ زەحمـەتترە. لاسـکی تـا ئـەویٚ ڕۆی کـە وتـی تەنانـەت ئـەو کەسانەی کـە لـە نزیکـەوە پرۆسـە سیاسیەکان دەبینن ڕەنگـە لـە داوەریـی خۆیانـدا هەڵـە بکـەن، چونکە پرۆسـە سیاسـیەکان " زۆر لـەو شـافە سـەهۆڵە دەچن کـە بەسـەر ئاوەوەیـە، ئـەوەی لەسـەرئاوەکە دەبینـریٚ تـەنها بەشـێکی بچووکە لە ڕاستی گـەورەی ژێـر ئاوەکـە". کـاتیٚ جیهان بینی بینەر و لاوازییە تایبەتیەکانی کار لـە مەسـەلەی بیـنین دەکـەن، دژواریـی میتـۆدی بیـنین زیـاتر دەبیٚ. بینـەر بـە سـەختی دەتـوانیٚ بێلایـەن بێت، چونکە ئەزموونـە تایبەتییـەکانی کاریـان لـە زەیـنی کـردووە و بـەو زەینـەوە لـە واقیعی بەردەمی خۆی دەڕوانیٚ و دەیبینیٚ.

دژوارییەکی دیکەش هەیە. بینـەری سیاسـی ڕەنگــە ئــەو خەیاڵــەی هــەبێت کــە وەکیــەکی دەسـکرد و تـەعمیمی بـەرفراوان بـەکاربێنیٚ کـە

لەسەر واقیع بنیات نەنرابن. بەم پێیە راست بینینی و ناسینی واقیع و دڵنیابوون لێی بایەخێکی زۆری هەیە. جگە لەمەش رەنگە بینەر هۆی تایبەتی یان رێکەوت لەگەڵ هۆی گشتی یان راستەقینەدا تێکەڵ بکات و بکەوێتە هەڵەوە. تەنها بینەرێکی بە توانا کە دیدێکی پڕ بایەخی هەبێ و هوشیارانە داوەریی بکات دەتوانێت ئەنجامی راست و دروست و جێی متمانە بەدەست بێنێ.

## ج-میتۆدی ئەزموونگەریی

ژمارەیەك لە توێژەرانی سیاسی سەبارەت بە توانای ئەزموونگەریی زانستی سیاسەت دوو دڵییان نیشانداوە. ستوارت میل و لاڤیل و ڤیگان، لەو بیریارانەن کە باوەڕیان وایە میتۆدی ئەزموونگەریی لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا قابیلی جێبەجێکردن نییە و لە زانستی سیاسەتدا ناتوانرێ وەکو لێکۆڵینەوە لە فیزیا یان لە کیمیادا ئەزموون و تاقیکردنەوە بکرێ. کیمیاگەر دەتوانێ بەجیا ئەو مادانەی کە دەیەوێ لێیان بکۆڵێتەوە بیانخاتە ژێر جۆرەها کاریگەرییەوە. بەڵام ئەمە لەگەڵ مرۆڤدا ناکرێ، چونکە ناکرێ مرۆڤ لە دەوروبەرە کۆمەڵایەتیەکەی جیا بکرێتەوە و لە تاقیگەدا بخرێتە بەر بزوێنەر و پاڵنەری دیاریکراوەوە و لە هەمان کاتدا چاوەڕێی ئەوەی لێبکرێ رەفتاری ئاسایی بێت. جگە لەوەش ناتوانرێ بەشێك لە کۆمەڵ لە سەراپای کۆمەڵ جیابکرێتەوەو بخرێتە تاقیگەوەو کاریگەریی فاکتەرە جۆراوجۆرەکانی لەسەر تاقیبکرێتەوە.

لە زانستە تاقیگەییەکاندا توانای دووبارەکردنەوەی تاقیکردنەوە هەیە بۆ ئەوەی ئەنجامێکی دیاریکراو بەدەست بهێنرێ. بەڵام لەگەڵ دیاردە سیاسییەکاندا ناتوانرێ ئەوە بکرێ. چونکە ناتوانرێ هەلومەرجی سیاسی رووداونی رووداوێك بەو شێوەیەی کە بووە، دووبارە بکرێتەوە. هەر رووداوێکی سیاسی یەکجار بۆ هەمیشە سەرهەڵدەدات و هەرگیز بەو شێوەیەی کە بووە دوبارە نابێتەوە[7].

لە دیاردە سیاسییەکاندا، چەند فاکتەرێکی وەکو بیروباوەڕ و پاڵنەر و هەستە مرۆییەکان کاریگەرییان هەیە کە بە ئاسانی لێکۆڵینەوەی ئەزموونگەریی و بابەتییان لەسەر ناکرێت و جاریوایە لە بنەڕەتەوە کاری کردە نییە.

بە حسابکردن بۆ ئەو تایبەتمەندیانەی باسکران دەتوانرێ یەکسەر بگوترێ و قبوڵ بکرێ کە هەڵسەنگاندن و ئەزموونی (زانستی) لە زانستی سیاسەتدا کاری کردە نییە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانرێ هەمیشە ئاگایانە یان نائاگایانە ئەزموونی سیاسییەکان بونیان هەبووە. هەروەکو ئۆگەست کۆنت وتوویەتی هەر گۆڕانێکی سیاسی جۆرێکە لە ئەزموون. هەر یاسایەکی نوێ کە پەسەند دەکرێ، هەر سیاسەتێکی نوێ کە پیادە دەکرێ و هەر گۆڕانێك کە لە پێکهاتە و دەزگای سیاسیدا دەکرێ لەو رووەوە کە شتێکی تەواو کاتین، ئەزموونین. پەسەندکردنی کۆتایی و دەست نیشانکراویان بەندە بەوەوە کە بسەلمێنرێ گونجاون. ئەگەر بە کردەوە ئاشکرابێ نەگونجاون و ئەگەری ریفۆرمیش نییە و لەگەڵ شکست هێنانیاندا دەستیان لێهەڵدەگیرێ. بەڵام

تەنانــەت ئەگــەر چــەندان ئــەزموونی سیاســی رووبــەرووی شکــستیش ببنــەوە، لــەمبارەدا، زانیاری و وانە و پەندی بەهادارمان دەدەنێ و یارمــەتیمان دەدەن چــەند ئــەنجامێکی بــاش بەدەست بێنین.

کەواتـــە، زانـــستی سیاســـەت توانـــای ئەزموونگـــەریی هەیـــە بـــەڵام نـــەك بـــە مانـــای تاقیکردنـــەوەو ئەزموونـــە کـــۆنترۆڵ کراوەکانی تاقیگە، بەڵکو لەو مانا دیاریکراوەدا کـە دراوە راســت و ناڕاســتەکان لــە بینــینی راســتەوخۆ و لــە ئــەزموونی تایبــەتی و لــە مێــژووی هاوچــەرخەوە بەدەســت دێــن. بــە حــسابکردن بــۆ ئــەم مانایەیــە کــە دەتــوانرێ بگوترێ، مێژوو تۆمارکەری ئەزموونەکانە کە لە رووبەرێکی فراواندا روویان داوە.

### د-میتۆدی پراکتیکی یان بەراوردکاریی

ئەم میتۆدە تەعمیم لە خۆ دەگرێ لە رێگای بەراوردکردنەوە. ئەم میتۆدە دەتوانرێ هەم بۆ لێکۆڵینـــەوەی دەزگـــا و بـــیر و بۆچـــوونە سیاسیەکانی وڵاتێك لە قۆناغە جیاجیاکاندا و هەم بۆ خوێندنەوەی دیاردە سیاسیەکانی وڵاتە جیاجیاکـــان بـــەکاربهێنرێت. لـــە هـــەردوو لایەنەکــەوە، بنــەمای میتۆدەکــە بریتییــە لــە حسابکردن بۆ ئەو خاڵە جیاواز و لێکچوانەی کـــە دەشـــێ لـــە بـــارودۆخ و هەلومـــەرجی کۆمەڵایەتیی ئەو دەوڵەتانەدا هەبن کە بەراورد دەکـــرێن. پێکهاتـــەی گونجـــاوی پرۆســـەی پراکتیکی و بەراوردکاریی لەگەڵ پرۆسەکانی دیکەی لۆجێك و بەڵگە هێنانەوە دەبێتە هۆی بەهێزکردنیان. کاتێ لێکۆڵینەوەی پراکتیکی لەگەڵ لێکۆڵینەوەی مێژوویی یان بینین ئاوێتە بکرێ، زۆر لە کێشە و کۆسپەکانی بەردەمیان لەناو دەبات. ئەم میتۆدە لایەنگرانی ناوداری وەکو ئەرستۆ و مۆنتسکیۆ و بریسی هەیە.

لایەنێکی تایبەتی لە میتۆدی بەراوردکاریی، بریتییە لە میتۆدی نموونە هێنانەوە. شێوەی ئاشکرای ئەم میتۆدە، بریتییە لە لێکۆڵینەوەی دەوڵــەت وەکــو کۆمــەڵێ شــتی زینــدوو یــان ئۆرگانی، شانبەشانی مرۆڤ وەکو بەشێك لێی، ئەم میتۆدە بە یارمەتی تیۆری کامڵبوون، کە لە بایۆلۆجیا و سوسیۆلۆجیادا هەیە، هەوڵ دەدات لە دەوڵــەت بکۆڵێتــەوە. لــەم میتــۆدەدا هــەموو شتێ بە دەربڕینی شێوەکەی یان خستنەڕووی وێناکردن شەرح دەکرێ و بە نیشاندانی چەند نموونەیــەك لــە ئۆرگــانیزمی زینــدوو، چــەند ئەنجامێك بەدەست دێت. بەڵام مرۆڤ وەکو ئاژەڵ کۆمــەڵ نییــە، بــەڵکو بــۆ خــۆی بوونــەوەرێکی سیاســیە. ئــەفلاتون لــە یونــانی کۆنــدا ئــەم میتــۆدەی بــەکارهێنا (بــەڵام نــەك لەلایــەنی کامڵبوونــەوە) لــە ســەردەمی نوێــشدا ئۆگەســت کۆنــت و هێربــەرت سپنــسەر و کەســانی دی بەکاریان هێنا، بەڵام نموونە هێنانەوەکان تیایدا شوێنێکی نییە.

میتـــۆدی نموونـــەکاریی، شـــێوازێکی نازانستیە و زیاتر لەوەی رۆشنکەرەوە بێت دەبێتە هۆی سەرلێشێوان لە باسی دیاردە سیاسیەکاندا. ئەفلاتون بەشێوەیەکی فراوان نموونـەی بـەکارهێنا، بـەڵام باسـی مەسـەلە ئینسانیەکانی گەیاندە ئاستی باسێك دەربارەی جیهانی چەند ئاژەڵێکی وەکو دێڵە سەگ و ماین. ئەم کارە ئەوەی ئاشکرا کرد کە ئەگەر

بەکارهێنانی نموونە جاری وایە دەبێتە هۆی روونکردنەوەی مەسەلەکە، بەڵام نابێ زۆر قووڵ بکرێتەوە، بەم شێوەیە نەبێت، چەند ئەنجامێکی ناڕاست بەدەست دێت. هێربەرت سپنسەریش نموونەی کلاسیکی بەکارهێنانی ناراستی ئەم میتۆدەیە. تیۆری سپنسەر دەربارەی ئۆرگانیزمی دەوڵەت کەموکورتی زۆر تێدایە. رەنگە دەوڵەت وەکو ئۆرگانیزمێك وابێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە تەنها دەزگایەکی وانییە. لە ئەنجامدا، بەکارهێنانی میتۆدی نموونەکاریی لەلایەن سپنسەرەوە زیاتر بووە هۆی سەرلێشێوان تا رۆشنکردنەوە. بەڕای (بارکەر) نابێ ئەوە لە بیر بکرێ کە ئیستیعارە و لێکچواندن، بەڵگەهێنانەوە نییە، و دروست کردنی هاوسەنگیی نێوان دەوڵەت و تاکەکەس و پەیوەندییەکانیان روون ناکاتەوە[8]. بەم پێیە ئاشکرایە کە دەبێ لە بەکارهێنانی ئەم میتۆدەدا وریایی بەکاربهێنرێ[9].

**هـ-میتۆدی فەلسەفی**

ئەو میتۆدانەی کە تا ئێستا باسیان لێوەکرا، بەشێوەیەکی سەرەکی ئیستقرایین، بەڵام میتۆدی فەلسەفی بەراوردکارییە. ئەم میتۆدە بە لەبەرچاوگرتنی چەند پرەنسیپێکی بەڵگەنەویستی دیاریکراو دەستپێدەکات، لەگەڵ پرۆسەی بەڵگەهێنانەوەدا بەرەو پێش دەچێت، هەوڵدەدات تیۆرێك دەربارەی دەوڵەت و حکومەت بەدەستەوە بدات. ئەم شێوازە لە باسکردنی فەلسەفەی سیاسیدا بەشێوەیەکی نادیار بوونی هەیە. ئەفلاتون و تۆماس مۆر و جان جاك رۆسۆ و هیگڵ و گرین و بوسانکێ و سجویك ژمارەیەکن لەلایەنگرە دیارەکانی ئەم شێوازە. هەندێ لەم بیریارانە سەیری واقیعە سیاسییەکانیان نەدەکرد و چەند تیۆرێکیان هەڵهێنجاوە کە لە خەیاڵیانەوە هەڵقوڵاوە و ئەوە نیشان دەدات کە واقیعی نەبوون. تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنیان سەبارەت بە دیاردە سیاسییەکانی رۆژگاری خۆیان نازانستی و ناڕاست بووە. ئەم شێوە زانینە، گومانێکی ماقوڵی سەبارەت بە ماهیەتی زانستی ئەم میتۆدە قوتکردۆتەوە. بۆ نموونە، جۆن ستیوارت میل بەبێ هیچ موجامەلەیەك (میتۆدی بەراوردکاریی رووت)ی ڕەتکردەوە و نکوڵی لەو ئیدیعایە کرد کە میتۆدێکی راست و دروستی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە. کەسانی تریش دەربارەی متمانەی زانستی ئەم میتۆدی لێکۆڵینەوە، گومانیان هەبووە.

لەم رەخنانەدا راستیەك خۆی حەشارداوە. لە لێکۆڵینەوەی دیاردە سیاسییەکاندا بیرکردنەوەی میتافیزیکی هەمیشە یارمەتیدەر نییە. بەڵام وتنی ئەوەی کە لە لێکۆڵینەوەی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا میتۆدی فەلسەفی جێگایەکی نییە. بەدحاڵیبوونە لە ماهیەتی ئەم زانستانە. زانستە کۆمەڵایەتییەکان لایەنێکی میتۆدییان هەیە و زیاتر بەهایان پەیوەستە بەو لایەنەی لێکۆڵینەوەوە. ئەم لایەنە هەڵگری هەڵسەنگاندنی فەلسەفی بنەماکانی دەوڵەت و فۆرمەکانی دیکەی ئەو رێکخراوانەیە کە خوازیاری نفوز و دەسەڵاتن. لەم بارەیەوە، باسێکی نموونە سەرەتاییەکان دەکرێ و پاشان ئەو دەزگایانەی هەن لەبەر رۆشنایی باسەکەدا حوکمیان لەسەر دەدرێ و لە بەرامبەر ئەوەدا کە

پێویستە دادەنرێن. بۆ نموونە، سجویك باوەڕی وایە کە یەکەم ئامانجی زانستی سیاسەت ئەوەیە کە ئەمە دیاری بکات دەبێ چی رووبدات، یان رەوتی ئایندەی کار دەستنیشان بکات، دیارە ئەم ئامانجە ناتوانرێ بە میتۆدی ئیستقرائی لێکۆڵینەوە دیاری بکرێ. تەنانەت ستیوارت میلیش حەزی بە قبوڵکردنی "لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریی دیاریکراو" بوو. بەم پێیە بەڵگەیەك بەدەستەوە نییە کە میتۆدی بەراوردکاریی بەشێوەیەکی گشتی بە ناڕاست لە قەڵەم بدرێ، لەبەرئەوەی هەندێ لە لایەنگرانی خراپ بەکاریان هێناوە. ئەم کەموکورتیە لە میتۆدەکەوە نییە، بەڵکو کەموکورتی لەو کەسانەوەیە کە بەکاریان هێناوە(10).

لە ڕاستیدا دەتوانرێ بوترێ لە نێوان هەردوو ئاراستەی ئیستقرائی و بەراوردکاریدا ناکۆکییەك نییە و لە زۆر لایەنەوە، ئەم دوو ئاراستەیە تەواوکەری یەکترین. لە توێژینەوەی دیاردە سیاسییەکانی ئێستا و رابردوودا، ئاراستەکان دەبێت ئەزموونگەریی و شیکاریی و ئیستقرائی بن. بەلام هەرچی هەیە و هەبووە هەمیشە کامڵ نییە. هەندێ جار پێویستە چاك بکرێن. میتۆدی فەلسەفی لەو بنەما و پرەنسیپانە دەکۆڵێتەوە کە واقیعە سیاسیەکانیان پێ هەڵدەسەنگێنرێ، و پێشنیاز بۆ چاکسازی دەخەنە روو. میتۆدی فەلسەفی دەستنیشانکراو، جودا لە بیرکردنەوەی رووت، هەوڵدەدات پێوەرە بنەڕەتییەکان بخاتە بەردەست. زانستی سیاسەت، لە تێڕوانینیدا بۆ ئەو مەسەلانەی چەند رەهەندێکیان هەیە ناچارە ئەو ئاراستانەی هەبێ(11).

**3-هەندێ لە ئاراستەکان**

لە چەند روانگەیەکی جۆراوجۆرەوە دیاردە سیاسیەکان توێژینەوەیان لەسەر کراوە. هەندێ لە رووی یاسایی و دامەزراوەییەوە لێیان دەکۆڵنەوە و هەندێکی تر روانگەی ئابووریان هەیە. بۆ لێکۆڵینەوەی رەفتاری سیاسیش لە رووی سایکۆلۆجیاوە کۆمەڵێ هەوڵ دراوە. سەرەنجام ئاراستەی رێسایی و ئەزموونی و زانستیش هەن.

لێرەدا بە کورتی لەم ئاراستانە دەکۆڵینەوە.

**ا-ئاراستەی یاسایی**

ئاراستەی یاسایی بریتییە لە راڤەکردنی دیاردە سیاسیەکان لە رووی یاساییەوە. ئەم ئاراستەیە دەوڵەت وەکو کەسێکی یاسایی یان کۆمەڵەیەك بۆ دارشتن و جێبەجێکردنی یاسا دەبینێ. خودی مافناسەکان میتۆدێکی تایبەتیان نییە و سەر بە قوتابخانە جۆراوجۆرەکانن.

گرنگترین کەموکورتی ئەم ئاراستەیە ئەوەیە کە بواری کارکردنی تەسك و سنووردارە. لە راستیدا، ئەم ئاراستەیە بایەخ بە یاسا و فۆرم دەدات و پێگە و بایەخی هێزە کۆمەلآیەتییە جۆراوجۆرە نایاساییەکان لە رادەی بەراورد کەمتر نیشان دەدات، بێئەوەی دەرك بەوە بکات کە هەر جۆرە لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە دیاردە سیاسیەکان یەك لایەنە دەبێ.

ئەم قسەیە بە مانای نکوڵیکردن یان بەراوردی کەمتر لە رادەی بەشداریی ئاراستەی یاسایی نییە لە خوێندنەوەکاندا. مافناسەکان

تەنها چەمکەکانی شەخسیەتی یاسایی دەوڵەت و تیۆری فەرمانڕەواییان نەخستۆتە روو و بایەخیان پێنەداوە، بەڵکو لە توێژینەوەی یاسا بنەڕەتی و ئیدارییەکان و یاسا نێو دەوڵەتیەکاندا بەشدارییەکی پڕ بایەخیان کردووە.

### ب-ئاراستەی ئابووری

ئاراستەی ئابووری لە سەردەمی ئەرستۆوە لە ئارادا بووە. ئەرستۆ باوەڕی وابوو تایبەتمەندیی و دابەشکردنی سامان لە سەقامگیرکردنی فۆرمی حکومەتدا فاکتەرێکی چارەنووسسازە، کاری خەڵك کار لە بونیادی سیاسی و توانایان دەکات، شۆڕشەکان بە شێوەی ئاسایی بریتین لە رووبەرووبوونەوەی دەوڵەمەند و هەژارەکان[12]. جەیمز هارینگتون *j.Horreington*، لە کتێبەکەیدا کە ناوی (ئۆقیانووس *oceana*)ە (1656) ئەوەی دەربڕی کە دەسەڵات بەشێوەیەکی سروشتی و وەکو پێویست لە دوای سامان دێت. رۆبەرت دال دەنووسێت "دابەشکردنی دەسەڵات یەکسانە بە دابەشکردنی سامان"[13] و دامەزراوەی سیاسی ڕێك دەنگدانەوەی دامەزراوەی ئابوورییە. لە سەدەی هەژدەدا، جۆهان ئادامس *Johan adams* و جەیمز مێدیسۆن *James medison* لە ئەمریکا پەیڕەوی هەمان ئەندێشەیان دەکرد. بەڕای ئادامس کۆمەڵ دابەشبووە بەسەر چەند چینێکی دژبەیەکدا، لە ناڕاییبوونەوە بە مەبەستی بەدەستهێنانی پێگەی باشی ئابوورییە کە ناڕەزایی گەورەی سیاسی لە کۆمەڵدا، بە تایبەتی لە نێو دەوڵەمەندان و هەژاراندا سەرهەڵدەدات. بە قسەی مێدیسۆن ماف خاوەندارێتی "کۆسپێکی گەورەیە لەبەردەم هەماهەنگی بەرژەوەندییەکاندا" جیاوازی لە ڕادە و جۆرەکانی خاوەندارێتیدا کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر (هەست و بۆچوونی مرۆڤی داراو نەدار) و (کۆمەڵ دابەشدەکات بەسەر بەرژەوەندی و لایەنی جیاوازدا)[14].

ئەم ئاراستەیە لەسەر دەستی مارکس بوو بە ئامرازێکی بەهێزی شیکردنەوەو بوو بە فەلسەفەی پراکتیك. ئەگەرچی مارکس جەختێکی زۆری لە فاکتەری ئابووری دەکردەوە، بەڵام بایەخی هەموو فاکتەرە ماددییە نائابوورییەکانیشی ناساندەوەو باوەڕی وابوو کە شیکردنەوەی مێژوو یاساکانی کامڵبوون ئاشکرا دەکات و ئەو توانایەمان پێدەبەخشێ ئاقاری ئایندەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی پێشبینی بکەین. مارکس لە پشتیوانیی سەرسەختانەیدا بۆ نەهێشتنی هەژاری و ئیمتیازە چینایەتیەکان، ئاقاری گۆڕانە کۆمەڵایەتیەکانی لە هەلومەرجێکی کۆنکرێتی تردا دانا لەوەی کە دەبینرێ. ئامرازی شیکردنەوەی مارکس بە ماتریالیزمی دیالەکتیك ناودەبرێ کە لە حاڵی حازردا بەشێکی زۆر لە دەرچووانی کۆمەڵگا سۆسیالیستیەکان و شوێنانی تر ناوی خۆیان لە ژێریدا نووسیووە.

لە ئاراستەی مارکسیستیدا، ئەو هێزەی کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەبزوێنێ و روونی دەکاتەوە، بریتییە لە هەلومەرجی مادی ژیان و بەتایبەتی شێوازی بەرهەمهێنان. فاکتەرەکانی ململانێی چینایەتی خۆیان لە شێوازی بەرهەمهێنانەدا حەشارداوە. هەر شێوازێکی

بەرهەمهێنان، ڕێسای پەیوەندی بەرهەمهێنانی تایبەتی خۆی هەیە. ململانێی چینایەتی شانبەشانی گۆڕان لە شێوازی بەرهەمهێناندا، جوڵانە مێژووییەکان دەهێنێتە ئاراوە. ڕێکخراوی سیاسی و یاساکان و ڕۆشنبیریی کۆمەڵ کەسانێکیان لەبەردەستدایە کە ئامراز و هۆیەکانی بەرهەم هێنانیان لەدەستدایە. بە قسەی مۆریس دوورژێ (پەیوەندی دیاردە سیاسیەکان بە سیستمەکانی بەرهەم هێنانەوە بەم شێوەیەیە:

(هێزەکانی بەرهەمهێنان و شێوەی موڵکداریێتی – چینە کۆمەڵایەتییەکان – ململانێی چینەکان – ناکۆکیە سیاسیەکان)[15] لە ئەنجامی بەریەککەوتنی بەرژەوەندییە ئابوورییەکاندا، دەزگاکان دەردەکەون و ریفۆرم سەرهەڵدەدات. فۆرمەکانی ئایدیۆلۆژیای – یاسایی، سیاسی، ئاینی، ئیستاتیکا و فەلسەفیش لەگەڵ گۆڕانی بنەما ئابوورییەکانی کۆمەڵدا گۆڕانیان بەسەردا دێت. لە فۆرمەکانی ئایدیۆلۆژیادا مرۆڤ سەبارەت بە ناکۆکیە ئابووری و چینایەتیەکان هوشیار دەبێتەوە و دەست بەخەبات دەکات[16]. بەم پێیە، هوشیاریو هەستی سەردەم دەبێ بەسەرنجدان لە دژایەتی ژیانی مادی و دژایەتی لە نێوان هێزە کۆمەڵایەتیەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان روون بکرێتەوە[17].

مارکس، بەشێوەیەکی دیاریکراو باوەڕی وابوو کە هەژاری نە ناچارییەو نە حوکمێکی خوداییە، بەڵکو لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی ژیانی خەڵکەوە سەرهەڵدەدات. لە دوای شۆڕشی پیشەسازی، توانای زیادکردنی بەرهەم تا ئەو ڕادەیە فەراهەم بوو کە هەژاری لەناو بچێت. بەڵام ئەم کارە پێویستی بە چەند گۆڕانکارییەکە لە هەلومەرج و پێکهاتەی کۆمەڵدا. چینی فەرمانڕەوا لە ڕووی ئابوورییەوە، حەز بە هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك ناکەن، خۆیان ناگۆڕێن و بە ئاسانیش ڕێگا بە گۆڕان نادەن. بەم پێیە، تەنها لە ڕێگەی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتییەوە دەتوانرێ چینی چەوسێنەر لە پێگەی دەسەڵات و ئیمتیاز دووربخرێتەوە. کاتێ شۆڕشەکە بە ئەنجام گەیشت، چەوسانەوەو ئەو چینە کۆمەڵایەتیەی پیادەی دەکات بەرەبەرە دوور دەخرێتەوە. شانبەشانی ئەمەش دیمەنەکانی دەسەڵاتی چینی چەوسێنەر لە شێوەی دەزگا و لە مەیدانی هوشیاری و ئایدیۆلۆژیدا لەناو دەچێت.

مارکس دەیوت بیریارانی پێشوو، زۆر باسی گۆڕانی مێژوویی ئەم ململانێ چینایەتییە و توێکاریی ئابووری چینەکانیان کردووە. بەڵام ئەوەی ئەم کردوێتی تەنها ئەوە بووە کە بیسەلمێنێ:

"1–بوونی چینەکان تەنها بە چەند قۆناغێکی مێژوویی تایبەت لە پەیوەندیی بەرهەمهێنانـدا دروست بووە. 2–ململانێی چینایەتی وەکو پێویست ئەنجامەکەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریای لێدەکەوێتەوە. 3–خودی ئەم دیکتاتۆرییە تەنها قۆناغی گواستنەوەیە بۆ سڕینەوەی هەموو چینەکان و کۆمەڵگای بێ چین"[18]. لەوێوە کە هەندێ جار زاراوە زانستیە مارکسییەکان دەبنە هۆی

سەرلێشێوان، دەبێ ئەوە روون بکرێتەوە، کە باوەڕی مارکس ئەودیوی شێوە جۆراوجۆرەکانی حکومەت، هەمیشە کۆمەڵێ چینن کە سەرکردایەتی دەکەن. مارکس بەناوی دیکتاتۆرییەوە ئاماژە بۆ ئەم سەرکردایەتیە دەکات کە لە هەموو شێوەکانی دەوڵەتدا هەن.

مارکسیەکان، لە نێوان (جۆرەها دەوڵەت) و (شێوەکانی دەوڵەت)دا جیاوازی دەکەن. بەڕای مارکسیەکان جۆرەها دەوڵەت لەگەڵ سیستمێکی چینایەتی دیاریکراودا دێتەوە. دەوڵەت چوار جۆرە: دەوڵەتی خاوەن کۆیلەکان، دەوڵەتی دەرەبەگایەتی (فیوداڵی)، دەوڵەتی بۆرجوازی و دەوڵەتی سۆسیالیستی. لەناو هەریەکێ لەم جۆرانەدا چەندین شێوەی حکومەت واتە رژێمی سیاسی هەن[19]. (دو ورژێ) دەربارەی پەیوەندی سیستمەکانی بەرهەم هێنان و شێوەکانی حکومەت یان رژێمە سیاسیەکان دەڵێت:

هەر سیستمێکی بەرهەمهێنان (یان شێوەی موڵکدارێتی) چەندان جۆر رژێمی سیاسی، واتە چەندان شێوەی ململانێی چینایەتی دەهێنێتە ئاراوە. دەوڵەتی خاوەن کۆیلەکانی سەردەمی کۆن جارێك ئیستبدادیی لە جۆری ئیستبدادی میسری یان ئێرانی، سەردەمێ حکومەتێکی دیکتاتۆری لە جۆری حکومەتی دیکتاتۆری یۆنان و سەردەمێ دیموکراسی لە جۆری دیموکراسی ئەسینا و سەروەختێ ئیمپراتۆریی لە جۆری ئیمپراتۆریی رۆم بوو. دەوڵەتی فیوداڵی، لەبەر نەبوونی ناوەندێتی بنیاتنراو لەسەر دەرەبەگی سەربەخۆ و لەیەك جیا بەرەو سستمێکی پاشایی مەرکەزیی لە جۆری (پاشایی) لویسی چواردە ملی نا. دەوڵەتی بۆرجوازی، جارێ دیموکراسی خۆرئاواییە و سەروەختی رژێمێکی فاشیستی، لە دەوڵەتی سوسیالیستی بنیاتنراو لەسەر دیکتاتۆری چینی کرێکاردا، دەتوانرێ سیستمی سۆڤیەت و رژێمە دیموکراسییە جەماوەرییەکان لە یەکتری جیابکرێنەوە[20].

بە باوەڕی لینین، ئەگەر کەسێ بیەوێ نەبێتە قوربانی هەڵخەڵەتاندن و خۆهەڵخەڵەتاندن لە سیاسەتدا، دەبێ "فێر بێت لەودیو دەستەواژەو پروپاگەندە و گۆتە ئەخلاقی و ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانەوە لە بەرژەوەندی هەندێ لە چینەکان تێبگات" دەبێ بزانێ کە هەردەزگایەك (هێزەکانی چینی فەرمانڕەوا پاراستوویانە) بەم پێیە تاکە رێگای زاڵبوون بەسەر خەباتی ئەم چینانەدا بریتییە لە "لەناوبردنی چینی کۆن و هێنانە ئارای چینی نوێ لە رێگەی شۆڕشی کۆمەڵایەتی سەرکەوتووەوە"[21].

لە نێو توێژەرە نامارکسیەکاندا کە بایەخیان بەشیکردنەوەی ئابووری سیاسەت داوە دەتوانرێ ئاماژە بۆ ئاشیل لۆریا *Achille Loria* کتێبەکەی (بنەما ئابوورییەکانی کۆمەڵ (1907)، و سی. ئەی. بێرد *C.A.Beard* و کتێبەکەی (پایەی ئابووریی سیاسەت (1922) بکرێ. زۆر لە توێژەرانی ئەم دواییەش بایەخێکی زۆریان بە فاکتەرە ئابوورییەکان داوە وەکو دەستنیشانکەری دیاردە سیاسیەکان، یان ئابووری سیاسی و لە بواری ئابووری سیاسیدا گەلێ وتار و کتێبیان نووسیووە[22].

## ج-ئاراستەی دەروونزانی

بەکارهێنانی دەروونزانی بۆ خوێندنەوەی سروشتی مرۆڤ و رەفتاری سیاسی مرۆڤ لە گۆڕانە نوێکانە. ئەمە بەو مانایە نییە بیریارانی سیاسی پێشوو ئاماژەیان بۆ سروشتی مرۆڤ نەدەکرد. لە راستیدا، چەند گریمانەیەك دەربارەی سروشتی مرۆڤ لە نووسینەکانی ئەفلاتون، مەکیاڤیللی، هۆبز، لۆك، رۆسۆ و بێنتام و کەسانی تردا هەیە. بەلاّم تەعمیمەکانی ئەمانە لەسەر هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی رێك و پێکی دەروونزانی بنیات نەنرابوو. ئاراستەی دەروونزانی بۆ لێکۆڵینەوەی دیاردە سیاسیەکان هەوڵدەدات ئەو کەم و کورتیانە نەهێڵێ. توێژەران و بیریارانی سەر بەم ئاراستەیە باوەڕیان وایە لێکۆڵینەوەی ئەو رووداوە بنەڕەتیانەی پەیوەندییان بە سروشت و رەفتاری مرۆڤەوە هەیە کاری کردەیە. ئەمانە دەیانەوێ تیۆرێکی سیاسی نوێ لەسەر پایەی بنەما جێگیرەکانی دەروونزانی بهێننە ئاراوە. لە راستیدا، لە ماوەیەك بەر لە ئێستاوە، کلیلەکانی دەروونزانی بۆ کردنەوەی دەرگای نهێنیەکانی هەڵسوکەوتی مرۆڤ بەکارهاتووە[23].

بناغەی ئەم جۆرە خوێندنەوانە لۆرانس لاویل داینا، و لاسویل ***Lasswell*** بوو بە هۆی بەرەو پێشچوونی گەورەتر و زیاتر لەم بوارەدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەروەکو رۆبسۆن وتویەتی وەزعی فیعلی دەروونزانی کۆمەلاّیەتی بۆ سیاسەتزان هێندە مایەی رەزامەندی نییە:

(هێندە زەمینەیەکی سەقامگیر بۆ بەدەستهێنانی زانیارییەکی بێچەند و چوون و رێکوپێك بەدەستەوە نادات کە بتوانی تیۆرەکانی رەفتاری سیاسی یان بینینەکانی رای گشتی لەسەر بنیات بنێیت. بەرهەمەکانی فرۆید و جێنشینانی، یۆنگ پەیرەوانی تێگەیشتنی ئێمەیان سەبارەت بە زیهنی مرۆڤ گۆڕیووە، شیکردنەوەی دەروونزانی کاری لە پێشکەوتنە شۆڕش ئاساکان کردووە لە تیمارکردنی پزیشکیی دەروونیدا -(الطب النفسي) - بەلاّم کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەخستۆتە سەر زانستی سیاسەت)[24].

ئەمەش لە کاتێکدایە کە زانستی سیاسەت، بەشێوەیەکی گشتی، لەم سالاّنەی دواییدا بەشێوەیەکی بەرفراوان بووە بە زانستێکی واقیعی و "بەسەر دەزگای رەسمی حکومەتدا کەمتر تەئکید لە بەکارهێنانی دەکرێتەوە و بایەخی پێ دەدریّ"[25].

واتکینس (*Watkins*) هەوڵیدا نیشانی خەڵکی بدات کە سیاسەتناس لە هەنگاوی یەکەمدا بایەخ بە رەفتاری ئەوان دەدات، چۆن بوونەوەرێکن. بە باوەڕی ئەو چالاکیەکانی خەڵك، چەند راستیەکن قابیلی بینن، و بە بەکارهێنانی میتۆدەکانی بینین ژێر کۆنترۆڵ و ئەزموون، ئەو ئەگەرە هەیە کە زۆر لە فاکتەرەکان، لەوانەش فاکتەرەکانی ژینگە کە دەچێتە ناو بڕیارە سیاسیەکانی خەڵکەوە، جیابکرێتەوە و حسابی بۆ بکریّ[26]. ئەگەرچی ئەو ئەنجامانەی تا ئێستا لە بەکارهێنانی ئەم ئاراستەیە بەدەست هاتوون (بەشێوەیەکی گشتی نا ئومێدانەن) بەلاّم ئاراستەیەکی دڵنیایی بەخشە. گەورەترین کەموکورتی ئەم ئاراستەیە ئەوەیە کە (ئەنجامەکانی رێك

شیکردنەوەیەکی وەستاون)[27] جگە لەوەش، بەکارهێنانی ئەم ئاراستەیە (لەو بارە کۆمەڵایەتییانەدا تا ڕادەیەك تایبەتمەندییەکی سادە و وەستاویان هەیە) سنووردارە و لە ڕوونکردنەوەی ڕەوتە چالاکە سیاسیەکان و حاڵەتە ئاڵۆزەکاندا هێندە سوودی نییە. ئەو کاتە "میتۆدی زانینی ڕەفتار بە دژواری دەتوانێ دیدگا تایبەتییەکان شیبکاتەوە و ئەندازەی بگرێ، و هیچ وەسیلەیەك بۆ نیشاندانی چۆنیەتی گۆڕانی دیدگاکان و بوونیان بە ئایدیۆلۆژیای کاریگەر فەراهەم ناکات"[28].

ڕەخنەیەکی تر کە لە ئاراستەی دەروونزانی گیراوە ئەوەیە کە بنەمای مەیلی عەقڵ و عەقلانیەت بەتاڵ دەکاتەوە و ڕۆڵی لایەنی دژی فکری یان ناعەقلانی سروشتی مرۆڤ، یان هەست لە ڕادە بە دەر نیشان دەدات. لە ئەنجامدا لە خستنە ڕووی تیۆرێکی بنیاتنەردا سەبارەت بە خۆی، دەستە پاچە دەبێت.

**د-ئاراستەی ڕێسایی**

ئاراستەی کۆن بۆ زانستی سیاسەت، یاسایی – مێژوویی یان ڕێسایی– فەلسەفی بوو. ئەم ئاراستەیە لە بەرامبەر ڕاستیەکاندا، تەئکیدی لە بەهاکان دەکردەوە. هەندێ لە بیریارە هاوچەرخەکانیش، کە ڕۆبەت دال ناوی ناوت تیۆرسینانی سەروو ئەزموونگەریی، باوەڕیان وایە کە لێکۆڵینەوەی سیاسەت دەبێ بەهاداریش بێت. ئیریك هیگلین *Erich Hegelin* بەناوبانگترین تیۆرسینی سەروو ئەزموونگەریی و لیڤی شتراوس باوەڕیان وایە لێکۆڵینەوەی سیاسەت دەبێ ئامانجێکیش هەبێ بۆ ئەوەی توانامان بداتێ بۆ هەنگاوی ڕاست و هەڵبژاردنی باشترین و بڕیاردان بۆ ژیانی باشتر لەگەڵ هاوڵاتیاندا. ئەم دوو بیریارە جەخت لەوە دەکەنەوە کە هەر جۆرە تیۆرێکی گشتی دەربارەی زانستی سیاسەت بە ناچاری دەبێ چەند بەهایەکیش لە خۆبگرێ کە نەك تەنها وەسفی متمانەی ئەزموونیی حوکمە تیۆرییەکان بکات بەڵکو متمانەی ئەزموونیی چۆنێتی ئەخلاقی ڕووداوەکان و ڕەوت یان سیستمە سیاسیەکانیش وەسف بکات. هەڵسەنگاندنی سیاسی لە ئاوێتەیی ناوەکی و بەردەوامی ڕاستیەکاندا هەڵسەنگاندنە. ئەوە سوودی نییە کە زانستی بابەتی و واقیعی بخرێتە لایەکەوە و بەهاکانیش بخرێنە لایەکی ترەوە. هەموو بەهانیش بەرامبەر نین، هەندێ لە بەهاکان وەکو پێویست باڵان و هەندێکی تریان خۆیان لە خۆیاندا خوارترن. باشترین هەڵسەنگاندنی سیاسی ئەوەیە کە ئەم دوولایەنە پێکەوە ببینێ.

سەروو ئەزموونگەران، هەروەها باوەڕیان وایە کە میتۆدی زانستی دەتوانێ بەشێوەیەکی باش هەم لە ڕاستیەکان و هەم لە بەهاکانیش بکۆڵێتەوە. جۆن دیڤی *John Deway* و فلیکس کافمان *Flex Kaugfmann* باوەڕیان وایە کە لە شیکردنەوەی کۆتاییدا هەر جۆرە بڕیاردانێکی زانستی هەمیشە بڕیاردانێکی زانستیە، و مەفهومی زانست دەبێ ئەوەندە فراوان بێ کە داوەریی بەهاییش لە خۆ بگرێ. ئەمانە بە داخوازیی ژیاندنەوەی هەوڵی فەیلەسوفە یونانیەکان و زانا مەسیحیەکانی سەدەکانی

ناوەڕاست، خوازیاری "گەڕانەوە" و "دووبارە تیۆرسازیی" زانستی سیاسەتن.

**ە-ئاراستەی ئەزموونی – زانستی**

دیدگای زانستی نوێ سەبارەت بە سیاسەت و حکومەت بۆتە هۆی ئەوەی بۆ ئاشکراکردنی پرەنسیپی سیاسی کە بنەماکەی لەسەر میتۆدی ئەزموونگەریی و بینینی دەزگا و رەوەندەکان بنیات نرابێ، بەشێوەیەکی بەرفراوان بەکاربێت. ئارەزووی بەکارهێنانی بەرفراوانی میتۆدی ئەزموونگەریی – زانستی بینین و لێکۆڵینەوە و پێوانەکردنی چەندایەتی، پەیوەستە بە گەشەکردنی زانستی ئامار و دەروونزانی و کۆمەڵناسییەوە[29].

لە میتۆدی زانستیدا، شێوەی باو ئەوەیە کە لە نێوان راستی و بەهاکاندا لە نێوان زاتی و بابەتیدا جیاکارییەکی دیار دەکرێ.

باوەڕ وایە کە ئەگەر دەبێ سیاسەت زانست بێت، نابێ لە پێشدا هیچ بەهایەك لەبەرچاو بگرێ. سەلمێنەرە لۆجیکیەکان لە میتافیزیك رادەکەن و پشت بە تاقیکردنەوە دەبەستن[30]. رۆبسۆن ئاماژە بۆ میتۆدێکی قابیلی بەراوردکاریی دەکات بە ناوی (ئاراستەی دەزگایی) ئەم ئاراستەیە "بینینی وردی دیاردەکان و بینینی وردی ئەو رەوتانەی پەیوەستن بە گریمانەکانەوە لەگەڵ ئەنجام و پەسەندکردن و تەعمیمکردن و شیکردنەوەی هۆ و ئەنجام کە تایبەتە بە بایۆلۆجیا و پزیشکی و کیمیا یان فیزیا" بە پێویست دەزانێت[31]. رۆبسۆن رەواج و پەرەسەندنی ئەم ئاراستەیە لە بەریتانیا وا دەبینێ کە پەیوەندیی بە نووسینی پێشڕەوانەی (سیدنی ***Sidney*** و بیئاتریس ویب ***webb Beatrice***)ەوە هەیە کە قوتابخانەی ئابووری و سیاسەتی لەندەنیان دامەزراند کە ئێستا وەکو میتۆدێ دەناسرێ کە لە لێکۆڵینەوەی حکومەت و بەڕێوەبردنی کاروباری گشتیدا قابیلی خۆلێلادان نییە. میتۆدی ئاماری پەیوەندیەکی پتەوی بەم ئاراستەیەوە هەیە. بەڕای بیئاتریس ویب، ئەنجامە بەدەست هاتووەکان لە بینین یان لە ئەزموونەوە دەبێ بە ئاماری گونجاو حساب بکرێن و پەسەند بکرێن.

(بێرتران دو ژوونال) باوەڕی وایە کە (راستی) رووت هەرگیز زانست ناهێنێتە ئاراوە، ئەگەر رێك نەخرێت. رێکخستنی راستی "پێویستی بە هەوڵ و کۆشش بۆ دابەزاندنی ئەو هەمە جۆرییەی پەیوەندیی بە دیاردەکەوە هەیە بۆ ئاستی سادەیی فیکریی" ئەم کارە بە چەند ئەنجامێکمان دەگەیەنێ کە لە کۆکردنەوەی زیاتری راستیەکاندا رێنیشاندەرن، ئەم راستیانەش بە نۆرەی خۆیان، ئەوەندە پێویستیان بە ئەنجامدانی ریفۆرم هەیە لە تیۆردا کە چیتر بەرپرسیاریان نەبێ. بەم پێیە "لە تیۆردا لە سادەیی سەرەتاییەوە بەرەو ئاڵۆزیی زۆر" دەجوڵێین تا بگەینە تیۆرێك کە (بە چاکی و بەوردی ئەرکی نوێنەرایەتی لەخۆدەگرێ) دو ژوونال پێی ناخۆشە کە زانستی سیاسەت لە تیۆری رێسایی و بەهاییدا دەوڵەمەندە بەلاّم لە تیۆری (نوێنەرایەتیدا) لاوازە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا توانای باش هەیە بۆ پەرەسەندنی (زانستی سیاسەتی واقیعی) کە بە سروشتی خۆی

ئەوەی کە زانستی دەرککردن هەوڵی دا پیادەی بکات، لەناو دەبات. بەڵام ئەم ئاراستەیە کەموکورتیشی هەیە، واتە ناتوانێ دەرەقەتی رەفتارە سیاسییە لە هەڵسەنگاندن نەهاتووەکان بێت. (دوایت والدو)ش رەخنەیەکی بنەڕەتی هەیە. بەڕای ئەو لایەنگرانی زانستی خاڵی لە بەها، لە لایەنگیری گەرموگوڕدا لە زانستێتی زۆرجار مەفهومی ئامانجی کۆتایی قبوڵ ناکەن. والدۆ تەئکید دەکاتەوە کە بەهاکان قابیلی خۆ لێلادان نین، (بێلایەن) کردنی زانستە کۆمەڵایەتییەکان خەیاڵێکی بێهودەیە و (لێکۆڵینەوە) ئەندێشەیەکی بێ شێوە یان بێ ناوەڕۆکەو دەبێ بەهای تایبەتی بخرێتە سەر. بەم پێیە، ئەوەی توێژەر دەتوانێت ئەنجامی بدات ئەوەیە کە (بنەمای بەهایی) بە ئاشکرا خۆی رابگەیەنێ"[32].

(مۆرگینتا – *Morgenthou*)ش باوەڕی وایە کە "بەشی زۆری زانستی سیاسەت چەندایەتی و کۆکردنەوەی خۆ نواندنی شتە بێزراوەکانە"[33] لە لایەکی ترەوە، خوازیارانی وردیی و توانای پێشبینی لە زانستی سیاسەتدا چیتر ناتوانن تەماشای ماهیەتی ئالۆزیی بابەتەکەی بکەن. بە هەمان شێوە (بەرنامەداڕێژیی) زانستی سیاسەتیش چەند کەموکورتیەکی ئاشکرای هەیە، و هەمیشە ئەو مەترسییە هەیە کە بەرنامەدارێژەران هەوڵ بدەن بیروڕای خۆیان بەسەر کەسانی تردا بسەپێنن.

نۆرمان جاکۆبسن، کە دژی زانستگەرایی و ئاکارگەراییە، باوەڕی وایە کە بزوێنەری ئەم دوانە (شورایتان) کە جێگای بایەخی تیۆری سیاسی نییە. تیۆرەکە سەبارەت بە تەکنیکە بەکارهاتووەکانەو لێکۆڵینەوەی عەقڵی سیاسی بێلایەن و تەنها خوازیاری چاودێریی و هەستیاریی تایبەتە بۆ ئاراستەکردنی گشتی. لە ڕاستیدا، تیۆرسین "بەشێوەیەکی گشتی وابەستەیە بە زانستی خۆیەوە دەربارەی خود هوشیاریی و خود خوێندنەوە" دەبێ ئەندێشەی بەهادار بەهێزی عەقڵ و بەبێ دەمارگیریی نەقڵ بکات. بەم پێیە تەنانەت "پەیڕەوانی زانستیی بوون دیلی مرۆڤ بوونی خۆیانن"[34].

### و-ئاراستەی رەفتاریی

بایەخی ئەم ئاراستەیە لە دوای دووەم جەنگی جیهانیی زانرا. سیاسەتزانە ئەمریکاییەکان لایەنگیری سەرەکی ئەم ئاراستەیە بوون. بە قسەی (چارلز وۆرس) (بە پێچەوانەی تیۆرە کۆنەکانی ئەندێشەی سیاسی رابردووەوە، تیۆری نوێ شیکارییە، راستیەکی گشتییە نەک تایبەتی، روونکردنەوەیە نەک ئاکاریی) بێگومان ئاراستەی نوێ رەفتاریی و زانستیتر و ئەزموونگەرییترە. لەم ئاراستەیەدا، خاڵی سەرەکی بایەخدانە بە رەفتاری سیاسی تاکە کەس. (دەیڤید ئیستۆن) کە یەکێکە لە ناودارانی ئەم ئاراستەیە دەڵێت: (رەفتاری سیاسی هەم نیشانەی مەیلێکی فکرییە و هەم جوڵەیەکی دیارە بۆ خوێندنەوەی زانستی) رۆبەرت دال، لە فکری سیاسی هاوچەرخدا، ئاوا رەفتارگەرایی وەسف دەکات "بریتییە لە تاقیکردنەوەی لایەنەکانی ژیانی سیاسی بە یارمەتی ئامرازەکانی میتۆد و تیۆر و پێوەرەکانی هەڵسەنگاندن کە قابیلی گۆڕانن بۆ

حوکمی گشتی و قاعیدە و گریمانەی نویٚ لە زانستە ئەزموونگەرییەکاندا"[35].

**1-ئامانجەکانی رەفتارگەرایی**

ئەگەرچی ئاسان نییە ماهیەتی ئامانج و گریمانە بنەڕەتییەکانی سەراپا بیری رەفتارگەرایی باس بکریٚ، بەلاٚم بە بەکارهیٚنانی هەندیٚ لەو گریمانانەی کە دەیڤید ئیستون روونی دەکاتەوە، دەتوانریٚ بە کورتی باسیان بکریٚ:

1.**بنەماکان (قواعد):** ئیستوٚن باوەڕی وایە کە لە رەفتاری سیاسیدا چەند تایبەتمەندییەك هەن کە قابیلی زانینن کە دەتوانریٚ بە تەعمیم یان بەو تیوٚرانەی خاوەنی بەهای وەسفی و پیٚش بینین بناسریٚنەوە. تەنانەت ئەگەر رەفتاری سیاسی هەمیشە هاوئاهەنگ نەبیٚ، مروٚڤ لە چەند لایەنیٚکی تایبەتیەوە لە شویٚنە جیاوازەکاندا کەمو زوٚر بەیەك شیٚوە رەفتار دەکات، بوٚ نموونە لە کاتی دەنگداندا، لە هەلٚبژاردنە دەورییەکاندا دەنگدەران بەشیٚوەی هاوئاهەنگ دەنگ بوٚ کەسیٚك یان حزبیٚکی سیاسی دیاریکراو دەدەن. ئەگەر ئەم رەفتارە پەیوەندیی بە پیٚگەی کوٚمەلاٚیەتی و ئابووری و وەفاداریی پیشەیی و شتی لەم بابەتەوە هەبیٚ، لیٚیەوە نموونەیەك سەرهەلٚدەدات.

2.**بەدواداچوون:** تەعمیمە کە جیٚگەی متمانەبیٚ یان نا دەبیٚ بە حسابکردن بوٚ ئەو رەفتارەی پەیوەستە پیٚوەی دەبیٚ بەدواداچوونی بوٚ بکریٚ. هەموو بەلٚگەکان دەبیٚ لەسەر بینین بنیاتنرابن.

3.**تەکنیك:** تەکنیکی بەدەستهیٚنان و راڤە کردنی دراوەکان ناتوانریٚ بەراست دابنریٚ. ئەم تەکنیکانە دەبیٚ هوشیارانە هەلٚبسەنگیٚنریٚن و وەها بپالیٚوریٚن کە بوٚ بینین و توٚمارکردن و شیکردنەوەی رەفتار وەکو ئامرازی ورد قبولٚ بکریٚن. رەفتارگەران باوەڕیان وایە کە بوٚ دوٚزینەوەی هەلٚەکان و بیٚمتمانەیی دراوەکان چەند میتوٚدیٚك لە ئارادایە و پیٚشنیاز دەکەن هەتا ئەو شویٚنەی دەشیٚ بوٚ بەدەستهیٚنانی دراوی بابەتی هەولٚ بدریٚ.

4.**چوٚنایەتی:** رەفتار گەرایان باوەڕیان وایە کاتیٚ دەتوانریٚ ئالوٚزییەکانی ژیانی سیاسی بەراستی بزانریٚ کە داوەریی چوٚنایەتی هەرەمەکی جیٚگای خوٚی بوٚ پیٚوانەکاریی ورد و میتوٚدەکانی ئالوگوٚڕ لە دراوەکاندا چوٚلٚ بکات. لە مەیدانی زانستی سیاسەتدا دراوەکانی لیٚکوٚلیٚنەوە دەبیٚ چەندایەتی بن و هەموو دراوەکان لەسەر ئەو دراوانە بنیات نرابن کە قابلیەتی چەندایەتی بوونیان هەیە، جگە لەم حالٚەتە میتوٚدی کوٚکردنەوەی دراوەکان تووشی هەلٚە دەبیٚت و جیٚگای متمانە نابیٚت.

5.**بەهاکان:** لیٚکوٚلیٚنەوەی زانستی ئەگەر بیەویٚ بابەتی بیٚت، دەبیٚ لە بەهادانان بەدوور بیٚ. لە لیٚکوٚلیٚنەوەی زانستیدا دەتوانریٚ بەهاکان بەکاربهیٚنریٚ. بوٚ نموونە، دیموکراسی، یەکسانیی یان ئازادی بەها بالاٚکانە بەلاٚم قورسە بە شیٚوەیەکی زانستی دەربارەی راستی و ناڕاستی بەهاکان حوکم بدریٚ. بەم پیٚیە تویٚژەر دەبیٚ بەهاکانی خوٚی بە تەواوی لە تویٚژینەوەکانی بەدوور بگریٚ. لە راستیدا دەتوانریٚ بگوتریٚ کە زانستی سیاسەت بریتییە لە لیٚکوٚلیٚنەوەی زانستی سیاسەت لەلایەنە

پراكتيكيەكەيدا كە بە ميتۆدی ئەزموونگەريی ئەنجام دەدرێ و هیچ پەیوەندییەکی بەمەسەلە ئەخلاقییەکان یان ئەو مەسەلانەوە نییە کە پەیوەستن بە ئەخلاقەوە. ڕەفتارگەرایان بەشێوەیەکی گشتی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە بەپێی تەکنیکی میتۆدە پێشکەوتووەکان، دەتوانرێ لێکۆڵینەوە لە بەها تاکەکەسیەکان بەدوور بگیرێ یان بەلای کەمەوە توێژەرێکی تر بە ئاسانی دەتوانێ بە هەڵسەنگاندنی دووبارەی دراوەکان، بنەمای بەهادارییان بدۆزێتەوە.

6.**بوونی نەزم:** بەشێوەیەکی گشتی ڕەفتارگەرایان داوایانکردووە کە توێژینەوەی زانستیی سیاسەت دەبێ نەزمی هەبێ، واتە (لە تیۆرەوە بڕوانێ و پشتی بە تیۆر بەستبێ) تیۆر و لێکۆڵینەوە دەبێ چەند بەشێکی بە تەواوی پەیوەستی زانستی پێکەوە گرێدراو بهێننە ئاراوە (تیۆر بەبێ پشتیوانی دراوەکان بێ بەرەو هەر لێکۆڵینەوەیەك کە لە چوارچێوەی تیۆرێکدا نەبێت، ڕەنگە بێزراوو بێ بایەخ بێت) بەرای ڕەفتارگەرایان تیۆر، بیرێکی تەواو تیۆری و ڕوانینی ناوەکی نییە، بەڵکو شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە و پێشبینییە. ڕەفتارگەرایان باس لەوە دەکەن کە گریمانەکان دەبێ لەسەر بنەمای پێکهاتە بەشێوەیەکی لۆجیکی باش ڕێکخرابن لەسەر چەمك و ئەو پێش گریمانانەی پەیوەستن پێیانەوە و بەو شێوەیە بخرێنە ڕوو.

7.**زانستی ڕووت:** ڕەفتارگەرایان باوەڕیان وایە کە لەگەڵ تێگەیشتنی تیۆری ڕەفتاری سیاسیدا دەتوانرێ ئەم زانستە لە بوارەکانی ژیاندا بەکاربهێنرێ. هەم تیۆر و هەم پراکتیکی بەشەکانی کاری زانستی پێکدەهێنن.

8-**یەکپارچەیی:** زانستی سیاسەت پەیوەندیی بە زانستە کۆمەڵایەتیەکانی ترەوە هەیە. ڕەفتار گەرایان باوەڕیان وایە کە ناتوانرێ بەجیا لە چالاکیە کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و فەرهەنگیەکان و ئەو چالاکیانەی تر کە پەیوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە، بکۆڵرێتەوە، چونکە پەیوەندیی ناوەکیان پێکەوە هەیە. بۆ لێکۆڵینەوەی دیاردەی سیاسی، تێگەیشتنێکی زیاتر سەبارەت بە چۆنێتی دیاردە ئابووریی و فەرهەنگی و دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی تر پێویستە. ئەگەر بە ڕوونی لە ڕەفتاری سیاسی مرۆڤ تێبگەی، ئیدی ناتوانی مرۆڤی سیاسی لە مرۆڤی ئابووریی، کۆمەڵایەتی یان فەرهەنگی جیابکەیتەوە.

بەحسابکردن بۆ ئەم گریمانانەی ڕەفتارگەرایی، دەتوانرێ بگوترێ کە زانستی سیاسەت لە ڕێگەی پێشکەوتنی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی ترەوە پێشکەوتووە. لە ڕاستیدا هەموو زانستە کۆمەڵایەتیەکان چەند بەشێکی پێکەوە گرێدراون. بەم پێیە، کودەتا لە تەکنیك و بنەما بابەتیەکانی زانستی سیاسەتدا بە ئاشکرا قابیلی دەستنیشانکردنە.

### 2-شیکردنەوەی بۆچوونی ڕەفتارگەرایان

ترادسیونیستەکان، بیروبۆچوونی ڕەفتارگەرایانیان قبوڵ نەکرد. ڕەخنەیان لە گریمانەکانیان گرت و هەروەها ڕەخنەیان لە ئامانجەکانیشیان گرت. ئەوەی لە خوارەوە دێت خاڵە سەرەکیەکانی ڕەخنەگرتنە لە ئاراستەی ڕەفتارگەرایان:

1. ڕەفتارگەرایان باوەڕیان وایە کە زانستە کۆمەڵایەتیەکان و زانستە سروشتیەکان بەهای یەکسانیان هەیە بەڵام لە ڕاستیدا جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە. لە زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا ڕاستیەکان کەمتر هەستیان پێدەکرێ و کەمتر یەکپارچەن. بەم پێیە بە بەراورد لەگەڵ زانستە سروشتیەکاندا توێژینەوەکانی زانستی سیاسەت قورسترن.

2. ڕەفتارگەرایان تەئکیدێکی زۆر لەسەر میتۆدەکان دەکەنەوە. ئەوەی کە بایەخی هەیە دەیخەنە لاوەو ئەوەی کە گرنگ نییە هەڵیدەبژێرن. کاتی خۆیان بێهودە لە کۆکردنەوەی واقیعەکان و ژمارەکاندا بەفیڕۆ دەدەن.

3. ڕەفتارگەرایان، وا بەناوبانگن کە لە مەیدان هەڵدێن. خۆیان تووشی مەسەلەی (هەیە) و (دەبێ هەبێ) دەکەن. بەم پێیە لە مەسەلە ئازاربەخشەکانی بەردەم خەڵك و میللەت لە بەرەی سیاسیدا هەڵدێن.

4. ڕەفتارگەرایان لە قسەکانی خۆیاندا قسەی بێمانای زۆریان هەیە کە دەبێتە هۆی سەرلێشێوانێکی زۆر.

5. ڕەفتارگەرایان بەشێوەیەکی گشتی جەخت لەوە دەکەنەوە کە جێگیریی ئامانجێکی سەرەکیە کە دەبێ لە زانستی سیاسەتدا بەدەستبێت. ئەمەش دەبێتە هۆی موحافیزەکاریی لەلایەکی ترەوە، ئیدیعای ئەوە دەکەن کە دیلی بەهاکان نین.

6. ڕەفتارگەرایان زانستی سیاسەتیان لەناو جیهانی زانکۆدا قەتیس کردووە. بەم پێیە، ئەم بوارەی زانستیان لە ئەرکی سیاسەت داڕشتن دوورخستۆتەوە.

7. ڕەفتارگەرایانی وەکو دال و رامنی *Ramney* و ئیولان *Eulan* لەسەر ئەو بنەڕەتە مەحکوم کراون کە لەگەڵ ئەوەشدا کە کاتێکی زۆریان سەرف کردووە نەیانتوانیوە زانستی ڕەفتاری مرۆڤ هەڵبهێنجن.

8. ڕەفتارگەرایان، هاوزەمان بەمیانەڕەوو غەیری میانەڕەو لە قەڵەم دراون. لەلایەکەوە، باوەڕیان وایە ئەو ئەنجامانەی کە بەدەستی دەهێنن نیسبیە و لەلایەکی ترەوە شتێك قبوڵ ناکەن کە چەندایەتی دیاری نەکرابێ. بەم پێیە لەو دەمارگیرانە دەچن کە تەنانەت ئەگەر بیرو بۆچوونەکانیشیان هەڵە بێ بە توندیی داکۆکی لێدەکەن.

9. ئاراستەی ڕەفتارگەرایان ئەوەی نیشانداوە کە تەواو بەرفراوانە و ئەوان سەرەڕای هەوڵی زۆر، سەبارەت بە هەڵێنجانی تیۆرێك کە قابیلی قبوڵ بێت دەربارەی زانستی سیاسەت ناکام بوون.

10. ڕەفتارگەرایان سەرەڕای ئیدیعاکانیان، نەیانتوانیووە دەستبەرداری تیۆری کۆن ببن و تیۆرێکی نوێ بخەنە ڕوو.

11. ڕەفتارگەرایان زەینێکی زۆر تەکنیکیان هەیە، جەخت کردنەوەی لە ڕادەبەدەر لەسەر تەکنیك قابیلی قبوڵ نییە.

12. وێڕای ئەوەی ڕەفتارگەرایان لە ڕاستیدا لە هەلومەرجی گۆڕاوو پێگە تازەکان دەکۆڵنەوە، بەڵام ئاراستەی ڕەفتارگەرایی تەئکید لە هەلومەرجی جێگیر دەکاتەوە.

13.ڕەفتارگەرایان بەئاشکرا تەئکید لەسەر ژمارە و سیستم و میتۆدەکان دەکەنەوە.

14.ڕەفتارگەرایان لەگەڵ ئەوەشدا کە ئیدیعای ئەوە دەکەن کە لە نێوان زانستە سروشتیەکان و زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا جیاوازیی هەیە، بەڵام لە جیاوازی دانان لە نێوانیاندا سەرکەوتوو نەبوون.

هینس *Heins*، سەرەڕای داننان بە کەموکورتی ئاشکرای ڕەفتارگەرایاندا دەڵێت: "هەڵبەتە کۆمەڵێ کەموکورتیان هەیە، بەڵام کەموکورتیەکانیان مەرجدارە، کەموکورتی کات، دەرفەت و بەرژەوەندیی، ئەو کەموکورتیانەی لە دەمارگیریی و ترس و کورت بینییەوە سەرچاوەیان گرتووە، کەموکورتی تایبەتی خودی ئەم میتۆدە زانستیە – سەرەتای ناڕاستو ڕەوتی هەڵە و ئەو هەڵانەیە کە پەیوەندییان بە کەموزۆری و کەموکورتی ئامرازەکانی بەردەست و ئامرازەکانی لێکۆڵینەوە و میتۆدەوە هەیە"[36] لەگەڵ ئەوەشدا هینس باوەڕی وایە کە دەتوانرێ ئەم کەموکورتیانە چارەسەر بکرێن.

لە تواناو کەموکورتی میتۆدو ئاراستە جیاوازەکان کۆڵینەوە. مامەڵەی دیدگای زانایانی ئەزموونگەریی – زانستی و پەیرەوانی میتۆدو ئاراستە باوو بەکارهاتووەکانی زانستی سیاسەت گرنگترین مەسەلەیە و ناکۆکیش لە نێوانیاندا بنەڕەتییە. بەڵام لەوێوە کە خوێندنەوەی دەوڵەمەندترمان نییە لەسەر بنەمای ئاراستەی ئەزموونگەریی – زانستی، ناتوانین میتۆدە کۆن و باوەکان ڕەتبکەینەوە. لە قاڵبدانی لێکۆڵینەوەی زانستی سیاسەت لە هەر کام لە ئاراستەکاندا بریتییە لە سنووردارکردنی ماهیەت و مەیدانی زانستی سیاسەت. ڕەنگە مۆرگێنتا لەسەر حەق بێت کە وتی زانستی سیاسەتی هاوچەرخ یەکێتی بۆچوون و میتۆد و ئامانجی نییە[37]. بەڵام گەورەترین فەزڵ و ئیمتیازی زانستی سیاسەت ئەوەیە کە بەتەواویی ئامادەی فێربوونە لە بەشەکانی تری زانستی بەشەرەوە، بێئەوەی ئیدیعای ئەوە بکات کە گەیشتۆتە پرەنسیپ و بونیادی کۆتایی و بێچەند وچوون. هەمان ئەم ئامادەییە شایەتی ژیانی بە توانایی و بەردەوامیی گەشەکردنێتی و بێگومان سەرئەنجام، هەرشتێك بەدەست دەهێنێت کە نیەتی و پێویستی بەو شتانە نابێ کە نیەتی.

### پەراوێزەکان:

*1.Morgenthou op cit p 67*

*2.Kapur op cit p 21*

*3.2.JW Garner, Introduction to political Science (New York American Book co 1932 p 28.*

*4.Unesco op cit p 17-18*

5–مونتی پالمر، لاری اشترن، چارلز گایل. نگرشی جدید به علم سیاست، ترجمه منوچهر شجاعی (تهران: دفتر مطالعات سیاسی و بینی المللی، 1367) ص 7–6. ناونیشانی ڕاستی ئەم کتێبە (مطالعة میان رشته أی علم سیاست است *The Interdisiplinary study of politics* کە بەو ناونیشانەی یەکەم تەرجومەکراوە بۆ فارسی. بەهەرحاڵ فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبە بە ناونیشانی (تجزیه و تحلیل تصوری) باسێکە دەربارەی

میتـۆدی لێکۆڵینـەوە و بەشبەشـکردن و شـیکردنەوە لـە زانستی سیاسەتدا، کە داوا دەکەم بیخوێننەوە.

6-بـۆ نموونـە ئـەم کتێبـەی خـوارەوە بەرهـەمی ئـەو میتۆدەیە

*James Bryce the American common wealth NewYork: The Macmillan Co 1891*

7-بـۆ خوێندنـەوەی زیـاتر دەربـارەی میتـۆدی ئەزموونگەریی بروانە:

*Jarol Manheim Richard Rich Empirial Political Analysis Research Methodes in Political Science. $2^{nd}$ ed London Longman 1nc 1986.*

*8.Barker op cit pp. 106-108.*

9-بـۆ خوێندنـەوەی زیـاتر دەربـارەی میتـۆدی پراکتیکی و نموونەگەرایی بروانە:

*W.J.M Maekenzie Politics and Social Sciences (Baltimore Md: Penguin Books Inc 1967) p 44-47.*

*10.Agarwal op cit p. 32*

11-بۆ خوێندنەوەی زیاتر، بڕوانە:

*Kapur op. cit pp 21-32 and carl Kalvelage Morley Segal Research Gvidem Political Science $2^{nd}$ ed NJ Morristown General learning press 1976.*

*12.R. G. Gettell History of Political Thought (NewYork: Ginnand Co 1924) p. 51*

13-دال، سەرچاوەی پێشوو ل 119.

*14.Agarwal op. cit p.33.*

15-مـوریس دوورژە، اصـول علـم سیاسـت، ترجمـە ابو الفضل قاضي (تهران شرکت سهامی کتابهای جیبی، 1329) ص 77.

16-بۆ خوێندنەوەی زیاتر بڕوانە:

*Nnoli op cit pp 35-37*

*17.T.D Weldon The Vocabulary of politics (London: penguin 1953 p.120.*

*18.F.Engles (Letterto J. Bloch) Sep 21. 1890*

لـەم نامەیـەدا ئـەنگلس ئـەو بۆچوونە ڕەت دەکاتـەوە کە ئـەوو مـارکس باوەڕیـان وابوو کـە (فاکتـەری ئابووری تەنها فاکتەری چارەنووسسازە)

19-دوورژە، سەرچاوەی پێشوو ل 87.

20-هەمان سەرچاوە.

*21.V.I Lenin Selected Works in Two Volumes (Moscow: progress 1946) Vol. 1. p. 68.*

22-بـۆ نموونەیـەك لـە خوێندنـەوەی ئـابووری سیاسی، بڕوانە:

*Charles K. Wilber K. p. Jameson (eds) The political Economy of Development and Underevelopment $5^{th}$ ed NewYork: Mc Graw-Hill 1992.*

*23.Barker op. cit p. 148.*

*24.Willam A.Robson(ed) The University Training of Scocial Scinces: Political scinece (A Report on Beholf of the International political Association) Unesco 1945. p. 20*

*25.Ibid. p 21.*

*26.F.M.Watkins "political Theory as a Datum of political Science" in: Ronald young(ed) Approaches to the study of politics (London: North Western Univ. Press 1958) p.157*

*27.Ibid. p. 152.*

*28.Ibid. p. 153.*

29-رودی، سەرچاوەی پێشوو، ل 15-16.

30.Dwight Waido "Values in the political Science Cuvriulum in Young, op. cit. p. 103.

31.W.A. Robson, "Political Science in Great Britain in: Unesco op. cit p. 306.

32.Woldo op.cit. pp. 101- 106 and Gunnar Myrdal "The Relation Between Social Theory and Scoidl Policy" British journal of Sociology (September 1953) p. 242

33.H.Morgenthau (power asa political Concept) in:young op.cit.p.70.

34.n.jacobson "The Unity of Political Theory: Science Morals and politics" in Ibid 121 and 117-124

35.J. A Gould and v.v. Thursby (eds) Contemporeny political Thought: Issues in Scope valve and Directions (NewYork: Holt Rinehart and Winston 1969) p.126

36.Agarwal op. cit p 40-41.

37.Morgenthau "power as a" in: Young op cit p. 68.

**سەرچاوە:**

**بنيادهای علم سياست**

**عبدالرحمن عالم**

**چاپ سوم** 1376

ص 41- 63.

# کێشەکانی کۆمەڵناسیی مێژووخواز

گی ڕوشە

لە فارسییەوە: رامبود لوتفپور

**(بەشی یەکەم)**

کۆمەڵگا مێژووە چونکە بەردەوام لە بزاڤێکی مێژوویدایـە، خـۆی دەگـۆڕێ و بـەردەوام لـە گـۆڕانی خـۆی، ئەندامـەکانی، دەوروبـەری و کۆمەڵگاگەلێکی دیکەدایە کە پێوەندی پێیانەوە هەیە. کۆمەڵگا بێ وچان لە پێکهێنانی هەندێك هێـزی دەرەکی یا نا دەرەکیدایـە کـە نێـوەرۆك، ئاراستەو چارەنووسی دەگۆڕن، وەریاندەگرێ یا پێـشوازیان لـێ دەکـات یـان لـە بەرامبەریانـەوە نـەرمی دەکێـشێ. هـەموو کۆمـەڵگاکان، چ بـە شـێوەیەکی لـەناکاو چ بـە چەشـنێکی ئـارام یـا هەست پێنەکراو، هەر ڕۆژە هەندێك گۆڕانکاری بـەخۆوە دەبـینێ کـە کـەم و زۆر لەگـەڵ رابردوویانـدا هاوئاهەنگـە و بـە ڕێـچکە و شـێوازێکی کـەم و زۆر دیـاردا دەڕۆن. کـەوا بـوو کۆمەڵگا تەنیا کردەوەی کۆمەڵایەتی گروپێك لە کەسـەکان نیـەو نـاتوانین تـارادەی بیـچمێك لـە ڕێکخـراوی کۆمەڵایـەتی چـکۆلەی بکەینـەوە. لەلایەکی دیکەشەوە دەتوانین کۆمەڵگا بە بزاوت یا گۆڕانی کۆمەڵێك لەسەرەوەی کاتەوە دابنێین. پـاش شـیکردنەوەیەك کـە لـە کـردەوەی کۆمەڵایـەتی لـە کتـێبی یەکـەمی ئـەم کـۆکراوەدا (کـردەوەی کۆمەڵایـەتی) کـراو پاشـان لـە کتـێبی دووهەمیـشدا باسـی جۆرەکـانی ڕێکخـراوە کۆمەڵایەتییـەکان کـرا، لـەم کتێبـەدا لایەنـە مێژووییـەکانی کۆمـەڵگا دەخەینـە بـەرباس و توێژینەوە.

### نەریت و لاوازیی کۆمەڵناسیی مێژووخواز

ئەگەرچـی کۆمەڵناسـی، بـۆ پاراسـتنی خـۆی لـە هـەر چەشـنە دووفاقیـەتی و دژایەتییـەك تـا ئێستە کۆمەڵگای لە بواری مێژویشەوە خستۆتە بـەر بـاس و توێژینـەوە، بـەلاّم لەلایـەکی تـرەوە

گـــــۆڕانیش یەكێكــــــە لـــــە روونتریــــــن و بەڵگەنەویـــــــستترین تایبەتمەندیـــــــەكانی كۆمەڵگایەو لەم رووەوە باسەكانی كۆمەڵناسی هــەر لــە ســەرەتاوە پاســاو و راڤــەی گۆڕانــە كۆمەڵایەتییەكانیان لەگەڵ بووە، بەڵام لەلایەكی دیكەشەوە پێویستە سەرنجی ئەم كێشەیە بدرێ كە كۆمەڵناسی لە شیكاریی مێژوویی خۆی لە كۆمـــەڵگا، پێـــشكەوتنێكی ئـــەوتۆی بـــەخۆوە نەدیوە چونكە گۆڕان یەكێك لەو باسانەیە كە كۆمەڵناســـان كـــەمتر هاودەنگییـــان لەســـەری هەبووە و لـەم بـوارەدا قـەت بەریەككـەوتنێكی گــشتی نەگەیــشتوون. كــەوابوو بــە ئاســانی دەتوانین بنەماو سەرچاوەی قوتابخانە جیاوازە كۆمەڵناســـییەكان لـــەو راڤـــە جیاوازانـــەدا بدۆزینەوە كە لە گۆڕانی كۆمەڵایەتی، نێوەرۆك و لایەنگیرییەكەیدا كردوویانە.

**یەكەمین كۆمەڵناسەكان**

لەكاتی هاتنە ئارای زانستی كۆمەڵناسییەوە تا ئێستە، تێكرای كۆمەڵناسـەكان دانیـان بـەم راستییەدا ناوە كە گۆڕانی كۆمەڵایەتی لە نێو دیـــاردە كۆمەڵایەتییـــەكانی دیكـــەدا خـــاوەنی گرنگییـەكی بەرچـاوە، بـەڵام تـەنیا لـە سـەدەی نۆزدەهــەم و نیــوەی ســەدەی بیــستەمەوەیە كــە باسـكردن لـەم بـوارەدا سـەرنجی شـێلگیرانەی كۆمەڵناســان رادەكێــشێ. ئاگوســت كۆنــت بــۆ یەكــەم جــار، كۆمەڵناســی بەســەر دوو بەشــی سەرەكیدا دابەشكرد:

1-كۆمەڵناسیی ئێستاتیك (وەستاو)

2-كۆمەڵناسیی دینامیك (چالاك)

بابـــەتی توێژینـــەوە لـــە كۆمەڵناســـیی ئیستاتیكدا رژێمێكـی زاڵـە بەسـەر كۆمـەڵگادا، واتـا شـێوەیەك كـە تاكـەكانی یـەك كۆمـەڵگا بـەو پێیـە چەشـنە هاودەنگییـەك لـە نێـو خۆیانـدا پێكدێنن كە لە راستیدا دەستەبەركەری بوون و درێژەی ژیـان و كردەوەی ئـەو كۆمەڵگایەیـە، یـا بە واتایەكی روونتر، بنچینەو بنەمای رێكخراو و كــردەوە كۆمەڵایەتییەكانــە. بــە پێــچەوانەوە، بابـەتی كۆمەڵناسـیی دینامیـك، پێـشكەوتن و پـەرە ئەسـتاندنە، واتـە توێژینـەوەی تـەواوی كۆمـــەڵگاكان لـــە ســـەرەوەی مێـــژووی مرۆڤایەتییـەوە و لـە راسـتیدا هـەر بـەپێی ئـەم تیۆرییەیە كە ئاگۆست كۆنت یاسای دۆخە سێ لایەنــەی خــۆی پێــشكەش دەكـات، لای ئــەو كۆمەڵناســـیی دینامیـــك گـــەلێك گـــرنگتر لـــە كۆمەڵناسـیی ئێستاتیكە، هـەر بـەم هۆیـەوە لـە كتێبەكەیدا گرنگییەكی زۆرتری بەم لایەنە داوە. كۆمەڵناسـیی ئاگوسـت كۆنـت لەسـەر ئـەم سـێ بنەما گرنگەی خوارەوە راوەستاوە:

1-ناتوانین توێژینەوە و راڤە و لێكدانەوەی كۆمەڵگایـەك لەیـەك كـاتی دیـاریكراودا بكـەین مەگـەر ئـەوەی كـە لـە پێوەنـدی لەگـەڵ مێـژووی ئەو كۆمـەڵگا و لـە ئاستێكی بەرینتردا. واتـە لـە پێوەنـدی لەگـەڵ مێژووی مرۆڤایەتیـدا، بكرێـت. بــەم پێیــە ئاگوســت كۆنــت زۆرتــر رووی لــە كۆمـــەڵگای مێـــژوویی و گۆڕانكارییـــەكانی كۆمەڵگاكان لە برگەی كاتدایە و هەر لەم رووەوە دەتـــوانین بڵـــێین كـــە كۆمەڵناســـیی كۆنـــت كۆمەڵناســـییەكی بەراوردییـــە كـــە چوارچـــێوە گشتییەكەی مێژووی جیهانییە.

2-دووهـەمین بنـەمای کۆمەڵناسـیی کۆنـت پشت بـە توێژینـەوەی گەشـەو پەرەئەسـتاندنی مرۆڤ لـە ڕەوتـی مێژوویی کۆمـەڵگادا دەبەسـتێ، چــونکە ئاکــاری مــرۆڤ لەســەر لۆژیــك و تێگەیشتنی خـۆی ڕاوەسـتاوەو پێوەندییـەکانی لەگـەڵ دونیـا و مرۆڤـەکانی دیکـە بەسـتراوەتەوە بە تێگەیشتنی ئـەو لـە سروشـت و کۆمـەڵگا. بـە واتایـەکی ڕوونـتر نـاتوانین بۆچـوونەکان بـە بنــچینەی گۆڕانکارییــەکان بــزانین، بــەڵکوو فاکتـەری کاریگـەر و بنـچینەیی لـە گۆڕانکارییـە مێژووییەکانـدا، ناسـین و بیـچمە جیاوازەکـانی ئەم ناسینەیە.

3-بــــە لەبەرچـــــاوگرتنی سیـــــستمی کۆمەڵایەتی و پێکهاتەی بایۆلۆژیکی، مرۆڤـەکان لە هەموو شوێنێکی دونیا و بـە درێژایی هـەموو سەردەمەکان تێکڕا یەك فۆرمیان هەیـە، کەوابوو کۆمـەڵگای جیهـانی بەپێی یـەك شـێواز و بەیـەك فـۆرم دەگـۆڕدرێ و مرۆڤایـەتیش بەیـەك شـێوە بــەرەو جــۆرە کۆمەڵگایــەکی پێــشکەوتووتر هەنگاو دەنێت.

لــە نێــو کۆمەڵناســانی دیکــەدا دەتــوانین مــارکس و ئـەنگێڵـسیش بـە خــاوەن تیۆریــای کۆمەڵناسیی گۆڕان دابنێین، بەڵام دیـارە کـە ئـەم کۆمەڵناسـییە دەبـێ بـە ڕوانـین و بەربڵاوییـەکی زۆرتــرەوە بخرێتــە بــەر بــاس و توێژینــەوە. لــە ڕاســتیدا مــارکس و ئــەنگێڵس مەبەســتیان توێکــــاری و ڕوونکردنــــەوەی بنەچــــەی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگای کاپیتالیستی بوو و لەســەر ئــەو بڕوایــە بــوون کــە توندبوونــەوەی بەربـەرەکانێی نێـوان چـینی خـاوەن ئامێرەکـانی بەرهــەمهێنان و چـینی کرێکـار، لـە نێوچـوونی کۆمــــەڵگای کاپیتالیــــستی و بــــوونی بــــە کۆمەڵگایــــەکی کۆمۆنیــــستی بــــێ چــــینی لێدەکەوێتەوە.

بەرهەمـە هەڵکەوتـەکانی تـاقمێکی دیکـە لـە کۆمەڵناســە بەناوبانگــەکانی دونیــاش بــەپێی ڕوانــینی مێــژوویی داڕێــژراون. لــە نێویانــدا دەتـوانین ئامـاژە بکـەین بـە هێربێـرت سپینـسەر "یاســــای گــــۆڕانی گــــشتی"، دورکهــــایم "دابەشـکردنی کـار"، سـیمل "توێژینەوەیـەك لـە مـەڕ دژایەتییـەکان"، پـاریتۆ "گواسـتنەوە یـا جێگــۆڕکێی بــژاردەکان"، ڤێبێــر "بانــدۆرە بنەڕەتییـە مێژووییـەکان". پاشـانیش بـە کـەڵك وەرگـرتن لـەو دەرفەتانـەی کـە دەمانبێت، باسـی بەرهــەم و تیۆرییــەکانی هــەرکام لــەم زانــا کۆمەڵناسانە لەم بارەوە دەکەین.

بــە کــورتی، دەتــوانین بڵــێین کــە یەکــەمین کۆمەڵناسەکان، دیاردەی کۆمەڵایـەتییان نـە وەك وێنـەگرێك کـە تـەنیا وێنـەی سـاتێك هەڵـدەگرێ، بەڵکوو وەك فیلم گرێك، بە درێـژایی کـات فیلمـی بزاوتــی مرۆڤــەکان و ڕەوتــی ڕووداوە گرنگــە مێژووییەکانیان بە درێژایی مێژوو گرتووە.

### کاریگەرییە سێ لایەنیەکان

کۆمەڵناسـی دەکەوێتـە ژێـر کاریگـەریی سـێ باندۆری دەرەکییەوە کە بریتین لە:

یەکـەم ئـەوەی کـە کۆمەڵناسـی لـە یەکـەمین قۆناغەکانەوە لە فەلسەفەی مێژووەوە وەرگیراوە کــە بــۆ خــۆی لــە ژێــر بانــدۆری فەلــسەفەی مرۆڤدایــە. توێــژەران و بیریــارانی ســەدەی هەژدەهــەم و نۆزدەهــەم لــە سـەردەمی خۆیانـدا زۆرتــر مرۆڤێکیــان بــەدی دەکــرد کــە خــەریکی

رزگارکردنی خۆی لە رابردوویەکی خنکێنەر و هەڕەشەکەر بووە و هەر لەم رووەوە ئەوان بە دوای ناسینی ئەو هەوڵە بەربڵاوو فراوانانەدا گەڕاون کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئازادی دراون. هەروەها هەوڵیان داوە لە قۆناغە جیاوازەکانی ئەم بزاوت و تێکۆشانە بگەن و لە هەمان کاتدا ساتە جیاوازەکانی وەرچەرخان و گۆڕانی (تکامل) بەرە بەرەی کۆمەڵگا جیاوازەکان لێك جیا بکەنەوە. لەم نێوەدا کۆمەڵناسی بوو بە ئامرازێك لە دەستیاندا کە هەم لێکدانەوەی ئەو رێگایەی دەکرد کە بەرەو ئازادی نراوەو هەم ئەو رێگایەی کە هێشتا درێژەی هەیە.

دووهەم ئەوەی کە تیۆرییەکانی گۆڕانخوازەکان (پێڕەوانی قوتابخانەی گۆڕانخوازی لە بایۆلۆژیدا) بوون بە نموونەیەکی شایانی کەڵك لێوەرگرتن لە گۆڕانکارییە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا. رەنگە ئەمرۆکە گرنگییەك بەو باندۆرانەی نەدەن کە بەرهەمەکانی لامارك و داروین لەسەر زانستە مرۆڤایەتییەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بوویانە، بەڵام سەرەڕای ئەوە ئەم کاریگەرییانە هێندە قووڵن کە بەبێ لەبەرچاوگرتنیان ناتوانین پاساوی ئەو ناوبانگەی بدەینەوە کە مرۆڤناسی و کۆمەڵناسی لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیە، بەتایبەت لە وڵاتانی ئەنگلوساکسۆندا بوویانە. جگە لەمە پیشاندانی ئەم راستییەش دژوار نییە کە دەنگدانەوەی قوتابخانەی گۆڕانی داروین هێشتا لە کۆمەڵناسی و مرۆڤناسیی ئەم سەردەمەدا رەنگدەداتەوە.

لە کۆتاییشدا پێویستە ئاماژەیەك بە باندۆری مێژوو لەسەر کۆمەڵناسی بکرێت کە زۆر جار لەبەرچاو ناگیردرێت لە کاتێکدا کە دەتوانین بڵێین برێك لە لقەکانی کۆمەڵناسی لەسەرەتادا وەك جۆرێك لە مێژووی کۆمەڵایەتی یا وەك شێوازێکی زانستی لە مێژوودا پێناسە کراون.

لە ئەڵمانیدا، کۆمەڵناسی بەشێوەی پەرچەکردارێکی دژ بە مێژوو تەنیا وەك هەواڵنووسێك دەرکەوتووە، واتە دژ بەو مێژووەی کە تەنیا پشت بە رووداوە ئەبستراکت، تاك کەوتوو و تایبەتەکان دەبەستێ و لە نێو دیاردە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا تەنیا لە رووداوە تایبەتە دووبارە نەبووەکان دەکۆڵێتەوە. بەم پێیە مێژوو، خۆی وەك زانستێکی سەربەخۆ رەت دەکاتەوە و گرنگایەتی خۆی تەنیا لە پێوەندییەکی هەرە گچکە لە رەوتی رووداوەکاندا بەرتەسك دەکاتەوە.

لەلایەکی دیکەوە ماکس ڤێبێر دژ بەم بیرکردنەوە راوەستاو کۆمەڵناسیی وەك لقێك لە مێژووی بەراوردی و پاساودەرانە هێنایە بەرباس.

### کاریگەریی قوتابخانەی ئەرك گەریی (فۆنکسیۆنالیزم)

زۆربەی بۆچوونەکان لەسەر ئەم بڕوایەن کە پاش ئەو هەوڵەی کە لەلایەن یەکەمین کۆمەڵناسەکانەوە لە پێناو پێکهێنانی کۆمەڵناسییەکی مێژووییدا درا، قوتابخانەی ئەرکگەریی، ئەم نەریتەی گۆڕی و کۆمەڵناسیی لە ریزی زانستێکی مێژوویی یا زانستێکی

بابەتی توێژینەوەی مێژوو هێنایە دەر. لە راستیدا وەك باسمان کرد فۆنکسیۆنالیزم بەرهەڵستی قوتابخانەی گۆڕان بووەوە کە لەسەدەی نۆزدەهەمدا برەوی هەبوو. لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە بێ بایەخ بوونی زانستیی شێواز و کۆبەندییەکانی لایەنگرانی قوتابخانەی ئەرکگەریان (بەپێی بۆچوونی سپنسەر) وەدەرخست و بە جێگەیان شێوازێکی پتەوتر و بەردەوامتریان بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی کۆمەڵگا هێنایە ئاراوە. ئەوان بە ناساندن و پێشنیاری ئاراستەیەکی نوێ بۆ شیکردنەوەو لێکدانەوەی کێشە کۆمەڵایەتییەکان، زۆربەیان بەم ئاراستەیەدا رۆیشتن کە رێکخراو و ئەرکەکانی کۆمەڵگا تەنیا لە ساتێکی دیاریکراو لە گۆڕانیدا بخەنە بەر راڤە و لێکدانەوە و بەم جۆرە فۆنکسیۆنالیزمیان وەك قوتابخانەیەك دیاری کرد کە نە گرنگییەك بە مێژوو دەدات و نە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە.

لێرەدا دەبێ ئەم خاڵە دەستنیشان بکرێت کە فۆنکسیۆنالیزم بە تایبەت لەلایەن خەڵکناسانەوە پێناسەو بەکارهێنراوە، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانی بابەتی توێژینەوەیان، مێژوویەکی دیارو روونیان نەبووە و هەر ئەم کێشەیەش هۆکارێکی هەرە گرنگە لە شێوازی روانین و بۆچوونی لایەنگرانی فۆنکسیۆنالیزم بۆ کێشە کۆمەڵایەتییەکان. ئەم خەمساردییە بەرامبەر بە خوێندنەوەی کۆمەڵگا لە روانگەی مێژووییەوە، بۆتە هۆی بەرتەسکی و سنوردارێتییەکی بەربلاو لە توێژینەوەکانی و لە راستیدا ئیدە سەرەکییەکانی ئەم قوتابخانەیەی بێ سوود کردووە. ئەم خەمساردییە لە سەرەتای ئەو ماوەی دوو یا سێ دەیەیەدا کە فۆنکسیۆنالیزم باڵی بەسەر کۆمەڵناسی و خەڵکناسیدا کێشابوو، بوو بە هۆی ئەوەی کە نەریتی مێژووخوازی لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا نە گرنگییەکی لە لێکۆڵینەوە تیۆرییەکاندا هەبێ و نە لە لێکۆڵینەوە تاقیکراوەییەکاندا، و سەرنجی کۆمەڵناسان تەنیا لەسەر روونکردنەوەو شیکردنەوەو لێکدانەوەی پێکهاتە و ئەرکەکانی رێکخراوی کۆمەڵایەتی چەقی بەستبوو.

**توێژینەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەلایەن هەندێك لە ئەرکگەراکانەوە:**

لەگەڵ ئەوەشدا سەرەڕای ئەو شتانەی کە جاروبار دەبینرێن، نابێ پێمان وابێ کە فۆنکسیونالیزم دەستی لە هەرچەشنە توێژینەوەیەك سەبارەت بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی کێشاوە، چونکە هەر لەم سەردەمەدا، ژمارەیەکی زۆر لە توێژەران گەلێك شیکردنەوەی سەرنجڕاکێشیان یا لە پێوەندی لەگەڵ هەندێك هۆکاردا یا سەبارەت بە چۆنیەتی گۆڕان هەبووە. تەنانەت دەیویست کینگزلی لەم بوارەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە هەندێك لە باشترین شیکارییەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە بەرهەمەکانی ئەو توێژەرانەدایە کە وەك فۆنکسیۆنالیست ناوبانگیان دەرکردووە. بۆ وێنە ناتوانین گرنگی و بایەخی هەندێك توێژینەوەی وەك ئەوەی کە کروبێر سەبارەت بەو گۆڕانکارییانەی کردوویەتی کە بەرهەمی راهێنان، تەکنیك و

زانیارییەکانن، یا ئەو شیکارییە زۆر وردەی کە بارێنت لە پێوەندی لەگەڵ هەندێك نموونەی جۆراوجۆری تازەگەری لە کۆمەڵگا دێرینەکان و لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا کردوویەتی، بە هێند وەرنەگرین. لە کۆمەڵناسیشدا رۆبێرت مێرتۆن کە رۆڵێکی بەرچاوی لە فۆنکسیۆنالیزمدا هەبووە، شیکارییەکی سەبارەت بە رۆڵی فاکتەرە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتی- کولتوورییەکان لە گۆڕانی زانیارییە زانستی و تەکنۆلۆژیەکاندا کردووە. لە بەشەکانی داهاتوودا بەرهەمەکانی دێنینە بەر باس.

هەروەها لەم نێوەدا دەتوانین ئاماژەیەك بە نیل سمیلسەر بکەین کە یەکێك لە هاوکارانی پارسۆنز بووەو شیکارییەکی گرنگی سەبارەت بە رێکخراوو کاری پیشەسازی، پاش هاتنەئارای بەرەبەرەی مەکینە لە پیشەسازیی قوماش، ئینگلیزی سەدەی هەژدەو نۆزدەدا کردووە.

هەڵبەت لەم بوارەدا دەتوانین کەسانێکی دیکەش بخەینە ریزی ئەم توێژەرانەوە بەڵام هەر ئەم نموونەگەلە بەسن بۆ دەرخستنی ئەم راستییە، کە لە کۆمەڵناسیدا نەریتی توێژینەوە مێژووییەکان کۆتاییان پێنەهاتووە، سەرەڕای ئەوەی کە لە سەردەمی هەژمونیی فۆنکسیۆنالیزمدا وەستانێك لەم توێژینەوانەدا پێکهات.

### گەڕانەوە بۆ توێژینەوە سەبارەت بە گۆڕان

لەم سالانەی دواییدا، لە کۆمەڵناسیدا بەریانێك بۆ توێژینەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی هاتۆتە ئاراوە. بۆ تێگەیشتن لەم راستییە بەس دەبێ ئاورێك لە رێژەی ئەو کتێبانە بدەینەوە کە لەم سالانەی دواییدا لەم بوارەدا نوسراون یا چاوێك بەسەر کورتەی ئەو وتارانەدا بگێڕین کە لە گۆڤارە گرنگە کۆمەڵناسییەکاندا بلاوبوونەتەوە. توێژینەوە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بەردەوام لە زێدەبووندایە و لەم بارەوە کۆمەڵێك هۆکاری بەرچاو دەبینرێن کە ئێمە تەنیا گرنگترینیان دەخەینە بەرباس.

### بێداریی جیهانی سێهەم

بێداریی وڵاتە گەنجەکان، هەوڵیان بۆ رزگاری لە دواکەوتوویی و ئەو گۆڕانە ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و کلتوریانە کە لەم وڵاتانەدا هاتوونەتە ئاراوە، سەرنجی گەلێك لە کۆمەڵناسانی بۆ لای خۆی راکێشاوە. بەهۆی هەندێك رووداوی گرنگەوە سیستمی کۆن ئارامی لەم چەشنە وڵاتانەدا تووشی سستی هات و ئەو مەیل و نەریت و شێوە بیرکردنەوانەی کە تا ئێستا بەسەر کۆمەڵگادا زاڵ و جێگای پەسەندی گشتی بوون بەرەو لاوازی رۆیشتن. بەم چەشنە جیهانی سێهەم پێکهات لە وڵاتانی جۆراو جۆر، جیاواز و لە هەمان کاتیشدا هەرکام بە هەندێك تایبەتمەندیی جیاوازەوە، کە لایەنی هاوبەشی تێکڕای ئەم وڵاتانە گۆڕان و گەشەسەندن بوو لە رەوتێکی خێرا و هەندێك جار لە ناکاو و چاوەڕوان نەکراودا. لە هەمان کاتدا دەوڵەتەکانی وڵاتە کۆلۆنیالیستەکان و خاوەن

پیشەسازییە گەورەکانیان بە دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە چاویان بڕیبووە ئەم گۆڕانانە. بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییە گەورەکانی ئەم وڵاتانە کەوتبووە مەترسییەوە و هەر بەم بۆنەوە بە گشتی لە هەوڵی ئەوەدا بوون، تا رادەیەك كە بۆیان دەكرێت لانی كەم بەرژەوەندییە سەرەکی و ژیانەکییەکانیان لە مەترسی لەناوچوون رزگار بکەن. لەم رووەوە دەوڵەتەکان لە هەندێك بابەتدا دەستیان دایە هاندانی توێژەران بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی بە هەندێك مەبەستی تایبەتی جێگای پەسەندی خۆیانەوە و ئەم سیاسەتە سالآنێکی زۆر درێژەی هەبوو. فەرانسە و بەریتانیا لە مێژ ساڵ بوو كە تێچووی توێژەران و دامەزراوە توێژینەوەییەکان و هاندانیان لە کۆلۆنییەکانی خۆیاندا گرتبووە ئەستۆ ئاکامی ئەم لێکۆڵینەوانە رێگای بۆ وڵاتە کۆلۆنیالیستەکان دەکردەوە کە بەشێوەیەك کۆلۆنییەکانیان بەڕێوەبەرن کە زۆرترین کەڵکی لێوەربگرن.

پاش بزاوتە دژە کۆلۆنیالیستییەکان، یارمەتییە ماڵییەکان لە بواری لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان بە تایبەت لە ئەمریکادا بەرەو زۆربوون رۆیشت بە چەشنێك ئامانجە سیاسی و ماڵییەکان پتر لە جاران لەبەرچاوگیران.

**قەیران لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا**

تارادەیەك هەر لەم سەروبەندەدا زۆربەی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان خۆیان لە بەردەم هەندێك قەیرانی قووڵی بنچینەییدا دەدیتەوە و هەندێك بیچمی نوێ لە ئایدۆلۆژییە توندڕەوەکان سەریانهەڵدا. هەو بووە ئاشتیخوازو تەریککەوتووەکانی رۆژگارانی رابردوو بەلایەنگری لە دنیایەکی ئاشتەوایی و دۆستانە بەرەو بزاوتێکی هیچگەری فۆرمیان گۆڕی. هەر لەم کاتەدا هەندێك گرووپی چەپ و راستی دیکە بۆ جێگیرکردنی رژێمێك و یا بە مەبەستی سەقامگیرکردنی سیستمێکی نوێ هانایان دەبردەبەر کردەوەی توندوتیژی. لەلایەکی دیکەوە لاوەکانیش وەك ناڕەزایەتی دەربڕینێکی بەکۆمەڵ بەرامبەر بە کۆمەڵگای پیشەسازیی بوروکراتیك و سەرمایەداری و بە مەبەستی لایەنگری و پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی خاوێن و دادپەروەرانە رادەپەڕین. دژایەتی توندی بەهاکان، پێداچوونەوە لە ئایدۆلۆژییە دەسەڵاتدارەکان و گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکانیش لەو دیاردانەی دیکە بوون کە لەو سەردەمەدا لە حاڵی پێکهاتندا بوون.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، لە راستیدا کۆمەڵناسی بەپێی رەوتی سەردەمەکەی گۆڕانی بە خۆوە دیتووە، بۆیە سروشتییە کە سەرنجی ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵناسان بەلای ئەو دیاردە تازە سەرهەڵدراوانەدا رابکێشرێت و لە ئاکامدا بکەونە لێکدانەوە و شیکردنەوەی رەگ، هۆکار و گۆڕانکارییەکانیان.

**باندۆری کۆمەڵناسیی مارکس**

جگە لەو شتانەی کە باسمان کرد، پێویستە ئاکامی بەرهەمەکانی مارکسیش لەبەرچاو بگیردرێن. هەتا سی ساڵی لەمەوبەر بەشێکی زۆر کەمی کۆمەڵناسەکان دانیان بە مۆرك و

قورسایی بۆچوونەکانی مارکس لە بیرۆکەکانی مێــژووی کۆمەڵناسـیدا دەنـا. مارکـسیان وەك فەیلەسـووف، ریفۆرمخـواز یـا رێنوێنیکـەرێك دەناسـی نـەوەك کۆمەڵناسـێك، لـە کاتێکـدا کـە ئـەمڕۆ بەشـێك لـە کۆمەڵناسـان مـارکس بـە پێشەنگی سەرەکی سیستمێکی هزریی خۆیان دەزانن و کۆمەڵناسانی ئێستا بە مارکسیست و نامارکسیـــستەوە لـــە هـــەوڵی ناســـینەوەی کۆمەڵناسیی مارکس، یـا پەسـەندکردنیدان. لـە نێـو کۆمەڵناسـانی لایـەنگری مارکسدا، هـانری لــوفێر و لوســیان گۆڵــدمان لــە ریــزی ئــەو کەســانەدان کــە بۆچــوونە کۆمەڵناســییەکانی مارکس زۆرترین باندۆری لە سەریان داناوە.

بەلاَم لە نێو کۆمەڵناسە نامارکسیستەکاندا، ئەوانەی بەلای مارکسدا مەیلیان هەبووە زۆرتـر توێژەرانێك بوون کە هۆگری راڤە و لێکدانەوەی گــۆڕانی کۆمەلاَیــەتی بــوون، بــەلاَم شــێوازی فۆنکسیۆنالیستەکان بە قەناعەتی نەدەگەیاندن. لەم نێوەدا دەتوانین ئاماژە بە رایت میلز و راڵف دارنـــدۆرف بکـــەین و لـــە نێـــو کۆمەڵناســـە نامارکسیستەکاندا گورڤیچ، کە بۆ یەکەم جار بە تێرامـانێکی قووڵـەوە کۆمەڵناسـیی مارکـسی لێکدایەوە، جێگایەکی گرنگی هەیە.

لـە راسـتیدا بنەچـەی ئـەم هـەموو سـەرنجەی دراوەتـە کۆمەڵناسیی مـارکس لـەو هۆگربـوون و هەوڵـە نوێیانەدایـە کـە لـە بـواری توێژینـەوەی کۆمەڵناسـی لـە روانگـەی مێژوویـیـەوە دراون. بـەلاَم لـە هـەمان کاتـدا کۆمەڵناسیی مـارکس لـە رێژەیەکی زۆری کۆمەڵناساندا، بەریانێکی نوێی بــە ئاراســتەی توێژینــەوەی ئــەو گرفــت و کێـشانەوە بـەدیهێنا کـە پێوەنـدییان بـە گۆڕانـە کۆمەلاَیەتییـــەکانی کۆمـــەڵگا، وەك خـــەباتی چـینایەتی، بزاوتـە شۆڕشـگێڕییەکان، گـۆڕانی پێکهاتی کۆمەڵگاو.. هتدیەوە هەیە.

بـەم جـۆرە پێکگەیـشتن و گرێـدانی بەریانـە روونـاکبیرییـــەکان و رووداوە مێژوویـیـــەکان، لـــە کۆمەڵناســـە هاوچـــەرخەکاندا بـــەریانێکی بـــۆ دەســـتپێکردنەوەی توێژینـــەوە لـــە رەوتـــەکانی گـــۆڕانی کۆمەلاَیـــەتی، هۆکارەکـــانی گـــۆڕان و گرفت و کۆسپەکانیاندا بەدیهێناوە.

### کێشەی کۆمەڵناسان لە توێژینەوەی گۆڕاندا

بـــە گـــشتی کۆمەڵناســـان لـــە بەرامبـــەر خوێندنــەوەو شــرۆڤەی گــۆڕانی کۆمەلاَیەتیــدا هەســـت بـــە دەستەوەســـتانی دەکـــەن. ئـــەوان سـکالاَیان لـە کـەمبوونی سیـستمێکی تیۆریـك، نـەبوونی تەکنیکـەکانی لێکۆڵینـەوە و ئـامێرە تایبەتەکانی دیتن و راڤە و پاساوی گۆڕانەکانی پێکهاتەی کۆمەلاَیەتی هەیە.

هەنـــدێك کـــەس ئـــەم کەموکوڕییـــە دەبەستنەوە بەو کاریگەرییە بەردەوامانەی کە فۆنکـــسیۆنالیزم لـــە خـــۆوە بـــەجێی هێـــشتووە. هەنـــدێکیش پێیـــان وایـــە کـــە فۆنکسیۆنالیزم لـە زانـستە مرۆییەکانـدا تـەنیا کاریگەرییـــەکی ســـاکاری هـــەبووە کـــە لـــە رەنگدانـەوەی چـینی ناوەندییـەوە سەرچـاوە دەگرێـــت کـــە زۆرتـــر لایـــەنگری پاراســـتنی بـــارودۆخی ئاراییـــە تـــا پێکهێنـــانی گـــۆڕان. هەندێکی دیکەش داکۆکی لەو تێزە دەکەن کە نـــەبوونی قەوارەیـــەکی راڤـــە و شـــرۆڤەی سیـــستماتیك، بۆتـــە هـــۆی دواکـــەوتوویی کۆمەڵناسیی چالاك.

ئەم لاوازییە هەر هۆکارێکی هەیە بابێ، لێرەدا تەنیا دەبێ بنەمایەکی حاشاهەڵنەگر لەبەرچاو بگرین کە کۆمەڵناسیی مێژوویی کە لە روانگەیەکی مێژووییەوە کۆمەڵگاکان دەخوێنێتەوە، تووشی هەندێك لاوازی هاتووە کە ئێمە لە خوارەوە ئاماژە بە گرنگترینەکانیان دەکەین.

**سێ خاڵی لاوازی کۆمەڵناسیی مێژویی هاوچەرخ**

پێش هەموو شتێك، کۆمەڵناسی هێشتا تیۆرییەکی گشتی نییە کە لە بیچمێکی گشتیدا راڤە و شرۆڤەی رێکخراوی کۆمەڵایەتی، مێژووی کۆمەڵایەتی یا گۆڕانی کۆمەڵایەتی کۆبکاتەوە و پێشکەشی بکات. لە راستیدا ئێمە لە کۆمەڵناسیدا، هاوتای فرۆیدمان لە دەروونناسیدا زۆر کەمە.

فرۆید تیۆری یا مۆدێلێکی کەسایەتی هێنایە ئاراوە و لە دەرەوەیدا وەك سیستمێك هەوڵی تێگەیشتنی ئەو کەسایەتییە مرۆییەی دا کە لە درێژایی ژیانی هەر کەسێکدا دروست و پوختە دەبێت. لە کۆمەڵناسیدا رەنگە بتوانین بڵێین تەنیا مارکس و ئەنگێلس لە پێشکەشکردنی مۆدێلێکی بەربڵاوی ئەوتۆدا تارادەیەك سەرکەوتوو بوون، مۆدێلێك کە لەیەك کاتدا هەم بەرهەمی روانگەی فۆنکسیۆنالیستی و هەم روانگەی مێژووییانە لە راستییە کۆمەڵایەتییەکان. بەڵام کۆمەڵناسییەکەیان لەبەرئەوەی کە خاوەن قەوارەیەکی فەلسەفی و کەنگەشەیی بوو کە تێیدا راڤە و پاساوەکانی کێشە کۆمەڵایەتییەکان بە نەرمی هەڵنەگرییەکی تایبەتەوە شرۆڤە دەکرا، بێ کەڵك مایەوە.

هەروەها یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کۆمەڵناسییە پشتبەستنی زۆرتریەتی بە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە تا بە مێژووی زانستەکانەوە، ئەمەش پیشاندەری ئەو راستییەیە کە کۆمەڵناسی لە خۆیدا دیاردەیەکی کۆمەڵناسانەیە کە لە ئاکامدا پێرەوی هەلومەرج و ناچارییە (جەبر) کۆمەڵایەتییەکانە.

بۆیە بەبێ لەبەرچاوگرتنی تیۆرییەکی گشتی، خوێندنەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە نێوان بوارە جیاوازەکانی شرۆڤە کۆمەڵناسانەکاندا خوێندنەوەیەکی تایبەتەو ئێمە ناچارین مێژووخوازی لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا وەك دیاردەیەکی جیایی هەڵنەگر لە راستییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە لەبەرچاو بگرین. هەرچەند کۆمەڵناسان راشکاوانە هیچ بەریانێکیان (ئینتیما) بۆ ناسینەوەی ئەم لایەنە لە کۆمەڵناسی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بەردەوام بەرەو رووی جیاوازی دانانەکەی ئاگۆست کۆنت دەبینەوە لە نێوان کۆمەڵناسیی ئێستاتیك و کۆمەڵناسیی دینامیکیدا. کۆمەڵناسانی هاوچەرخ لە بەکارهێنانی ئەم تێرمینۆلۆژیایە خۆدەبوێرن بەڵام نووسەران لە تێکرای باس، کتێب و گۆڤارە کۆمەڵناسییەکاندا، خۆیان ناچار لەوەی دەبینن کە بەش یا پاژێك بۆ توێژینەوەی "گۆڕانی کۆمەڵایەتی" تەرخان بکەن.

سێهەمین لاوازیی کۆمەڵناسیی گۆڕان، لە دوانەکەی دیکە گرنگترە. دەکرێ ئەم پرسیارە بێتە ئاراوە کە ئایا بەراستی تیۆریی

کۆمەڵناسیی گۆڕان بوونی هەیە؟ ئەگەر تیۆرییەکی ئەوتۆ لە ئارادا بێت، دەبێ بتوانین ڕووداوەکانی داهاتووی پێ بخوێنینەوە و لە ڕاستیدا تاقیکردنەوەی ئەم خوێندنەوانە تەنیا تێستێکە کە دەتوانین سەنگ و دروستیی هەموو تیۆرییەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی پێ هەڵبسەنگێنین. کەوابوو پێویستە کۆمەڵناسان لەم بابەتە تێبگەن کە ناتوانن پێشگۆییەکی زانستی بکەن، کەوابوو چۆن دەتوانین بڵێین لە کۆمەڵناسیدا، تیۆرییەکی بایەخدارمان بۆ گۆڕان هەیە؟ لە ڕاستیدا ئەمە پرسیارێکی شایانی سەرنج و تێبینیە کە دوایی بۆی دەگەڕێینەوە.

### پەرەسەندن (تحول) و گۆڕانی کۆمەڵایەتی

پێش ئەوەی کە بڕۆینە سەرباسی کێشە و گرفتە بنچینەییەکانی پێوەندیدار بە توێژینەوەی کۆمەڵگاکان لە ڕوانگەی مێژووییەوە، پێویستە لەم بوارەدا هەندێك پێناسە و پۆلێن بەندی بکەین.

1-پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی

سەرەتا دەبێ جیاوازی دابنێین لە نێوان پەرەسەندن و گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا. بەشێوەیەکی باو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بە کۆمەڵە گۆڕانێك دەزانرێ کە لە ماوەی سیکلێکی دوورودرێژ واتە لە ماوەی یەك یا ڕەنگە چەندین نەوە لە کۆمەڵگادا ڕوودەدات. کەوابوو بەپێی ئەم پێناسەیە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵە پرۆسەیەکە کە لەماوەیەکی کورتخایەندا بەدیناکرێت. پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دەتوانین وەك دیمەنێکی تاك لەبەرچاو بگرین کە لە کۆمەڵە کەرتێك پێکهاتووە و لە بەرزاییەکی زۆرەوە نەبێ نابینرێت.

2-گۆڕانی کۆمەڵایەتی

بە پێچەوانەوە گۆڕانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە دیاردەگەلێکی شایانی دیتن و لێکدانەوە لە ماوەیەکی کەمی کاتیدا بەشێوەیەك کە هەر کەسێکی ئاساییش دەتوانێ لە ماوەی ژیانی خۆی یا لە ماوەی سیکلێکی کورتی ژیانیدا بۆ خۆی بەدواداچوونی گۆڕانێك بکات، یا ئاکامە لێبڕاوەکەی ببینێت، یا لە ئاکامە کاتییەکەی تێبگات.

جگە لەمەش گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە بازنەی قەوارەیەکی جوگرافیایی و کۆمەڵایەتیی دیاریکراودا سەرهەڵدەدات و لەم بارەوە جیاوازییەکەی لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی لەوەدایە کە دەتوانین ئەم لە چوارچێوەی قەوارەیەکی جوگرافیایی یا لە بازنەیەکی کۆمەڵایەتی – کولتووری بەرتەسکدا شرۆڤە بکەین.

### گرنگایەتی ئەم لێك جیاکردنەوەیەی سەرەوە

لێکجیاکردنەوەی پەرەسەندن و گۆڕانی کۆمەڵایەتی شایانی گرنگایەتییەکی زۆرە. لە ڕاستیدا یەکەمین کۆمەڵناسەکان بەریانی توێژینەوەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتییان هەبوو تا توێژینەوەی گۆڕان، کەسانێکی وەك ئاگۆست کۆنت، مارکس، ئێسپێنێر و دورکهایم زۆرتر بەریانی راڤە و پاساوهێنانەوەی پەرەسەندنی کۆمەڵگا مرۆییەکان، مرۆڤایەتییان لە ماوەی سەدەکاندا هەبووە. لە کاتێکدا کە لە کۆمەڵناسیی هاوچەرخدا، دیاردەی گۆڕانی

کۆمەڵایەتییە کە سەرنجی کۆمەڵناسان رادەکێشێ.

نەریتی ئارەزووی توێژینەوەی لایەنی مێژوویی کۆمەڵگا کە پێشتر ئاماژەمان پێدابێ گۆڕان نەماوەتەوە و کۆمەڵناسیی دینامیك کە ئەورۆکە باسی دەکرێت، بە هەمان واتا و نێوەرۆکێك نییە کە ئاگۆست کۆنت باسی دەکرد، چونکە ئاگۆست کۆنت لە کۆمەڵناسییەکەی خۆیدا شیانی توێژینەوەی گۆڕانێکی گەورەی مێژووی مرۆیی دەدیت لە کاتێکدا کە پانتایی روانگەی کۆمەڵناسیی دینامیکی سەردەمی ئێمە تەنیا لە هەندێك گۆڕانی زۆر چکۆلەدا بەرتەسك دەبێتەوەو بەم هۆیەشەوە لە بەرامبەر قوتابخانەی فۆنکسیۆنالیزمدا، کۆمەڵناسیی پەرەسەندن سەریهەڵدا، نەك کۆمەڵناسییەکی گۆڕان.

## چەمکی گۆڕانی کۆمەڵایەتی

لێکجیاکردنەوەیەکی دیکە لەلایەن پارسۆنزەوە پێشکەش کراوە سەبارەت بە گۆڕانی هاوسەنگی و گۆڕانی پێکهاتە. بە کورتی دەتوانین پێناسەکەی پارسۆنز لە گۆڕانی هاوسەنگی و گۆڕانی پێکهاتە بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

1–لە نمونەی یەکەمدا، بەبێ ئەوەی گۆڕانێك لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا دروست بێت، هاوسەنگیی ئارایی جێگای خۆی بە هاوسەنگییەکی نوێ دەدات بە واتایەکی دیکە سیستم بە شێوەی کۆیەك دەمێنێتەوە. ئەم هاوسەنگییە نوێیە بەدوای کۆمەڵێك گۆڕان لە هەندێك لە بەشەکانی سیستم یا وردە سیستمدا دێنە ئاراوە. بە باوەڕی پارسۆنز گۆڕان لە هاوسەنگیدا دیاردەیەکی ئاسایی و بەردەوامە لە ژیانی سیستمی کۆمەڵایەتیدا.

2–ئەگەر هێزەکانی کاریگەر لە گۆڕانەکەدا زۆر بەهێزبن و ئەگەر ئەو زەختەی کە لە دەرەوەو ناوەوە لەسەر سیستمەکە کاریگەری دادەنێت بەهێز بێت، ئەو گۆڕانەی کە لە گۆڕانی هاوسەنگی دەکەوێتەوە بە تەواوەتی جیاواز دەبێت، بەشێوەیەك کە گۆڕانی قووڵی هەموو سیستمەکەی لێدەکەوێتەوە،ئەم گۆڕانە بە گۆڕانی پێکهاتەیی ناوزەدکراوە.

ریچارد لاپییێر بە مەبەستی دەستنیشانکردنی گۆڕانی کۆمەڵایەتی، ئەوەی لە هەر شتێکی دیکە کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی نییە جیاکردۆتەوە.

سەرەتا دەبێ گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە رووداو جیابکرێتەوە، بۆ نموونە هەڵبژاردن رووداوێکەو هەر بەم بەراوردە مانگرتنێك، ئەنجومەنێك یا ئاگرگرتنێکیش دەچێتە خانەی رووداوەوە. روداو دەتوانێ بەشێك لە گۆڕان بێت، هاوڕێ گۆڕان یا هاندەری بێت، بەڵام پێویست نییە بەردەوام وابێت. ئاگر گرتنێك، هەڵبژاردن یا مانگرتنێك لە خۆیدا گۆڕانی کۆمەڵایەتی لێناکەوێتەوە، گۆڕانکاریی پێرسۆنێلیش ناچێتە خانەی گۆڕانی کۆمەڵایەتییەوە، چونکە ئەمە گۆڕانێکی بێ وەستانە، بەم شێوەیە کە لە هەر کۆمەڵگایەکدا بەردەوام نەوەی نوێ جێگای نەوەی کۆن دەگرێتەوە و هەر بەم بەراوردە لیژنەیەکی کارگێڕیی نوێ لە جێگای لیژنەی بەڕێوەبەریی کۆن هەڵدەبژێردرێ و حیزبێکی نەیار بە دەسەڵات دەگات.. هتد.

لە هەندێك كاتدا گۆڕانكاری لە قەوارەدا نیشانەی سەرهەڵدانی گۆڕانێكی كۆمەڵایەتییە كە دەسپێك یا ئاكامی گۆڕانێكی كۆمەڵایەتی رادەگەیەنێ بەڵام پێویست نیە بەردەوام وا بێت.

لە ژیانی كۆمەڵایەتیی رۆژانەدا، گەلێك ئاڵوویری لەم چەشنە لە نێوان تاكەكاندا دەكرێ:

ئاڵوویری سەروەت و دارایی، خەڵاتەكان، زانیارییەكان، مافەكان، بەرپرسایەتییەكان و.. هتد كە زۆربەی ئەم ئاڵوویرانە هەر ئەو شتانەن كە پارسۆنز ناوی "گۆڕانەكانی هاوسەنگی" یان لەسەر دادەنێت بەڵام پێویست نیە ئەم گۆڕانگەلە كاریگەرییان لەسەر پێكهاتەی رێكخراوی كۆمەڵایەتی هەبێت. بەڵام بە پێچەوانەوە كاریگەریی رێژەیەكی زۆری ئەم ئاڵودێرانە بەشێك لە ئەركە ئاساییەكانی رێكخراوی كۆمەڵایەتین. بەواتایەكی دیكە ئەم گۆڕانگەلە لە بنەڕەتدا گۆڕانگەلێك نین كە بتوانن لە پێكهاتەی رێكخراوی كۆمەڵایەتیدا گۆڕان پێكبێنن. بە باوەڕی پارسۆنز ئەم گۆڕانگەلە تەنیا لە نوێكردنەوەی بەردەوامی هاوسەنگیی سیستمی ئاراییدا، رۆڵیان هەیە و هەر لەم رووەوەش پارسۆنز وەك "گۆڕانەكانی هاوسەنگی ناویان دەبات كە جیاوازییەكی زۆریان لەگەڵ "گۆڕانە پێكهاتەیی"یەكاندا هەیە.

لە كۆتاییدا دەبێ ئەمەش بڵێین كە ناتوانین ناوی گۆڕانی كۆمەڵایەتی لەسەر گۆڕانێك دابنێین كە تەنیا یەك یا چەند كەسێ دەكەونە ژێر كاریگەرییەوە. بە واتایەكی دیكە گۆڕانی باوەڕ یا ئاكاری ژمارەیەكی كەم لە تاكەكانی كۆمەڵگا ناچێتە خانەی گۆڕانی كۆمەڵایەتییەوە، مەگەر ئەوەی كە ئەم گۆڕانی باوەڕ یا شێوازی هەڵسوكەوت و تێگەیشتنە لە ئاستێكی هەرە بەربلاودا بێتە ئاراوە.

### ئەو دیاردانەی كە دەچنە خانەی گۆڕانی كۆمەڵایەتییەوە

راڤە و لێكدانەوەی ئێمە لەو دیاردانەی كە ناچنە خانەی گۆڕانی كۆمەڵایەتییەوە، لە ناسینەوەی گۆڕانە كۆمەڵایەتییە راستەقینەكاندا یارمەتییەكی زۆرمان دەدەن، بەم چەشنەی كە:

**یەكەم،** گۆڕانی كۆمەڵایەتی وەك پێویست دیاردەیەكی بە كۆمەڵە، بە واتایەكی دیكە، پێویستە گۆڕانی كۆمەڵایەتی، كۆمەڵگایەك یا بەشێكی گرنگ لە كۆمەڵگایەك لەخۆبگرێت. گۆڕانی كۆمەڵایەتی دەبێ هەلومەرج بیچمی ژیان یا بواری هزری و گیانی ئاستێكی بەربلاوی یەك كۆمەڵگا واتا گەلێك زۆرتر لە چەن كەس بگۆڕێت و بۆ دەستنیشان كردنی گۆڕانێكی كۆمەڵایەتی ئەمە بنەمایەكی گرینگە.

**دووەم،** گۆڕانی كۆمەڵایەتی دەبێ گۆڕانێكی پێكهاتەیی بێت واتا گۆڕانێك كە لە تەواوەتیی رێكخراوی كۆمەڵایەتی یا لە هەندێك لە بەشە پێكهێنەرەكانی رێكخراوی كۆمەڵایەتیدا رووبدات و لە راستیدا كاتێك دەتوانین باس لە گۆڕانی كۆمەڵایەتی بكەین كە توانای ناسینەوەو دەستنیشانكردنی روونی ئەو توخمە پێكهاتەیی یا كولتوورییانەی رێكخراوی كۆمەڵایەتیمان هەبێت كە ئاڵوگۆڕیان بەسەردا

هاتووه. بۆ وێنە ڕەنگە مانگرتنێك، چاك بوونی دۆخی مووچەی کرێکاران و چوونە سەرەوەی ئاستی ژیانیانی لێبکەوێتەوە، بەپێی ئەو پێناسەیەی کە پێشتر کردمان ئەمە "گۆڕانێکی هاوسەنگییە" و ناتوانێ گۆڕانێك لە پێکهاتەدا بێت، بەڵام ئەگەر بکرێت هەندێك لەو ئاڵوگۆڕانەی کە ئەم مانگرتنە لە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتیی کارخانە یا دامەزراوەی پێوەندیداردا پێکی دێنێ، وەك گۆڕان لە دابەشکردنی دەسەڵات، گۆڕان لە تۆڕەکانی پێوەندی و هتددا بەدی بکرێن یا تەنانەت ئەگەر بکرێت کاریگەرییەکانی ئەم گۆڕانگەلە لەسەر دامەزراوە هاوچەشنەکانی دیکە ڕەچاوبکرێن، ئەو کات دەتوانین بڵێین کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی ڕوویداوە.

**سێهەم**، گۆڕان پێکهاتەیی لە درێژایی کاتدا جێبەجێ دەبێت. بە واتایەکی دیکە دەبێ بتوانین لە نێوان دوو خاڵ یا چەند برگەی کاتیدا، کۆی گۆڕانکارییەکان یا ئاکامەکانیان دەستنیشان بکەین (بۆ وێنە لە نێوان کاتەکانی ($t1$, $t2$, $t3$)دا و لە ڕاستیدا تەنیا لە بەراورد لەگەڵ خاڵێکی دەسپێك یا سەرچاوەیەك لە رابردوودایە کە دەتوانین شیکاریی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بکەین و بەهای بۆ دیاری بکەین و بە لەبەرچاوگرتنی ئەم خاڵی دەسپێکەیە کە دەتوانین بڵێین گۆڕانێك هاتۆتە ئاراوە و پانتایی و چۆنیەتی ئەم گۆڕانە شرۆڤە بکەین.

**چوارەم**، بۆ ئەوەی کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە ڕاستیدا گۆڕانێکی پێکهاتەیی بێت پێویستە بەردەوام و پتەو بێت و بە واتایەکی دیکە تەنیا روکەش و کاتی نەبێت.

لە کۆتاییدا بە لەبەرچاوگرتنی ئەو چوار تایبەتمەندییەی سەرەوە کە باسکران دەتوانین بە کورتی بڵێین کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی کاریگەریی دەبێ لەسەر ڕەوتی مێژوویی یەك کۆمەڵگا. بە واتایەکی دیکە ئەگەر گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیی تایبەت رووی نەدەدا، کۆمەڵگایەکی دیاریکراو بە ئاراستەیەکی جیاوازدا دەچوو. پڕ دیارە کە سەلماندنی ئەم قسەیە لە کردەوەدا گەلێك دژوارە لەبەرئەوەی کە بەدەستەوەدانی مێژوویەکی گریمانەکراو کارێکی ئێجگار ورد و دژوارە، چونکە پێکهێنانەوەی لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی نەشیاوە، بەڵام بەهەرحاڵ شێوازێکە کە لەوانەیە زانستی کۆمەڵایەتی زۆرتر پەنای بۆ بەرێت.

## پێناسەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی

ئەوەی کە لە سەرەوە باسمان کرد رێنوێنیمان دەکات بۆ پێشکەشکردنی پێناسەیەکی تەواوی ساکار و روون لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی. بۆیە بە لەبەرچاوگرتنی پێناسەکانی سەرەوە، گۆڕانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە گۆڕانێکی شایانی دیتن لە ماوەی کاتدا بە شێوەیەك کە کاتی و کورتخایەن نەبێت، باندۆری لەسەر پێکهاتەو ئەرکەکانی رێکخراوی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگایەکەوە بێت و ڕەوتی مێژووییەکەی بگۆڕێت.

## گۆڕانی کۆمەڵایەتی – کردەوەی مێژوویی – پرۆسەی کۆمەڵایەتی

ئەو پێناسەیەی کە پێشتر لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی کردمان ئەو بوارەمان دەداتێ کە

بتـوانین جیاوازییـەك لـە نێـوان "كـردەوەی مێژوویی" و "پرۆسەی كۆمەڵایەتی"دا دابنێین. چونكە لە كۆمەڵناسیدا زۆربەی كات ئەم وشانە لەجێی یەكتر بەكاردەهێنرێن.

### كردەوەی مێژوویی

پێش هەموو شتێك دەبێ ئەم كێشەیە رەچاو بكەین كە كردەوەی مێژووییمان لەگەڵ گۆڕانی كۆمەڵایەتیدا تێك نەچێت پێوەندیی كردەوەی كۆمەڵایەتی لەگەڵ گۆڕانی كۆمەڵایەتیدا هەمان ئـەو پێوەندییەیـە كـە لـە نێـوان رێكخـراوی كۆمەڵایـەتی و كـردەوەی كۆمەڵایەتیـدا لـە ئارادایـە. كـردەوەی مێـژوویی و كـردەوەی كۆمەڵایـەتی تـەعبیر لـە چـالاكیی بكـەرە كۆمەڵایەتییەكان دەكەن و گۆڕان و رێكخراوی كۆمەڵایەتی، دەركەوتە بەرچاوو بەرهەستەكانی ئەم دووانەن.

كـەوابوو كـردەوەی مێـژوویی بریتییـە لـە سەرجەم چالاكییەكانی كۆمەڵگایەك كە ئەركی بزواندن، توند یا هێواش كردنەوە یا تەنانەت رێگرتن لە گۆڕانەكانی رێكخراوی كۆمەڵایەتیی لە گشت كۆمەڵگا یا لە هەندێك لە بەشەكانی كۆمەڵگای لە ئەستۆدایە.

لەگەڵ ئەمەشدا زۆر بە دەگمەن هەڵدەكەوێت كە تێكڕای تاكەكانی یەك كۆمەڵگا یا كۆمەڵێكی بەرتەسـك رۆڵیـان لـە كـردەوەی مێژووییـدا هەبێت، بەڵكوو زۆرتر هەندێك لەتاك، گرووپ یا تاقمەكانن كە لە كاتێكی دیاریكراودا ئاراستەی كۆمـەڵگایان لـەژێر كاریگەریدایـە و رۆڵێكـی چـالاك و كاریگـەر لـە مێژوویـدا دەبیـنن و لـە راسـتیدا لـە ژێـر كاریگـەریی هـەر ئـەم هۆكـارە چـالاكانەو فاكتەرانـەی گۆڕانەكـە كـردەوەی مێژوویی فۆرم دەگرێت و سەرهەڵدەدات.

پێویـستە ئامـاژە بـەم بابەتـە بكرێـت كـە كردەوەی فاكتەرەكانی گۆڕان یا لە نێوەرۆك یا لـە ئاهـەنگی گۆڕانـدا خـۆی دەبینێتـەوە، بـە چەشـنێك كـە هەنـدێك كـەس رۆڵـی داهێنـەری بۆچـوون، نوێكـاری و بـەها نوێیـەكان دەبیـنن و تاقمێكی دیكەش بە پێچەوانەوە لە بانگەشەی بۆچـوون و بـەها نوێیەكانـدا رۆڵ دەگێـڕن و بـەم شـێوەیە ئاهـەنگی گۆڕانەكـە تونـدتر دەكەنـەوە. بـــەڵام دەشـــێت هـــەر ئـــەم هۆكارانـــە رۆڵێكی نێگەتیڤیان لە دژایەتی لەگەڵ نوێكاری یـا لـە وەدرەنـگ خـستنی بڵاوبوونـەوەو بەڕێوەبردنیدا هەبێت.

ئەم خۆبواردنە شێلگیرانەیەش لە گۆڕان یا خـەبات بـە مەبەسـتی گۆڕانكـاری لـە بـاردۆخی ئارایی یەك كۆمەڵگایشدا بەشێكە لە كردەوەی مێژوویی. بەواتایەكی دیكە كردەوەی مێـژوویی هـەر بـەو چەشـنەی كـە دەتـوانێ لـە گۆڕانـدا كاریگەر بێت، لە رێگرتن لە گۆڕانیش كاریگەری دەبێت و دەتوانین بەشێوەیەكی سادەتر بڵێین كـە كـردەوەی مێـژوویی هـەم لـە پێكهێنـانی نوێكاریـدا رۆڵ دەبـینێ و هـەم لەوانەیـە لـە رێگـرتن لـە نوێكارییـەك. لـەم رووەوە دەتـوانین كـردەوەی مێـژوویی وەك لایـەنی هـەرە كۆمەڵناسانەی گۆڕانی كۆمەڵایەتی بێنینە ژمار. لە راستیدا كردەوەی مێژوویی لە چوارچێوەی كـردەوەی كۆمەڵایەتیدایـە و لـە رەهەنـدێكی كردەوەی كۆمەڵایەتی زیاتر شتێكی دیكە نیە، بـەڵام سـەبارەت بـە گـۆڕانی كۆمەڵایـەتی بـۆ پـشتڕاستكردنەوەی پێناسـەكەی پێـشوو دەبـێ

ئەمەی لێ زیادبکەین کە (گۆڕانی کۆمەڵایەتی) بریتییە لە گۆڕانێکی پێکهاتەیی کە لە کردەوەی مێژوویی تاقم یا گرووپگەلێك لە نێو کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دێتە ئاراوە. بە گشتی کردەوەی مێژوویی و گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە تەواوەتی پێکەوە پێوەندییان هەیە بەڵام ئەو ئەگەرەش لە گۆڕێدایە کە بە شێوازی راڤەیی لێکجیابکرێنەوە و بەم جۆرە دەتوانین بەبێ لەبەرچاوگرتنی هۆکارەکانی پێکهێنەری گۆڕانی کۆمەڵایەتی، بەجیا شرۆڤەی بکەین.

### پرۆسەی کۆمەڵایەتی

لەکۆتاییشدا پێویستە باسی پرۆسەی کۆمەڵایەتی بکەین کە زۆربەی جار لەلایەن کۆمەڵناسانەوە کەڵکی لێ وەردەگیردرێت و بەواتای زنجیرەیەك لە رووداو، دیاردە یا کردەوەگەلێکە کە بەگشتی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە. پرۆسەی کۆمەڵایەتی ئەم راستییەمان بۆ دەڵێتەوە کە رووداوەکان چۆن بەدرێژایی مێژوو روودەدەن، بەپێی چ پابەندیو لەسەر بنەمای چ ئاوڕێکییەك. کەوا بوو پرۆسەی کۆمەڵایەتی، پاساودەر و شرۆڤەگەری گۆڕان نییە بەڵکوو شوێن و رەوتی گۆڕانمان لە درێژایی کاتدا بۆ دەردەخات.

### هۆکارەکان، هەلومەرج و کارگێڕەکانی گۆڕان

ئەو لێکدانەوە، راڤە و جیاکردنەوەیەی کە لەسەرەوە سەبارەت بە گۆڕان و پرۆسەی کۆمەڵایەتی کردمان دەرەتانی لێکدانەوەی سێ دەستەواژەی دیکەمان پێ دەدەن کە زۆرتر لە باسی گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا باسەکەیان دێتە گۆڕێ. ئەوانەشی بریتین لە هۆکارەکان، هەلومەرج و کارگێڕەکانی گۆڕان.

### هۆکارەکانی گۆڕان

لە راستیدا هۆکاری گۆڕان تۆخمێکە لە ‌بارودۆخێکی دیاریکراو کە بەهۆی بوون یا لە رێگای کارەکەیەوە دەبێتە سەدەم (هۆ) یا بەدیهێنەری گۆڕانێك. بۆ وێنە بەکارهێنانی تەکنیکە نوێیەکان لە کارگەیەکدا دەتوانێ بەدیهێنەری کۆمەڵە گۆڕانێك لە شێوازی کار، رێکخستنی گروپەکان، ئاستی بەڕێوەبەری و هتد..دا بێت و هەر بەم پێیە دامەزراندنی کارگەیەك لەناوچەیەکی گوندیدا هەندێك گۆڕانی لە بازاڕی کارو جێگۆڕکێی کۆمەڵایەتیی حەشیمەت لێدەکەوێتەوە کە ئاکامەکەی دەبێتە گۆڕانکاری لە داب و نەریت، رەوشت، کولتوورو رێکخستنی کۆمەڵایەتیی لادێدا. هەروەها بەڕێوەبردنی چاکسازیی ئەرزی لە کۆمەڵگای لادێیدا، گۆڕانی ئابووری — کۆمەڵایەتی زۆری بەدوادا دێت. لە سێ نموونەکەی سەرەوەدا تەکنیك و کارگە و چاکسازیی ئەرزی بە هۆکارەکانی گۆڕان دەژمێردرێن.

### هەلومەرجی گۆڕان

هەلومەرجی گۆڕان ئەو توخمە گونجاو یا نەگونجاوانەن کە باندۆر یا باندۆرەکانی یەك یا چەند هۆکاری گۆڕان چالاکتر یا کزتر، توندتر یا لاوازتر دەکەن.

سەبارەت بەو نمونەیەی سەرەوە شێوازی بەرەورووبوونەوەی سەندیکا لە بەرامبەر گۆڕان

لەبەرچاو دەگرین. ئەو بۆچوونەی کە سەندیکا سەبارەت بە گۆڕان و ناردنی ئەم ئیدەو بۆچوونە بۆ کرێکاران هەیەتی، وەك هەلومەرجێك دەژمێردرێ کە رەنگە لە بەرامبەر ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە رێگای تەکنیکە نوێیەکانەوە دێنە گۆڕێ گونجاو یا نەگونجاوبن و هەربەپێی ئەم بەراوردە لە لادێیەکان و ناوچەکانی دیکەشدا هەروایە، هەرکام لەمانە دەتوانن هەلومەرجی لەبار یا نالەبارین بۆ ئەو گۆڕانکارییەی کە لە ئاکامی دامەزراندنی کارگەیەکی نوێدا دێتە دی، یا کۆی ئەو کردەوەو دژکردەوانەی کە دەبنە هۆی وەستان یا پێشکەوتن لە چاکسازیی ئەرزیدا، هەلومەرجێکی لەبار یا نالەبار دەخولقێنن.

بەپێی ئەو شتەی کە باسمان کرد بەم ئاکامە دەگەین کە هەلومەرج و فاکتەرەکانی گۆڕان، تەواوکەری یەکترن. هەلومەرجەکانی گۆڕان ئەو توخمانەن لە بارودۆخێکی تایبەت کە دەبنە هۆی لەباری یا نالەباریی رۆڵی فاکتەرەکان، بە واتایەکی دیکە، ئەم هەلومەرجانە دەتوانن لە پراکتیزە بوونەوەی شێوەوارەکانی هۆکارەکانی گۆڕاندا، رۆڵی ئەرێنی یا نەرێنییان هەبێت. لەلایەکی دیکەوە هەلومەرجەکان دەتوانن کاریگەرییان لەسەر رەوتی گۆڕان هەبێت و بەم جۆرە دەتوانن کاریگەرییان لەسەر خێرایی یا هێواشیی کردەوەی فاکتەرەکان هەبێت. هەروەها هەلومەرجەکان دەتوانن کاریگەرییان لەسەر رەوتی گۆڕانیشدا هەبێت و بەملاو بەولایدا بکێشن، بەم چەشنەی کە لەوانەیە بە هۆی هەندێك لە هەلومەرجە تایبەتەکانەوە ئایدیایەك یا تەکنیکێکی نوێ لە رەوتی بڵاوبوونەوە یا سەقامگیرییەکەیدا بگۆڕدرێ و ئەو گۆڕانکارییەی کە مەبەستە بەدی نەهێنێ و لە کۆتاییشدا هەلومەرجەکان دەتوانن کاریگەرییان لەسەر بەربڵاوی و پانتایی گۆڕاندا هەبێت. بۆ وێنە هەلومەرجی لەبار بۆ گۆڕانێك لە بەش یا ناوچەیەکی تایبەتی کۆمەڵگادا نایەتەدی و کەوابوو ناتوانێ دزەی تێدا بکات یان ئەوەی کە زۆر درەنگ دێتە دێ.

## کارگێڕانی گۆڕان

وەك پێشتریش دیتمان، کارگێڕانی گۆڕان بریتین لە کەسایەتییەکان، تاقم یا ئەو کۆمەڵانەی کە گۆڕانەکە دەهێنن، پێشوازی یا دژایەتیی دەکەن. کەوابوو ئەم کارگێڕانە تاقم یا کەسایەتیگەلێکن کە کردەوەی کۆمەڵایەتییان لە هەندێك لایەنەوە بیچم و تایبەتمەندیی کردەوەیەکی مێژوویی بەخۆوە دەگرێت واتە ئەو تاك یا تاقمانەی کە کردەوەکەیان لە کۆمەڵێك ئامانج، ئاوات، بەهاو ئایدۆلۆژیاوە سەرچاوە دەگرێت کە لەسەر داهاتووی کۆمەڵگا کاریگەر دەبن.

## پێشگۆیی و پێشبینی

لە لێکدانەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و کردەوەی مێژوویدا، کێشەیەکی دیکەش دێتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە کە ئایا دەتوانین پێشگۆیی و پێشبینی لێکجیابکەینەوە؟ روون و ئاشکرایە کە ئەم جیاکردنەوەیە گەلێك دژوارە بەڵام دیاریکردنی سنوور بۆ هەر کام لەوانەش گرینگە. لە ڕاستیدا بە لەبەرچاوگرتنی لاوازیی زۆری کۆمەڵناسی لە بابەتی پێشبینیدا، کە لە

سەرەتای ئەم بەشەدا ئاماژەی پێکرا، تێکەڵکردنی پێشگۆیی و پێشبینی لە کۆمەڵناسیدا زۆریش ئاسان نییە و لە ژێر پۆششی پێشبینیدا پێشگۆیی ناکرێت.

### پێشگۆیی لای یەکەمین کۆمەڵناسانەوە

لە راستیدا، زۆربەی تیۆریسیەیە نەناسراوەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی، روویان کردۆتە پێشگۆیی، تارادەیەکی زۆر هەموویان، داهاتوویەکی باشتریان مزگێنی داوەتە هاوسەردەمییەکانی خۆیان، کۆمەڵگایەکی مرۆڤانەتر، هاوئاهەنگتر، ئازادتر، ئاشتیخوازانەتر و هتد.. و وەك دەبینرێت، کۆمەڵناسە سەرەتاییەکان بە گەشبینییەوە پێشبینی داهاتوویان کردووە و ئەمەش پاساودەری ئەم راستییەیە کە تیۆرییەکانی گۆڕان لە مێژوودا، هەرکام بە جۆرێك بڕوایان بە چەشنە پێشکەوتنێکی مرۆڤایەتی و باشتربوونی ژیانی بەتاك و بە کۆمەڵی مرۆیی هەیە. بۆ وێنە ئۆگۆست کۆنت سەردەمی پۆزێتڤی(اثباتي) بە قۆناغێکی سەرتر لە هزر و رێکخراوی کۆمەڵایەتی دەزانیٚ. ئێسپێنسێر پاساوی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە رەوتی هەڵکشان بەرەو کۆمەڵگای پیشەسازیی دامەزراو لەسەر لیبرالیزم و تاکخوازیدا دەداتەوە. مارکس و ئەنگێلس باسیان لە هەڵوەشانەوەی دوری هەڵنەگری سەرمایەداری بە قازانجی کۆمەڵگای بیٚ چین دەکرد.

لەلایەکی دیکەوە، بیردۆزەرانێکی دیکە کە لە مێژوودا بەجێگەی پاساوی گۆڕانی تاك رەهەندی بڕوایان بە رەوتێکی بازنەیی یا "سیکلیك" هەیە، گەشبینییەکی کەمتر لە بۆچوونەکانیاندا دەبینریٚ. بۆ وێنە لەم بارەوە دەتوانین نموونە لە سوروکین بێنینەوە کە سیٚ قۆناغ لە شارستانییەتی (چاك، خراپ و قۆناغی گواستنەوە)ی دەستنیشان کردووە کە بەشێوەیەکی بازنەیی و بەردەوام یەکیان جێی ئەوی دیکە دەگرێتەوە. لە بەرامبەردا ئۆسڤاڵد ئێشپێنگێر هەندێك بۆچوونی رەشبینانەی هەیەو مێژووی شارستانییەتەکان وەك ژیانی مرۆڤ لێکدەداتەوە و چوار قۆناغی لەدایکبوون، گوران (بلوغ)، لێژبوونەوە و مردن لە شارستانییەتەکاندا دیاری دەکات، هەربەم پێیە شرۆڤەی لێژبوونەوەی ئێستای شارستانییەتی رۆژئاوا دەکا و باس لە ئەگەری کۆتایی هاتنی دەکات.

### پێنج تایبەتمەندیی جیاواز

پرسیارێك کە لێرەدا دێتە ئاراوە ئەوەیە کە چۆن دەتوانین پێشگۆیی و پێشبینی لێك جیابکەینەوە، بەرای ئێمە دەتوانین پێنج تایبەتمەندیی سەرەکی بۆ پێشگۆیی دیاری بکەین کە لە پێشبینی جیادەکاتەوە. یەکەم ئەوەی کە، هەر پێشگۆیەك، وەك خاڵی دەسپێك، بۆچوونێکی رەخنەگرانەی بەرامبەر بە کۆمەڵگای ئارایی و کۆمەڵگا پێشووەکان هەیە. ناروونییەکان، دژایەتییەکان. بێدادییەکان و نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان دەکەونە بەرباس و بەرەڤانی و لە قاو دەدرێن. کەوابوو بە رەخنەگرتن لە کۆمەڵگای ئێستەو رابردوویەکە کۆمەڵگایەکی نویٚ پێشنیار و پێناسە دەکریٚ.

لەگەڵ ئەوەدا، هێربێرت مارکوزە کە رەخنەکانی لە ژێر ناوی "کۆمەڵگای پیشەسازیی پێشکەوتوو"دا دەناسین، خۆی پشتڕاستی دەکاتەوە کە "تیۆری رەخنەگری لە کۆمەڵگا خاوەنی ئەو چەمکانە نییە کە شیانی دەربازبوون لە مەودای نێوان ئێستەو داهاتوو دابین بکات و هەروەها هەندێك بەڵێنی بدات و بتوانێ سەرکەوێ و هەروا نەرێنی دەمێنێتەوە". بەڵام با نەگوتراو نەمێنێ کە هەموو ئەو بیردۆزەرانەی کە رەخنە لە کۆمەڵگا دەگرن بە قەت مارکوزە بە پارێز نەبوونە چوونکە ئەو سنوورەیان بەزاندوە کە رەخنە لە پێشگۆیی جیادەکاتەوە.

دووهەم ئەوەیکە، ئەوەی رێگەی دەربازبوون لەم مەودایە دەدا، ئەوەیە کە گرینگترین سەرچاوەی هاندەری پێشگۆیی لە شتێکدا شاردرابێتەوە کە بتوانین ناوی "هاورێکییەك لە بیرکردنەوە لە چەشنی بان زانستی"ی لەسەردابنێین. پێشگۆیی لە رێبازێکی تایبەتەوە سەرچاوە دەگرێ کە لەلایەن یاساکانی توێژینەوە زانستییەکانەوە هاننەدراوە بەڵکوو بە پێچەوانە لە بیرێکەوە سەرچاوە دەگرێت کە بنەماکەی لە ئێدەو بەهاو بڕواکاندا دەبینرێتەوە. کەوابوو، بیرو غەیب بێژی پێغەمبەران لە سروشی خواییەوە سەرچاوە دەگرێت کە سەبارەت بە پێغەمبەرانێکی وەك مووسا و محەمەد وەراست گەڕاوە. بەڵام پێشگۆیی نوێ، ئیتر سەرچاوەی مەزهەبی نییە و لە بیرێکی فەلسەفی یا رەوشتییەوە سەرچاوە دەگرێ و لە پێوەندی لەگەڵ نێوەرۆکی سەرەکی چارەنووسی مرۆڤ و کۆمەڵگادایە.

بەڵام پێشبینی زانستی بە نۆرەی خۆی، نە رەخنەیە و نە هاندراوی بەهاکان. پێشبینییەکی ئەوتۆ سەرچاوە لە دیتن لە رابردوو و لە ئێستەدا دەگرێ و هەوڵی دەستنیشانکردنی رێگە شیاوەکانی داهاتوو بەپێی هۆکارە جۆراوجۆرەکان، هەلومەرج و ئەو فاکتەرە جیاوازانەی دەدا کە کەم و زۆر خاوەن کاریگەرییەکی هەرە زۆرن. کەوا بوو دەتوانین بڵێین لە جێدا پێشبینی لەسەر راڤەی گرینگایەتی و رۆڵی فاکتەرە جیاوازەکان و ئاکامگەلی سەرچاوەگرتوو لێیانەوە راوەستاوە.

سەرەڕای ئەمە دەبێ ئەم تێبینییە لەبەرچاو بگیردرێ کە دیاری کردنی مەودا یا سنووری نێوان بیری "بان زانستی" و توێژینەوەیەکی تەواو زانستی لە زانستە مرۆییەکاندا، بە کردەوە کارێکی زۆر هەستیار، باس هەڵگر و گەلێك جار ئەستەمە، چونکە پێشگۆیی و پێشبینی بە سانایی پێکەوە تێکەڵ دەکرێن. سێهەم ئەوەیکە، پێشگۆیی تایبەتمەندییەکی ئارەزوومەندانەی هەیە، واتە پێشگۆیی مزگێنی بەخش یا هاندەری لایەنێکی تایبەتە و هەوڵدەدا لەسەر رەوتی مێژوو کاریگەریی هەبێ. پێغەمبەر کە هەواڵی داهاتوو دێنێ، لە هەوڵی هەڵخراندنی ئەو هێزانەدایە کە پێویستە داهاتوو بەو شێوەیەی کە دەبێ ببێ دروست بکەن. پێشبینی لە خۆیدا ئامانجگەلێکی لەم بابەتەی هەیە و پێشنیاری بەدواداچوونی رێگایەك بە جێگەی رێگایەکی دیکە ناکات بەڵکوو بە لەبەرچاوگرتنی ئەو فاکتەرە

جۆراوجۆرانەی کە لە کاردان، هەندێك بابەتی شیاو دەخاتە بەر باس.

چوارەم ئەوەیکە، پێشگۆیی زۆرتر بە جۆرێك دڵنیاییەوە دیاری دەکرێت، پێغەمبەر بە دڵنیاییەوە باس لە چەمکی دووری هەڵنەگری مێژوو دەکات و بە جەخت کردنێکی زۆرەوە پێشبینیی داهاتوو دەکات. کەوا بوو زۆر جار دەتوانین تێکەڵاوییەك لە ناچاری بوون و ئارەزوومەندانە بوون لە نزیك بە هەموو بیچمەکانی پێشگۆییەکانی پێغەمبەرەکاندا ببینین. لە کاتێکدا کە پێشبینی، بە پێچەوانەوە، لە جێدا رێژەیی خواز و ئەگەر گەرایە بەشێوەیەك کە بە لەبەرچاوگرتنی ئامانجی کارەکەی، لەسەر بەراوردی ئەو ئەگەرانەی راوەستاوە کە خۆیان لەسەر باندۆری هەندێك توخمی جۆراوجۆر لە بارودۆخی ئێستەو داهاتوودا دامەزراون.

پێنجەمیش ئەوەیکە، زۆر جار پێشگۆیی دەتوانێ بەپێی نێوەرۆکی ئەو داهاتوویەی کە هەواڵی لێوە دێنێ، گەشبینانە یا رەشبینانە بێت. بەڵام ئەم تایبەتمەندییە لە پێش بینیدا بەدیناکرێت، چوونکە پێشبینی وەك ئەو شتەی کە مێژوونووسانی داهاتوو دەیکەن، بەشێوەیەك، تەنیا لەسەر بنچینەی بالانسی فاکتەرە ئاراییەکان، باسی داهاتوو دەکا.

لەلایەکی دیکەوە بە پێچەوانەی پێشگۆیی، کە لە بارەیەوە باس لە دەستەواژەکانی گەشبینی یا رەشبینی دێتە گۆڕێ، سەبارەت بە پێشبینی دەتوانین بڵێین هیوا بەخش یا هیوا برە.

### ئەو پرسیارانەی کە دێنە ئاراوە

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو جیاوازییانەی کە باسکران، ئەگەری ئەوەمان بۆ رەخسا کە لە چۆنێتیی رووبەرووبوونەوەی کۆمەڵناسیی هاوچەرخ لەگەڵ کێشەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی تێبگەین. لەم پێوەندییەدا دەتوانین کێشەکە بەم جۆرە کورت بکەینەوە کە بڵێین کۆمەڵناس، لە بەرامبەر گۆڕاندا، شەش پرسیاری سەرەکی بەم چەشنەی خوارەوە دێنێتە ئاراوە:

1- پرسیاری یەکەم ئەوەیکە چ شتێك دەگۆڕدرێ؟ چونکە کێشەکە لەوەدایە کە گۆڕانی کتووپڕی یەك کۆمەڵگا لە هەموو رەهەندەکانیدا بابەتێکی ریسپەڕە. کەوا بوو، کێشەی گرینگ ئەوەیە کە ئەو بەشانەی پیشان بدەین کە گۆڕانی تێدا دەکرێ و بۆ نموونە بزانین کە ئایا گۆڕان لە توخمە پێکهاتەییەکاندا روودەدا یا لە کولتووردا وە یا لە نموونەکان، بەهاکان یا ئایدۆلۆژیاکاندا؟

2- پرسیاری دووهەمی کۆمەڵناس ئەوەیەکە چۆن گۆڕان روودەدا؟ چ رێگایەك دەبڕێ؟ ئایا بەشێوەیەکی رێك و پێك درێژەی دەبێ؟ یا بەشێوەیەکی نارێك و پێك، ناوبەناو و کاتی؟ ئایا گۆڕانەکان بەرەو رووی بەرگرییەکی توندەبنەوە؟ وە ئەگەر بەرەو رووی بەرگرییەك بوونەوە، ئەم بەرگرییە لە کوێدا روودەدا و چچ فۆرمێك بەخۆوە دەگرێ؟

3- سێهەم ئەوەیکە، پێویستە نەزمی (ئاهەنگ) گۆڕانەکە لە بەرچاو بگیردرێ. ئایا ئەو شتەی کە روودەدا، گوڕانێکی هێمن و

بەرەبەرەیە، یا هەندێك گۆڕانكاریی توندوتیژ و گۆڕانگەلێكی خێرایە؟

4-پاش ئەوەی كە چۆنیەتی گۆڕانەكە روون بووەوە ئینجا دەتوانین راڤەی بكەین و لێرەدایە كە دەست دەكەین بە شرۆڤەی فاكتەرەكانی گۆڕان و هەلومەرجە لەبارو نالەبارەكانیشی.

5-لە قۆناغی پێنجەمدا، ئەو كارگێڕە چالاكانەی كە گۆڕانیان هێناوەو هێمایان پێبەخشیوە، هاندەران و بزوێنەرانی دەناسرێن و هەروەها مزگێنی بەخشانی دژایەتی یا خۆڕاگری لە بەرامبەر گۆڕاندا دیاری دەكرێن.

6-لە ئەنجامیشدا تێكڕای ئەم شرۆڤەیە، ئەم پرسیارە دەخاتە بەردەم كۆمەڵناسەوە كە ئایا دەتوانێ رەوتی داهاتووی رووداوو پێشهاتەكان و ئەو رێگا جۆراوجۆرانەی كە كۆمەڵگا دەتوانێ لە داهاتوویەكی دوور یا نزیكدا هەڵیانبژێرێ، پێشبینی بكات؟

**ئەوەی لە بەشەكانی داهاتوودا دەخرێتە بەر باس**

بە لەبەرچاوگرتنی گرنگایەتی ئەم باسانە و هەروەها بەسەرنجدان بەو كارە بایەخدار و لێكۆڵینەوانەی كە لەم بوارەدا كراون، توێژینەوەی گۆڕان بەشێوەیەكی جیا لە گۆڕانكاریی بیردۆزەكان لە كۆمەڵناسیدا كارێكی هەرە دژوارە. كەوا بوو، بەشێوەیەك بەدواداچوونی گۆڕانكاریی بیری كۆمەڵناسانە دەكەین كە لە هەمانكاتدا، كۆمەڵە پرسیارێك بە هەمان ئاراستەدا بخەینە روو كە لە ناخی ئەوانەوە ئەم كێشانە هەڵقوڵابێتن. لە بەشەكانی داهاتوودا، رۆڵی هەندێك لە هۆكار و هەلومەرجەكانی گۆڕان شرۆڤە دەكەین. لە بەشەكەی دیكەدا رۆڵی مزگێنیدەرە سەرەكییەكانی گۆڕان تاوتوێ دەكەین و پاشان لە دوو بەشی دوای ئەودا، دەست دەكەین بە توێژینەوەیەكی قووڵ و دیاریكردنی كردەوە، هۆكارەكان و كارگێڕان لە بابەتێكی تایبەت واتە "گەشە"دا، واتە ئەو پرۆسەیەی كە ناچار لە شێكارییەكی تەواوی ئەو شتەی كە دەگۆڕدرێ‌و چۆنیەتی و نەزمی گۆڕانەكەیان دەكات. لە كۆتایشدا، لە بەشی شەشەمدا باسەكەمان بە لێكدانەوەی پرۆسەیەكی گۆڕانی كۆمەڵایەتی، واتە پرۆسەی شۆڕش دوایی دێنن.

**سەرچاوە:**

تغیرات اجتماعی، گی روشه، ترجمه دکتر منصور وسوقی، نشر نی چاپ شازدهم، 1383 تهران.

# ئیسلام و مۆدێرنە

د. محەمەد ئارکۆن

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

**پێشەکی هاشم ساڵح:**

بۆ ماوەی دوو ساڵە محەمەد ئارکۆن درێژە بە بابەتی ئیسلام و مۆدێرنە دەدات، ئەمەیش لە میانی وانەکانیدا بۆ قوتابیانی خوێندنی باڵا لە زانکۆی سۆربۆن. دەشێت ئەمە بەڵگەیەك بێت بۆ ڕوودانی گۆڕانکارییەکی گرنگ و بازدانێکی نەوعی لە خواست و بایەخدانەکانی ئارکۆن و لە ئەولەویاتە فیکرییەکانی. ڕاستە ئارکۆن لە کتێبەکانیدا و لە تێکستەکانی پێشوویدا ئەم بابەتەی پشتگوێ نەخستووە، بەڵکو لە پێشەکیی کتێبی "ئیسلام، لە نێوان دوێنێ و ئەمڕۆدا" لێکۆڵینەوەیەکی بۆ ئەو بابەتە تەرخان کردووە بە ناونیشانی "چەمکی مۆدێرنە". ڕاستە ئارکۆن لە چەندین وتاری پێشوویدا بابەتی مۆدێرنە و مۆدێرنیزەکردنی لە دنیای عەرەبی و ئیسلامیدا بەسەر کردۆتەوە. بەڵام بایەخی بنەڕەتیی ئەو، بۆ ساڵانێکی زۆر، بریتیی بوو لە لێکۆڵینەوە لە قۆناغی کلاسیکی و داهێنەری مێژووی ئیسلامی و عەرەبی. ئارکۆن لە سەرەتادا بایەخی بە "هیومانیزمی عەرەبی لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا" دەدا، یەکەمجار لە میانی (میسکەوەیە) و پاشان لە میانی گەورە بیریارانی سەدەکانی یەکەمی کۆچیدا بۆ نموونە تەوحیدی و غەزالی و ئەبو حەسەن ئەلعامری و ماوەردی و هیتریش. لەو کاتەدا زاراوەی "ئەدەب"ی بە مانای فراوانی ئەو سەردەمەی وشەکە، شیکردەوە، ئەو زاراوەیەش یاوەریی بزوتنەوەی هیومانیزم و فیکریی دەکرد، پاشان ئارکۆن هەستی بەوەکرد کە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ دواوە بۆ مێژوویەکی دوورتر، ئیدی گەیشتە قۆناغی "ئەزموونی دامەزراندن" و تێکستی قورئانی، بۆ ماوەی چەندین ساڵ سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوولە قورئان بەشێوەیەکی تەواو جیاواز لە میتۆدە تەقلیدییە باوەکانی

ســـــەرجەمی مەزهەبـــــەکان بـــــەڵام بێئـــــەوەی دەستکەوتەکانی ئەو میتۆدانە پشتگوێ بخات، هـــەروەها جیـــاواز لـــە میتـــۆدی فیلۆلـــۆجیی خۆرهەڵاتناسی پاش ئەوەی لایەنە پۆزەتیڤ و پێـــدراوەکانی لێـــوەرگرت. ســـەرەنجامی ئـــەو شتانەیش بەرهەمهێنانی کتێبە ناودارەکەی بوو بـــە ناونیـــشانی "چـــەند خوێندنەوەیـــەك بـــۆ قورئـــان" کـــە یەکـــەمجار پـــشت بـــە میتـــۆدی زمانـەوانی دەبەستێت کـە ئـەم میتـۆدە لـە چاو میتۆدی فیلۆلۆجی پێشکەوتنێك پێکدەهێنێت، پاشـان پـشت بـە میتۆدەکـانی ئـەنترۆپۆلۆجی و مێـژوویی و زانـستی بـەراوردکاریی ئاینـەکان دەبەسـتێت. بـەم شـێوەیە تێکـستی قورئـانی بەشـێوەیەکی بێوێنـە تیـشکی خراوەتـە سـەر. ئێمـە چەند بەشێکی ئەو کتێبـەمان کردووە بە عـــەرەبی بـــە ناونیـــشانی (بـــیری ئیـــسلامی: خوێندنەوەیەکی زانستی) کە لە ساڵی 1987 لە بەیروت چاپکراوە.

بـەڵام ئێـستا، پـاش ئـەوەی بـیری ئـارکۆن پێگەیـشت و گەیـشتە ئاسـتێکی بڵنـد، چووەتە ناو گرفتێکی ترسناکەوە کە ئەمڕۆ ڕووبەڕووی عـــەرەب و موســـڵمانان بـــە گـــشتی دەبێتـــەوە، ئەویش گرفتی مۆدێرنەی ئەقڵی و فکرییە. ئەمە گرفتی چوونە ناو سەردەمی ئێستایە بە هەموو مانای وشەکە، هەروەها بە هەموو ئەو گیروگاز و بەربەســت و ژانـــەی لـــە خـــۆی دەگرێـــت. بـــۆ هـــەمووان ڕوون بۆتـــەوە کـــە کێـــشەی عـــەرەب و موسڵمانان لەسەرێك بریتییە لەو شڵەژانە تیژ و هەڵـچووەی نێـوان کەلـەپورێکی ڕابردووگـەرای دێـــرین و ئێـــستایەکی مانـــدوو و پاشـــکەوتوو لەســـەرێك، و لـــە نێـــوان مۆدێرنەیـــەکی بـــەهێز و سەرجەمگیر لەسەرێکی تر، ئەو مۆدێرنەیەش لە کـەناری ئەوبـەری دەریـای ناوەڕاسـتدا لـەدایك بووەو گەشەی کردووە. گرفتی ئەمان ئەوەیە کە مۆدێرنـەی تـازە لـە خـاکێکی تـر لـەدایك بـووەو هیچ پەیوەندییەکی بە "ماڵی ئیسلام"ەوە نییە!! واتە لە خاکی داگیرکەرانی پێشوو لەدایکبووە. کە لە ڕووی مێژووییەوە سەر بە ئاینێکی تر و کەلـەپورێکی تـرن. بێگومـان ئەمـە مانـای ئـەوە نییە کە مۆدێرنەی ئەمڕۆ یاخود مۆدێرنەی تازە هیچ سوودێکی لـە کەلـەپوری عـەرەبی ئیسلامی وەرنەگرتووە، بەڵام بەو مانایە دێت کە هـەنگاوو دەســـتکەوتەکانی مۆدێرنـــە چـــەندین قۆنـــاغ و هـەنگاوی گـەورەی بڕیـوە لـە بـواری سەرکێشیی بەشـەری بـۆ (بـوون) و کـۆنترۆڵ کردنیدا. ئـەمڕۆ مۆدێرنـە دابڕانێـك دەنوێنێـت نـەك تـەنها لەگـەڵ کەلەپووری کلاسیکیی عەرەبی ئیسلامیدا بەڵکو لەگـــەڵ کەلـــەپووری کلاســـیکیی خۆرئـــاوا خۆیـشیدا. لەبـەر ئـەم هۆیـە ئـارکۆن لـە میـانی تێـــــــڕوانینی مێـــــــژووی بـــــــەراوردکاریی کولتوورەکـانو بـاوەڕ و ئەزمونەکانـدا گـرفتی مۆدێرنە دەخاتە ڕوو، واتـە لـە میانی ئـەزموونی لاتـینی مەسـیحی و خۆرئـاوایی لەسـەرێك و، پاشـان لـە میـانی ئـەزموونی عـەرەبی ئیـسلامی لەسەرێکی تر.

ئـارکۆن پێـی وایـە مـومکین نییـە بابـەتی "ئیسلام و مۆدێرنە" لە هـەموو لایەنەکانیـەوە و بەشـێوەیەکی یەکلاکـەرەوە ڕۆشـنایی بخرێتـە سـەر تـەنها ئـەو کاتـە نـەبێ کـە لـە مێـژووی پەرەسـەندن و هەڵکشانی ئـەزموونی مۆدێرنـەی ئـەمڕۆ لـە شـوێنە ڕەسـەنەکەی خۆیـدا –واتـە ئـەوروپا– بکۆڵینـەوە، واتـە دەبـێ لێکۆڵینـەوە

لەســەر ئــەوروپای خۆرئــاوایی لــە میــانی مێــژووی ئــەم چــوار ســەدەیەی کۆتــایی (لــە ســەدەی شــانزەهەمەوە تــا کۆتاییــەکانی ســەدەی بیســتەم) ئــەنجام بــدرێت. بەشــی زۆری رۆشنبیرانی دنیای عەرەبی و ئیسلامی — لەوانــە رەوتــی رۆشــنگەری و نوێگــەریش — بەشــــــێوەیەکی روون و هەســــــتپێکراو ئاگــاداری ئــەزموونی مۆدێرنــەی خۆرئــاوایی نــین. شــارەزایی و زانــینی رۆشــنبیرانی چــەرخی "بوژاندنــەوە"ی عــەرەبی و نــەوەکانی دواتــریش و بگــرە تــا ئــەمڕۆیش، لــەبارەی ئــەوروپا و مۆدێرنــەی ئــەوروپی ، زانیارییــەکی کەموکورت و ناتەواوە، ئەگەرچی سوودبەخش و ئیجابیــشە، بــەڵام هەنــدێجار زانیارییــەکی شــێواوو ناواقعییــە. پاشــان چــەرخی ئایــدیۆلۆژیا هــات کــە بــۆ مــاوەی ســی ســاڵ باڵادەســت بــوو و هــەموو هیوایــەکی بــۆ تێگەیشتنێکی بابەتی لە (خود) و (خۆرئاوای ئەوروپی) لەناوبرد.

باشە چۆن دەتوانین بەراوردکاری لە نێوان ئــەزموونی ئیــسلام و ئــەزموونی مۆدێرنــەی ئەوروپیدا بکەین لە کاتێکدا ئەمەی دوایی ناناسین یاخود نامانەوێ زانیارییەکی بابەتی و راســتەقینەیان لەســەر پێکبهێــنین بــەهۆی تێکەڵوپێکــەڵکردنی قۆنــاغی داگیرکــاری و ئاڵۆزییــەکانی؟ دیــسان چــۆن دەتــوانین بــەراوردکاری بکــەین لــە نێــوان ئــەزموونی مۆدێرنەو دونیای عەرەبی ئیسلامی لە کاتێکدا زانیارییەکی راستەقینەمان لەسەر مێژووی راستەقینەی سەدە دامەزرێنەرەکانی عەرەبی ئیسلامیدا نییە، یاخود وێنەیەکی خەیاڵی و ئەفسانەیمان لەسەر سەدە سەرەتاییەکانی ئیسلامدا هەیە.

بــەمجۆرە دەبیــنین هــەر لــە ســەرەتاوە مەســەلەی تێگەیــشتنی مێژووییانــە بــۆ کێشەکان خۆی دەخاتە ڕوو. مەبەستم لە مێژووگەرایی شتەکان و دیاردەکانە بە هەموو ئــاڵۆزی و تێکــەڵی و مەرجــە ماتریــاڵی و مەعنەوییەکانی بوون.

ئارکۆن مێژوونووسێکی لێهاتووە بە هەموو مانای وشەکە، ئەو هەمیشە حەز دەکات بە مێژوونووس بناسرێت و وەسف بکرێت نەك بە فەیلەسوف، ئەمە ئەگەرچی بە بۆچوونی ئێمە شایستەی هەردوو وەسفەکەیە. بەڵام ئەو بە ئەنقەست ئەمە دەکات تا جۆری ئەو ئەرکە بهێنێتە ناو بازنەی رووناکییەوە کەلەسەر شانی ئێمەدایــە و هــەروەها جــۆری ئــەو رێــچکە میتۆدی و ئەقڵییەی کە دەبێ بیگرینەبەر تا بە باشترین شێوە جێبەجێی بکەین.

ئــارکۆن بیریــارێکی میتــۆدی و واقعییــە و هــــەنگاو بــــە هــــەنگاو بــــەرەو پێــــشەوە دەچــێت، نایــــەوێت خــــۆی لــــە نێــــو تەمومژی گشتگەرایی و تیۆرسازیی خۆراییدا ون بکــات، بۆیــە لــەم لێکۆڵینەوەیــەدا لــەبارەی ئیسلام و مۆدێرنە دوو کتێب و دوو بیریاری بۆ لێدوان هەڵبژاردووە:

یەکــەم: کتــێبی "فــصل المقــال في مــابين الحكم و الشريعة من الاتصال"ی ئیبن روشد کــە لەوانەیــە ئــەم کتێبــە لــە ســاڵی 1187ز دانرابێت.

دووەم: کتــێبی "رێگــەکانی مۆدێرنــە"ی بیریــاری هاوچــەرخی فەرەنــسی جــان مــاری

دومینـاك کـه لـه سـاڵی 1987 لـه پـاریس چـاپکراوه و تیایـدا هـەوڵ دەدات گـرفتی مۆدێرنەو ڕێچکەکانی له خۆرئاوادا شیبکاتەوه هەر لە چەرخی ڕۆشنگەرییەوه تا ئەمڕۆ.

لەوانەیـه مـرۆڤ بپرسـێت: چـۆن ئـارکۆن، وەك خـاڵی دەسـتپێکردنی ئـەو بابەتـە، بیریـارێکی ئیـسلامیی هەڵبـژاردووه کـه لـه سـەدەی دوانزەهـەمی زایینیـدا ژیـاوه لەگـەڵ بیریـارێکی هاوچـەرخی فەرەنـسی کـه باسـی مۆدێرنـه و دوا دەرکەوتـەکانی مۆدێرنـه لـه کۆتاییـەکانی سـەدەی بیـستەمدا دەکـات؟ لـه ڕاستیدا ئارکۆن دەیەوێت ئەو ماوه زەمەنییه له نێـوان دوو چرکەسـاتی بنـچینەیی لـه مێـژووی بیرو ژیاندا بپێوێت:

1- چرکەسـاتی ماقوڵیـەتی سـەدەکانی ناوەڕاست. ئەگەرچی ئیبن ڕوشد فەیلەسوفێك بـوو ئاگـاداری زانـست و لـۆجیکی گریکـی بـوو، بەڵام مەحکومیش بوو بە بیروباوەڕ و ماقوڵیـەتی سەدەکانی ناوەڕاست. بێگومان ئەمه له بایەخی ئیبن ڕوشد و خەباتی له پێناو ئەقڵانییەتدا کەم ناکاتەوه. به تایبەتی که جەنگێکی بێئامانی له دژی پاسەوانانی ئەرتەدۆکسیزم له فوقەهاکان و مالکییـەکان و هـەروەها لـه دژی غـەزالیش بـەرپا کـرد. گفتوگـۆ و ئەرگۆمێنتـه ناودارەکـەی ئـیبن ڕوشـد لەگـەڵ غەزالیـدا بەیـەکێك لـه باشـترین ئەرگۆمێنت دادەنرێ له چاخه کلاسیکییەکانی ئیـسلامیدا، ئـەرگۆمێنتێك کـه مەحاڵـە – وەك ئـارکۆن دەڵـێ – لـەم هەلومەرجـەی ئـەمڕۆدا لـه کۆمەڵگه ئیسلامییەکاندا دووباره ببێتەوه.

ئارکۆن له میانی چڕکردنەوەی لەسەر ئیبن ڕوشد دەیـەوێ پایـەی بیری ئـەو بیریـاره بـەپێی بـیری ئیـسلامیی سـەردەمەکەی خـۆی بپێوێـت، واتـه بـیری ئـیبن ڕوشـد بـەپێی بـیری فوقـەها و کەلامناسەکان (غەزالی). دەیەوێ مەسافەیەك لـه نێـوان ئـیبن ڕوشـد و ئـەوانی تـردا بدۆزێتـەوه و هاوکـات تایبەتمەندییـە هاوبەشـەکانیان دەستنیـشان بکـات، واتـه ئـەو خاسـیەته هاوبەشـانەی کـه بـیری سـەدەکانی ناوەڕاسـت ڕێگـەی پێـدەدات و نابێـت لـەوه زیـاتر بـڕوات. کەواتـه ئـیبن ڕوشـدیش ناتوانێـت لـەوه زیـاتر بڕوات. سەرباری بوێری و بەهێزیی فیکرەکەی، بەڵام سنورێکی هەیه و مومکین نییه بتوانێ ئەو سنووره ببەزێنێ، لەو سنورەیش لای نەدا. ئەمه ئـەو شـتەیه کـه ئـارکۆن دەیـەوێ لـه میـانی پراکتیزەکردنـی میتـۆدی مێـژوویی و لـه میانی لێکچەرەکانیدا لـه زانکـۆی سـۆربۆن دەریبخـات. بـه کـورتی ئـارکۆن دەیـەوێ ئـەو سیـستمی بـیره ئاشـکرا بکـات کـه لـه سـەده کلاسـیکییەکانی ئیسلامیدا باو بوو له میانی شیکردنەوەی بیری ئـیبن ڕوشـد کـه نوێنـەری بـەرزترین خـاڵی پێشکەوتووی ئەو کاته بوو.

2- چرکەسـاتی ماقوڵیـەتی نـوێ یـان چرکەسـاتی مۆدێرنـە. ئەمـەش لـه میـانی خوێندنـەوەی هەنـدێ تێکـستی بیریـاره ئەورووپییەکان که له مێژووی مۆدێرنەی فیکریدا چرکەساتی بنەڕەتین (دیکارت، هۆبز، فرانسیس بیکـۆن، کانـت، هیگـڵ، مـارکس، نیـچه، فرۆیـد، ماکس فێبـەر، باشـلار، لیڤـی ستراوس، میشیل فوکـۆ.. هتـد). ئـارکۆن دەیـەوێ شـوێنی ماقوڵیـەتی ئـیبن ڕوشـد بـەپێی ماقوڵیـەتی نـوێ دابنێت و جیای بکاتەوه. لێرەدا ئارکۆن دەگاته ئـەو دەرەنجامـەی کـه مـومکین نییـه ئـیبن ڕوشـد

ببێته رێنیشاندەر و یارمەتیدەر له پێناوی گەلاڵەکردنی مۆدێرنه له ئەمڕۆداو له بواری عەرەبی یاخود ئیسلامیدا. ئەو ماوەیەی ئیبن روشد له ساتەوەختی ئێستا جیادەکاتەوە ماوەیەکی ئێجگار زۆرە لەچاو ئەو پێشکەوتنه گەورانەی زانسته مرۆڤایەتی و کۆمەلأیەتییەکان رۆژ له دوای رۆژ دەیچەسپێنێت. بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا ئیبن روشد بەشێوەیەکی ناراستەوخۆو لە ئاستێکی تردا یارمەتیمان دەدات، ئەو شەڕێکی گەورەی لە دژی ئەرتەدۆکسی بەرپا کرد. یان با بڵێین ناچار بوو ئەو شەڕە هەڵبگیرسێنێت لە پێناو هێنانی تێڕوانینی ئەقلأنی بۆ ناو بیری ئیسلامی. ئێمە ئەمڕۆ بەهەمان شێوە ناچارین جەنگێکی لەو چەشنە هەڵبگیرسێنین لە پێناو هێنانی تازەگەری و بیری مێژووییدا. خوێندنەوەی ئەزموونی ئیبن روشد بەشێوەیەکی زانستی، خاڵە لاواز و بەهێزەکانی ئەو رووبەڕووبونەوە قورسەمان بۆ دەردەخات و ئەو هەلأنەمان پێ نیشان دەدات کە ئیبن روشد تێیکەوتووە و دەبێ ئێمە خۆمانی لێ بەدوور بگرین، دەبێ ئێمە لە رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆماندا لەگەڵ هێزە داخراو و تاریکەکاندا و لەگەڵ هێزی دژ بە مۆدێرنەدا سوود لە هەڵەکانی ئیبن روشد وەربگرین. دەشێت لەو خاڵەدا کە ئیبن روشد شکستی هێناو دواتر بیرچووەوە، ئێمە سەرکەوتوو بین، بەلأم لەوانەیشە چارەنووسی ئێمەش وەکو چارەنووسی ئەو بێت.

هاشم سالح

**لێکچەری یەکەم**

**تێبینیەك لەلایەن هاشم ساڵحەوە:**

ئەمە دەقی ئەو لێکچەرەیە کە لە کاسێتی ریکۆردەر دەرمانهێناوە لە تەك هەندێ دەستکاری و راستکردنەوەدا بۆ ئەوەی شێوەی نووسینێکی گونجاو و پێکەوە بەستراو لە خۆ بگرێت و لە دەقێکی زارەکی و خۆبەخۆ دوور بکەوێتەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، لە چەندین شوێنی ئەم تێکستەدا مۆرکی زارەکییانەی قسەکردن بەڕوونی دەردەکەوێ. ئێمە باوەڕمان وایە مۆرکی زارەکی دەنگێکی راستگۆیانەو ئەدایەکی زیندەگی بە قسەکردن دەبەخشێت خۆگەر لەسەر لاپەڕەیەکیش تۆمار کرا ئەوا زنجیرەی بیری بابەتەکە و رێکخستنی تێك نادات، ئێمەیش هەروامان کردووە، دەشێت ئەمە یارمەتیدەرێکی باشتر بێت بۆ تێگەیشتن لە بیری ئارکۆن. لەوانەیە ئەم بیرە بۆ خوێنەری نا پسپۆڕ و بۆ خوێنەرێك شارەزایی کەم بێت لە میتۆدی زانسته مرۆڤایەتی و کۆمەلأیەتییە نوێیەکان و کەرەستەو زاراوەکانیان، بیرێکی قورس بێت. لە راستیدا شێوازەکانی گفتوگۆ و چاوپێکەوتن و لێکچەری گشتی و کورتکردنەوەو شیکردنەوە شتێکی پێویسته بۆ گواستنەوەی فیکرێك لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر و لە رۆشنبیرییەکەوە بۆ رۆشنبیرییەکی تر. خۆیشم هەوڵمداوە لە پێناوی گواستنەوەی ئەم بیرەدا (بیری محەمەد ئارکۆن) هەموو ئەو رێگەیانە بگرمە بەر تا بە باشترین شێوە بیگوازمەوە بۆ گۆڕەپانی رۆشنبیریی عەرەبی.

من پێشتر و لە چەندین شوێنی تردا باسی بایەخ و هۆکار و گرنگیی گواستنەوەی فیکری ئارکۆنم کردووە و لێرەدا باسی ناکەمەوە. ئەوەی دەمەوێ لێرەدا بیڵێم ئەوەیە من بە تەواوی بەرپرسیاریی خۆم لە داڕشتنی ئەو لێکچەرانە لە ئەستۆ دەگرم، ئەگەرچی ئارکۆن خۆیشی سەیری کردوون و ڕێگەی داوە کە لە گۆڤاری "مواقف"دا بڵاویان بکەمەوە. من بەرپرسیاریی خۆم لە داڕشتنەکەیدا لە ئەستۆ دەگرم. گومانی تیا نییە کە دامەزراندنی فیکرێکی تازە لە زمانی عەرەبیدا بە کەناڵەکانی وەرگێڕان و گواستنەوەو شیکردنەوەو گفتوگۆ و شێوازەکانی تردا تێدەپەڕێت، دەشێت ئەم شێوازانە لە گواستنەوەی فیکردا گۆڕانکارییەکی گەورە بەسەر زمانی عەرەبیدا بهێنێت، بۆ نموونە توانای داڕشتن تیایدا فراوانتر بێتەوەو موفرەداتەکانی نوێ ببنەوەو خوێنێکی تازە بە دەمارەکانیدا بکات. زمانی عەرەبی سەدە و نیوێک زیاترە لەم ڕێگەیەوە چووەتە نێو چەرخی مۆدێرنەو نوێکردنەوەوە و ئێمەیش درێژەپێدەری ئەو کەسانەین کە بەر لە ئێمە ڕێگەیان گرتبووە بەر، مەبەستم ڕێگەی دڵەڕاوکێ و پرسیارکردن و گەڕان و توێژینەوەیە.

**تێکستی لێکچەرەکە:**

کاتێك باسی بابەتێکی گرنگی وەکو "ئیسلام و مۆدێرنە" دەکەین، دەبێ بەشێنەیی و وریاییەوە هەنگاو بنێین، دەبێ بەچاکی ئاگاداری بابەتەکە بین، ئەگینا لایەنگرانی گوتاری ئایدیۆلۆجیی باو بە پاشکۆی خۆرئاوا تاوانبارمان دەکەن، جا بۆ ئەوەی هیچ پاساوێکیان نەدەینە دەست، ئەوا پاشەکشە لە مۆدێرنە یاخود چوونە ناو مۆدێرنە ناکەین، بەڵام هەوڵدەدەین بە ئاگایی و لە دوای بیرکردنەوەیەکی درێژ بچینە ناوی، هەموو ئەمانە لە پێناوی ئەوەی ئێمە هەوڵبدەین کۆنترۆڵی مۆدێرنە بکەین نەك ئەو کۆنترۆڵمان بکات، هەروەها بۆ ئەوەی بزانین چۆن رەفتاری لەگەڵدا بکەین و هەرسی بکەین و بینوێنین، لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی بناسین. ئەمەیە هەڵوێستی فیکری و پرەنسیپیی ئێمە. بەڵام گەیشتن بەم ئامانجە پێویستیی بە کۆششێکی زیاتر هەیە و دەبێ لە هەموو هەنگاوێکماندا ئاگادارو وریا بین. بێئاگایی و بێوریایی لە مۆدێرنە و پرۆسیسەکانی مۆدێرنە لە رابردوویەکی نزیکی کۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا بووە مایەی چەندین کارەسات و هەڵەی گەورە. ئەو مۆدێرنیزەکردنەی شای ئێران پرۆسەی کرد و هەروەها ئەو تازەکردنەوەیەی لە جەزائیردا بەڕێگەی پیشەسازیی قورس ئەنجامدرا، دواجار بەشکست و دۆڕان کۆتایی پێهات ئەمە کەمترین شتێکە بوترێت. من لێرەدا تەنها دوو نموونەم لە نێو چەندین نموونەی بێشوماردا هێنایەوە. من ئەم ئەزموونە پڕ لە سەرکێشیانە بە نوێکردنەوەو مۆدێرنیزەکردنێك وەسف دەکەم کە خاڵییە لە مۆدێرنەی ئەقڵی یان فیکری یان رۆشنبیری. دەبێ زۆر بە چاکی ئەم خاڵە لە زەینی خۆماندا تۆمار بکەین. ئەم جۆرە سەرکێشییە کۆمەڵێ دەرەنجامی خراپی بەرهەمهێنا، کۆمەڵێ دەرەنجامی ترسناکی

سەبارەت بە مێژووی کۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکان هێنایە ئاراوە.

کاتێک لایەنگرانی گوتاری ئایدیۆلۆجیی "ئیسلامی"ی ئەمڕۆ ڕەخنە لەو کەسانە دەگرن کە دەیانەوێ بیرێکی نوێ بهێننە نێو فیکری عەرەبی و ئیسلامی، دەڵێن ئەمە شتێکی ناشایستەیەو ئەمە هێنانی فیکری نامۆیە و ئەمە پەلاماری فکرییە. لە ڕاستیدا قسەی ئەو ئایدیۆلۆجیستە ئیسلامگەرایانە شتێك دەسەلمێنێت ئەویش: ئەوانە ڕەوتی ئەقڵی و میتۆدیی پێویستیان بۆ تێگەیشتن لە سەرهەڵدانی مێژوویی مۆدێرنە تێنەپەڕاندووە.

گومانی تیانییە کە لێرەدا چەند ڕووبەرێك هەیە تیایدا ئەقڵی نوێ هەندێجار بەشێوەیەکی ترسناك دەخزێ و لە چرکەساتی بەرهەمهێنانی مۆدێرنە و ئەزموونی مۆدێرنەدا شتی ترسناك بەرهەم دەهێنرێت، هەندێجار هەڵە و زەرەرو زیانی گەورە لە تەك مۆدێرنەدا دروست دەبن. ئەمانە هەمووی ڕاستە. بەڵام ئەو هەڵانە و ئەو مەترسییانەی مۆدێرنە زۆر جیاوازە لە بیرکردنەوەو بۆچوونی لایەنگرانی گوتاری ئایدیۆلۆجیی ئیسلامگەرای باڵادەستی ئەمڕۆ. بۆ نموونە لێرەدا مەترسییەك هەیە تا ئێستا ئەقڵی نوێ خۆی لێ دەرباز نەکردووە بە تایبەتی کاتێك لێکۆڵینەوە لە بارەی ئایین و مێژووی ئایین ئەنجام دەدات، ئەو مەترسیەش بریتییە لە: "پۆزەتیڤیزم" *Positivisme* یاخود ئەقڵی پۆزەتیڤیستی، چونکە زۆر جار ئەم چەمکە بە چەمکێکی تر و بە هەڵوێستێکی تر گرێ دەدرێت کە بایەخ و ئیجابیەتێکی زۆری تێدایە بەڵام زۆرجار بە هەڵە تێیدەگەن و خراپ لێی حاڵی دەبن، ئەویش بریتییە لە: عەلمانییەت *Secularism* یان وەك هەندێ لە وەرگێڕە مەغریبییەکان دەڵێن "لائیکی" کە لە زاراوە فەرەنسیەکەوە وەریانگرتووە *La Laicite*.

کاتێك وشەی عەلمانییەت یان لائکیەت لە بەرامبەر جەماوەری ئەو موسڵمانانە واژە دەکەین کە سەر تا پێیان نوقمی کەشی ئەرتەدۆکسییە، یەکسەر هاواریان لێ بەرز دەبێتەوەو دەڵێن: ئەمە کاری شەیتانەو دوور بکەونەوە لێی، ئەمە شەیتانی خۆرئاوایە.

ڕاستە لێرەدا تێگەیشتنێکی خراپ یان بەکارهێنانێکی سەلبی بۆ مۆدێرنە هەیە، ئەویش بریتییە لە: عەلمانییەتی ئایدیۆلۆجی *Le Laicisme Militant* کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا (واتە لە ساتەوەختی گەشانەوەی فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم) کاردانەوەیەکی توندوتیژی لە دژی دەسەڵاتی کەنیسە و پیاوانی ئاینیدا هەبوو. بەڵام عەلمانییەت بە مانای ئیجابی و کرانەوەی وشەکە بریتییە لە یەکێ لە دەستکەوتە گەورەکانی مۆدێرنە، مومکین نەبوو شارستانیەتی نوێ بەبێ عەلمانییەت زیندوو بێتەوە. ئەگەر بەچاکی لە عەلمانییەت تێبگەین ئەوسا دەزانین چەندە سوود بەخش و ئیجابییە، ئەوسا دەتوانین هەرسی بکەین و پرۆسەی بکەین. ئێوەش ئەی خوێندکارە ئازیزەکانی خوێندنی باڵا، ئێوە ئێستا بە ڕێچکەی مۆدێرنەدا دەڕۆن و خۆتان بۆ بڕوانامەی دکتۆرا ئامادە دەکەن لە یەکێ لە زانکۆ هەرە ناودارەکانی خۆرئاوادا: زانکۆی سۆربۆن.

(یەکێ لە خوێندکارەکان هەڵدەستێ و قسە دەکات و بە دوور و درێژی بۆچوونی خۆی

دەردەبڕێ و داوا دەكات ڕێز لە شتە پیرۆزەكان بگیرێت و دەستكاری موقەدەسات نەكرێت چونكە لێرەدا شتگەلێك هەن مومكینە باسیان لێوە بكرێ بەلاّم شتگەلێكی تر هەن نابێ قسەیان لەسەر بكرێت، بۆ نموونە: دیاردەی سرووش (وەحی) و تەنزیل و.. هتد).

**مۆدێرنە و گرفتی فەرهەنگی باوەڕی كۆن**

ئاركۆن وەلاّمی دەداتەوە: بێگومان . تا ئەندازەیەك لەسەر هەقیت، من هەر لە سەرەتاوە ئاگادارم كردنەوە كە دەبێ لە بابەتی مۆدێرنەدا بەشێنەیی و وریاییەوە هەنگاو بنێین، چونكە خاكی ئەم مەسلەیە بە مین كێڵراوە. بەلاّم تۆ وشەگەلێكی زۆر چڕ و پڕ بەكاردەهێنیت كە بە چەندین دەلالەتی مێژوویی باركراوە بێئەوەی هەوڵبدەیت هەڵیانوەشێنیتەوە یان شیكردنەوەیان بۆ بكەیت، من لێرەدا كە دەڵێم ئەم وشانە چڕوپڕن و كێشێكی قورسیان هەیە، هیچ حوكمێكی بەهایی نادەم بەڵكو واقعی حاڵ باسدەكەم. سەرجەمی ئەو دەستەواژە زاراوەییە بنەڕەتییانەی لە ڕابردووەوە بە میرات وەرمانگرتووە (وەكو وشەی ئیمان و عەقیدە بە تایبەتی) تا ئەمڕۆ بیرمان تیا نەكردۆتەوە، ئێمە بە جۆرێك بەكاریان دەهێنین وەك ئەوەی شتی بەڵگەنەویست و جێگیربن، وەك ئاوخواردنەوە بەكاریان دەهێنین. ئێمە هەر لە سەرەتاوە و هەر لە منداڵییەوە لەسەر ئەوە ڕاهاتووین. بەلاّم ئەگەر بەڕاستی بڕیارمان دابێ بە فیعلی بچینە ناو كەشوهەوای مۆدێرنەی ئەقڵییەوە، چی دەبینین؟ سەبارەت بە بەكارهێنانی ئەو وشەگەلە قەبە و قورسانە كە هەموو ئاگایی ئێمەیان گرتووە، مۆدێرنە چیمان پێدەڵێت؟ مۆدێرنە چیمان پێدەڵێت سەبارەت بەو زاراوە ئیمانیانەی بارگاوی كراون بە چەندین مانا و سێبەری مانا؟ یان ئەوەی من بە "دەلالەتی كەنار" ناوی دەبەم؟

كاتێك مۆ بەشێوەیەكی خۆبەخۆ ئەو فەرهەنگە ئیمانی و لاهوتییە كۆنە بەكاردەهێنێت، ئاگاداری ڕادەی قورسی و چڕوپڕی و بارگەی مێژوویی و ڕەهەندە شاراوەكانی نییە، هەروەها ئاگای لە هەموو ئەو مەترسییانە نییە كە لە بەكارهێنانی ئەو فەرهەنگە لاهوتییە كۆنەدا هەیە. بۆ نموونە كاتێك باوەڕدارێكی تەقلیدی دەڵێت: هەندێ شت هەن گۆڕانكارییان بەسەردا نایەت و وەكو خۆیان دەمێننەوە، یان كاتێك دەڵێت: لێرەدا پیرۆز – موقەدەس هەیە (یان بە زمانی كلاسیكی ئیسلامی: حەرام) و نابێت پرسیاری لێبكرێت و دەستی بۆ ببرێت و دەستكاری بكرێت، هەروەها كاتێك دەڵێت: لێرەدا سروش (وەحی) هەیە و هەموو ئاینەكانیش لەو خاڵەوە واتە لە وەحیەوە دەستیان پێكردووە.. هتد. كە ئەم هەموو شتانە دەڵێت ئەوا زمانێكی چڕو پڕی زیاد لە پێویست بەكاردەهێنێت. بەمجۆرە دەبینین من وەسفی "چڕ و پڕ" بەكاردەهێنم، واتە ئەو وشە بێلایەنە بەكاردەهێنم تا هیچ حوكمێك لە بەهای ئەو شتە نەدەم. ئایا ئەم وشەیە مانای چییە؟ مانای ئەوەیە ئێمە بار كراوین بە قورساییەكی زۆری ئەو فەرهەنگە كۆنە. ئەو بارە زۆر لەوە قورسترە ئەمڕۆ بتوانین هەڵیبگرین و بەرگەی بگرین، تەنها ئەگەر بڕیارمان دابێت بەڕاستی بچینە ناو

کەشوهەوای مۆدێرنەی ئەقڵی و بەرپرسیارێتی کولتووری.

لە نێو ئەو بارە قورسانەدا (مەبەستم باری فەرهەنگی تەقلیدی) یەك شت نییە بەڵکو چەندین شت هەیە، دەبێ ئەو بارە بکەینەوە بزانین چیی تێدایە. ئەمڕۆ ئێمە بەوە ڕازی نابین ئەو بارە قورسە بخەینە سەر پشتمان بەبێ هیچ پرسیارکردنێك لە ناوەڕۆکیی شتەکان. واتە دەبێ بزانین چی تێدایە ئینجا هەڵیدەگرین، بە پێچەوانەی سەدەکانی پێشوو کە بەبێ پرسیار کردن باری قورسی فەرهەنگی کۆنیان هەڵدەگرت.

ئایا ئەمڕۆ مۆدێرنە چیمان پێدەڵێت سەبارەت بەهەر یەکێك لەو وشە و زاراوە تیۆلۆجییە کۆنانە؟ چیمان پێدەڵێت ئەگەر بە ڕاستی قایل بووین بچینە ناو کەشی مۆدێرنەوەو لە هەوا ئازادەکەی هەڵمژین؟ چی دەڵێت ئەگەر نەمانویست لەو حاڵەتی دوودڵییەدا بمێنینەوە، واتە حاڵەتی دڵەڕاوکێی بەردەوام لە نێوان قایل بوون بە مۆدێرنەو ڕەتکردنەوەی (وەك چۆن ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆری موسڵمانان لەو دۆخەدا دەژین)؟ وەك دەبینین ئێمە مۆدێرنەمان قبوڵە تەنها لەلایەنی ماتریاڵی و بەکاربردنی ئاساندا، کەچی لە هەمانکاتدا دەمانەوێ خەزینی وشە و فەرهەنگی لاهوتی کۆن بپارێزین تا هەست بە دڵنیایی و ئاسایش بکەین.

ئەمە هەڵوێستی ئاشتبوونەوەیەکی تەوەزەلەو شایستەی ئێمەی توێژەر و ڕووناکبیر نییە کە بە وتەو کردار پرۆسەی فیکر دەکەین. خۆ ئەگەر پشت بە هەڵوێستی ئەقڵانییانەی نوێ ببەستین — کە دەبێ لە چرکەساتێك لە چرکەساتەکاندا هەر پشتی پێ ببەستین — ئەوسا ناتوانین بڵێین لێرەدا شتگەلێك هەیە هەرگیز ناگۆڕدرێت. بەڵام من ناشڵێم کە هەموو شتەکان هەمیشە دەگۆڕرێن، بەڵام دەڵێم هەموو ئەم شتانە شتگەلی ئیشکالئامێزن: مەبەستم ئەوەیە ئەمانە گرفت بۆ مرۆڤ دادەنێن، گرفت بۆ ڕۆحی بەشەری پێشنیار دەکەن.

یەکەم دەبێ پرسیار لە چەمکی ستاتیك و دینامیك (الثابت و المتحول) بکەین. دووەم دەبێ پرسیار ڕووبەڕووی ئەنتۆلۆجیای تەقلیدی بکەینەوە، واتە هەموو ئەو گوتارەی لە دەوری کەینونەدا خولدەخوات، مەبەستم گوتاری تیۆلۆجیای تەقلیدییە، هەروەها میتافیزیکای کلاسیکی کە لە بیری گریکی ئەفلاتون و ئەرستۆوە دەرهاتوون کە دواتر عەرەب لە چەرخی فەلسەفییاندا وەریانگرتووەو پاشان جارێکی تر فەلسەفەی کلاسیکیی ئەورووپی وەریگرتۆتەوە. پاشان دەبێ پرسیار ڕووبەڕووی سەرجەمی گوتاری ئەنتۆلۆجی بکەین کەوای ڕاهێناوین بەشێوەیەکی ستاتیکیو بەردەوامخوازی و ڕەهایەکی نەگۆڕ باسی کەینونە بکەین.

هەموو ئەم وێناکردنە سەبارەت بە مۆدێرنە بووە بە وێناکردنێکی ئیشکالئامێز، واتە بەبێ پرسیار کردن و ئەرگۆمێنت باوەڕی پێناکرێت (لە بارەی ئەم مەسەلەیە بڕوانە هەڵوەشاندنەوەکانی جاك دێریدا بۆ میتافیزیکای کلاسیکی). لە رابردوودا بە درێژایی چەندین سەدە، ئەم وێناکردنە هیچ

گرفتێکی نەدەخولقاند و ئیشکالئامێز نەبوو. بەڵام ئەمڕۆ و لە نێو کەشوهەوای مۆدێرنەی تازەدا ئەم وێناکردنە بەبێ پرسیار و ئەرگۆمێنت تێناپەڕێت. بەڵام کاتێکیش دەڵێم ئەمە ئیشکالئامێزە مانای وایە خودی مۆدێرنەیش تا ئەمڕۆ نەگەیشتۆتە قۆناغی یەکلاکردنەوەیەکی تەواو سەبارەت بەم کێشانە، تا ئەمڕۆیش نەگەیشتۆتە ئەو قۆناغەی هەست بکات توانای ئەوەی هەیە شتێك بڵێت دەمودەست لەلایەن هەمووانەوە قبوڵ بکرێت، ئەگەرچی لە هەندێ خاڵدا گەیشتۆتە ئەو ئاستە بەڵام هێشتا بە تەواوی پێی نەگەیشتووە.

مۆدێرنە ئێستا لە قۆناغێکدایە پێمان دەڵێت: کەمێك لەسەرخۆبن، بابیر لەو شتانە بکەینەوە کە لە رابردوودا روویانداوە تا بەشێوەیەکی باشتر لە مەسەلەکان تێبگەین، لە ژێر رۆشنایی پێدراوەکانی مێژوو و پێدراوە کۆمەڵایەتییەکان لە شتەکان تێبگەین، تا ئێستا ئێمە ئاگاداریی ئەو پێدراوانە نەبووین و بایەخمان پێنەداون (تۆ بڵێ تازە خەریکە بایەخی پێدەدەین لە نێو توێژەرە زانستییە هەرە پێشرەوەکاندا).

کەواتە ئێستا مۆدێرنە لە قۆناغی پەروەردەیی پیداگۆجیدایە، لە قۆناغێکدایە سەرنجی خەڵکی رادەکێشێت، ئەو خەڵکەی لە کەشی فەرهەنگی یەقینیدا پێگەیشتوون و پەروەردەبوون، لە کەشی دۆگمایی تەقلیدیدا چەکەرەیان کردووە. بۆ نموونە لێرەدا کە وشەی سروش (وەحی) واژە دەکەین، هەست بەوە بکەین کە ئەمە وشەیەکی زۆر هەستیار و پڕ بایەخە و نابێت هەروا بە ئاسانی بە بۆنە و بەبێ بۆنە بەکاری بهێنین، بەو مانایە کە ئێمە بە باشی تێی ناگەین و ئەمە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی نوێ و ورد هەیە و نەکەوێتە ژێر ئەو وێناکردنانەی باوەڕە دۆگماییە چەسپیوەکان سەپاندوویانە، دەبێ ئەم وشەیە لە هەموو ئەو خڵتە ئایدیۆلۆجییانە پاك بکەینەوە کە پێوەی نووساون، چونکە باوەڕە دۆگماییە چەسپیوەکان لە هەناوی خۆیدا هەڵگری ئایدیۆلۆجیایەکی زۆرە، خۆ ئەگەر بە بەکارهێنانی ئەو وشەیە وەکو خۆی، قایل بین، ئەوا هاوکات بە هەموو بارگە ئایدیۆلۆجیەکەیشی قایل دەبین، بەڵام رەوتی ئێمە – وەك ئاشکرایە و وەك دواتریش روون دەبێتەوە، پێچەوانەی ئەو ئاراستەیەیە. کاری ئێمە ئەوەیە هەموو ئەو شتانە لە وشەی سروش داماڵین کە خراونەتە سەری و وشەکەیان قورس کردووە و کردوویانە بە کەرەستەیەکی ئایدیۆلۆجی، بە ئامانجی هەژموون و کۆنترۆڵکاری نەك بە مەبەستی فەزایەك بۆ مەعریفەیەکی کراوە بە رووی گەردووندا.

ئەمەیش لە راستیدا ئیشکالییەتە. ئێمە تا ئێستایش بە تەواوی نازانین سروش چییە. ئێستا دەتوانم ئەمە بڵێم: تا ئەم چرکەساتەی کە لەبەردەمی ئێوەدا قسە دەکەم هیچ کتێبخانەیەك لە جیهاندا نییە یاخود هیچ کتێبێکیش لە هەر زمانێکی جیهانیدا بێ نییە کە گرفتی سروش بە میتۆدی ئەقڵانییەتی نوێ بخاتە روو.

بێگومان لێرەدا کتێبگەلێکی زۆر هەن باسی سروش دەکەن و لە زۆربەی کتێبخانە جیهانییەکاندا دەست دەکەون و بە زمانی

جیاجیا چاپ کراون، بەڵام سەرجەمیان بەپێی تێڕوانینی تیۆلۆجیای تەقلیدی نووسراون و داڕێژراون، مەبەستم ئەو تیۆلۆجیانەیە کە بە سیفەتی سیستمێکی کولتووریی توند و نەفیکردنی یەکتر ئیشدەکەن. بەڵام دەبێ کەمێك لەم حوکمەم راست بکەمەوە و دەڵێم لەم دواییەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە لە فیکری پرۆتستانتی خۆرئاواییدا جۆرێك لە نەرمی و کرانەوە هەیە، لەوانەیە ئەمەیش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پرۆتستانتی – وەك لە ناوەکەیدا ڕووندەبێتەوە – مەیلێکی ناڕازی و پرۆتیستۆی هەیە، هەر بیری پرۆتستانتی بوو پێشتر بە ڕووی هەژموونی سەرجەمگیری باوەڕی کاتۆلیکیدا وەستا، بەتایبەتی لە رۆژگاری مارتن لۆتەردا، ئیدی بۆ یەکەم جار لە ئەوروپادا بواری بیرکردنەوەی ئازاد و سەربەخۆی کردەوە.

دەڵێم لەلایەنی پرۆتستانتدا جۆرێك لە نەرمی و کرانەوە هەیە، بەڵام ئەوانیش لەوە دوورتر ناڕۆن. تا ئێستا لە ناوەندی لێکۆڵینەوەی تیۆلۆجی کاتۆلیکی یان یەهودی یان پرۆتستانتی ڕەسمیدا لێکۆڵینەوەیەکی ئیشکالئامێزی نوێ نابینین بۆ مەسەلەی سروش، بەداخەوە ئەم مەسەلەیە لە کۆلێجەکانی شەریعەی ئیسلامیدا زۆر کەمترە، لەوێدا هیچ دەریچەیەك نابینین بۆ کرانەوە بەڕووی مۆدێرنە و سەردەم و ئەقڵانییەتدا.

جا باشە مادامەکی ئەمە بوونی نییە، ئەی چی بکەین؟ زۆر بە سادەیی دەڵێم: ئێمە ڕێ لە خۆمان دەگرین کە وشەی سروش بەکاربهێنین وەك بڵێی ئەم وشەیە وشەیەکی روون بێت و زانراو بێت و شەرح کرابێت، ئێمە ڕێگە لە خۆمان دەگرین کە بڵێین سروش بریتییە لە سروش و لەلای هەرسێ ئایینەکەدا هاوبەشە و هەندێ ڕاستیی جێگیر و کۆتایی لە خۆ دەگرێت و ئێمە دەیزانین و.. هتد.

بێگومان ئێمە دەتوانین بەپێی سنوورەکانی باوەڕ و شەهادەی ئیمانی ئەو قسانە بکەین، یان بەپێی عەقیدەی ئیسلامی ئەو قسانە بدرکێنین، بەڵام ئەمە گرفتێکە پەیوەستە بە ئاگایی تاکەکەسەوە، واتە ئاگایی باوەڕدارێکی تەقلیدی، ئەمە پەیوەست نییە بە ئاگایی پەیوەستکاری (تواصلی) کە هەموان لەگەڵیدان، مەبەستم زمانی پەیوەستکاری و بەردەمیخوازە کە بریتییە لە زمانی زانستی نوێ.

**تێبینی:**

ئەم لێکۆڵینەوەیە بەشێکە لە لێکۆڵینەوەیەکی درێژ کە دواتر لە کتێبێکی سەربەخۆدا چاپی دەکەین.

**سەرچاوە:**

*د. محمد ارکون، الاسلام و الحداثة، ندوة مجلة (مواقف)، تقدیم: ادونیس، دار الساقي – لندن 1990.

# کێ داوای لێبوردن لەکێ بکاتو کێ دادگایی کێ بکات؟

مەجدي خەليل

لە عەرەبييەوە: هەورامان وريا قانع

لە 30 ئەيلولى 2005، کۆمەڵێ لە کاريکاتێريستەکان چەند وێنەيەکى کاريکاتێريان لە ڕۆژنامەی (يولاندس بۆستن)ى دانيماريکى بلاوکردەوە، وێنەکان سوکايەتى کردن بوو بە هەندێ ڕەمزى ئيسلامى. هەرچۆنێك بێت ئەو وێنانە بەشێکە لە سلوکى خۆرئاوا بۆ ڕەخنەگرتن لە موقەدەس، بەبێ بونى سنورێك، وەك بەشێکى سەرەکيى لە ئازادى گوزارشتکردن کە شارستانيەتى خۆرئاوا هێناويەتيە ئاراوە.

دواى ئەوەى وەفدێك لە موسڵمانانى دانيمارك بۆ گەرمکردنى مەسەلەکە سەردانى چەند وڵاتێکى عەرەبييان کرد، هەندێ لە شێخە توندڕەوەکانو سيستمە سياسيە قەيراناويەکان لە ئێرانو سوريا، بۆ تەقاندنەوەى کەشوهەواى ناڕەزايى دژ بە بەرژەوەنديەکانى ڕۆژئاوا، ئەو ڕوداوەيان بەهەل زانى. "حەسەن نەسروڵلا" لە 1 شوباتى 2006دا وتى: (دەبێ هەڵوێستێکى توند لەبەرامبەر ئەم سوکايەتيکردنە بە پێغەمبەر بگيرێتەبەر، گەر فەتواکەى ئيمام خومەينى بە لە سێدارەدانى سەلمان ڕوشدى جێبەجێ بکرايە، ئەوا ئێستا کەس نەيدەوێرا سوکايەتى بە پێغەمبەر بکات[1]).

"يوسف قەرزاوى" لە خوتبەيەکى 3 شوباتى 2006دا کە کەناڵى ئەلجەزيرە ڕاستەوخۆ دەيگواستەوە، پڕ بەدەنگى هاوارى دەکرد: (پێويستە ئومەت توڕەببێت، لە ئيمامى شافعى دەگێڕنەوە کە وتويەتى: ئەوەى توڕەيانکردو توڕەنەبوو، ئەوە کەرە. ئێمە کەرنين، بەڵکو شێرينو دەنەڕێنين[2]). پاشان دەست بە هاتوهاوار دەکاتو داوا لە ئومەت دەکات توڕەبن. توندڕەوەکانى ئومەت، ئەوانەى بەهۆبێت يان بێ هۆ ئامادەن بۆ توڕەبونو توندوتيژو کاولکارى، بەدەم بانگەوازەکەى قەرزاوييەوە چوون، ئيدى چەندين خۆپيشاندانى توندوتيژو

وێرانکەر لە زۆربەی دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا بەرپابوو.

لە نێجیریاو لە ویلایەتی (بۆرنۆکاتسینا) 15 کڵێسا سوتان و 24کەس کوژران و 20دیکەش برینداربوون. لە لیبیا و لە شاری (بەنغازی)خۆپیشاندەران کونسوڵیەتی (ئیتالیا)یان سوتاندو لە ئەنجامی پێکدادانی نێوان پۆلیس و خۆپیشاندەران، 11 کەس کوژران. لە سوریا پێشەنگی خۆپیشاندەران، هەڵیانکوتایە سەر هەردوو باڵیۆزخانەی دانیمارک و نەرویج و باڵیۆزخانەی دانیمارک سوتا. لە لوبنان خۆپیشاندەران باڵیۆزخانەی دانیمارک و کۆنسوڵیەتی دانیمارکیان لە بێروت سوتاندو هێرشیشیان کردە سەر کڵێسای مارۆنی و هەردوو باڵیۆزخانەی نەرویج و چیللی، هەروەها چەند هێرشێکی گێرەشێوێنانەیان کردە سەر کۆمەڵێ مومتەلەکاتی مەسیحییەکان.

لە پاکستان و لە شاری (سۆکۆری)باشور، خۆپیشاندەران ئاگریان بەردایە دوو کڵێسا، لە کاتی پەلاماردان و هێرشکردنە سەر چەند بەرژەوەندیەکی خۆرئاوا، 5 کەس بوونە قوربانی. لە (تاران)ی پایتەختی ئێران، خۆپیشاندەران هێرشیان کردە سەر هەردوو سەفارەتی دانیمارک و نەرویج. لە تورکیا و لەشاری ئەنقەرە، راهیبێکی کاسۆلیکی کوژرا. لە غەززە کۆمەڵێ چەکدار هەڵیانکوتایە سەر نوسینگەی یەکێتی ئەوروپا و داوایانکرد کە یەکێتی ئەوروپا داوای لێبوردن بکات. لە رامەڵڵا کەتیبەی شەهیدانی ئەقسا، بەیانێکیان دەرکرد تێیدا هەرەشەی حەڵاڵکردنی خوێنی هاولاتیانی نەرویج و فەرەنسایان کردبوو. لە سعودیە شێخ "عبدالعزیز الرادجحی" فەتوای کوشتنی کاریکاتێریستە دانیمارکیەکانی دەرکرد، هەمان فەتوای کوشتن لەلایەن شێخ "ناضم المسباح"ی کوێتی دەرکرا[3].

لە هندستان حاکمی ویلایەتی ئۆتار "براداش یەعقوب قورەیش" دە ملیۆن دۆلار دەدات بە هەرکەسێ رەسامە دانیمارکیەکان بکوژێ[4]. شێخەکانی پاکستانیش یەك ملیۆن دۆلار دەدەنە هەر کەسێ یەکێك لەو رەسامانە بکوژێ. تەنانەت لەناوجەرگەی خۆرئاواشدا، لە لەندەن و لەلایەن حیزبی رزگاری ئیسلامییەوە، خۆپیشاندانێکی پرهات وهاوار رێکخرا، لەو خۆپیشاندانەدا هەندێ دروشم بەرزکرابوەوە داوادەکات: (ئەوەی سوکایەتی بە ئیسلام دەکات بیکوژن)، (ئەوانەی بەخراپە باسی پێغەمبەر دەکەن سەریانبڕن)، (کافرەکان لەناوبەرن). لە بەرنامەی (اکثر من رأي)ی کەناڵی ئەلجەزیرە، "عەزام التمیمي"بەڕێوەبەری پەیمانگای ئیسلامی لە لەندەن دەڵێ: (ئێمە لە حەقیان دێین..ئێمە خۆشەویستی و مۆشەویستی نازانین..ئەوەی لە پێغەمبەر نزیکبێتەوە، زۆر لەوە زیاتری پێدەکەین[5]). لە زۆربەی ولاتانی ئیسلامی ئالای ئەمریکا و ئیسرائیل و دانیمارك و نەرویج سوتێنران.

بێگومان ئەو رۆژنامانەی وێنەکەیان سەرلەنوێ بلاوکردەوە یان هاوسۆزبوون لەگەڵ ئازادی بیروڕا، لە ئازاردان و سوکایەتیپێکردن بێبەش نەبوون. رۆژنامەی (ساراواك)ی مالیزی داخرا. دوو رۆژنامە لە یەمەن داخران و سەرنوسەرەکانیشیان خرانە ژێر چاودێرییەوە.

ڕۆژنامەی (شمس)ی سعودیش ڕاگیرا. "جیهاد المونی" سەرنوسەری ڕۆژنامەی (شیحان)ی ئەردەنی لەسەرکار لابراو پاشان خرایە زیندانەوە. "رامی لکح" خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی (فرانس سوار) بەڕێوەبەری نوسینی ڕۆژنامەکەی دورخستەوە. ڕێکخراوی (ڕۆژنامەنوسانی بێسنور) ئەوەیان ئاشکراکرد کە: (کاردانەوەی ڕەسمە دانیمارکیەکان، ئاماژەیەکە بۆ خراپبونێکی مەترسیدار لە بواری ئازادی ڕۆژنامەگەری).

لە 12 ئەیلولی 2006 "پاپا باندێکت" لە یەکێك لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا، لێکچەرێکی فەلسەفی قووڵی لەسەر پەیوەندی نێوان (ئیمان و عەقڵ) پێشکەش کرد. لە میانەی موحازەرەکەیدا ئاماژەیەکی نێگەتیڤی لەسەر پێغەمبەری ئیسلام هێنایەوە کە ئیمپراتۆر "مانوێلی دووەم بالیلۆجۆس" لە سەدەی چواردەهەمدا وتبوی. پاپا سێجار داوای لێبوردنی لەو وەرگرتنەو لەو ئێشوئازارانە دەربڕی کە بەهۆی ئەو قسەیەوە دوچاری ئیماندارانی موسڵمان هاتووە، بەڕوون و ئاشکرایی ڕایگەیاند ئەو وەرگرتنە گوزارشت لە بیروبۆچونی خۆی ناکات. بەڵام وەك پیشەی هەموو جارێك، کاردانەوەی موسڵمانە توندڕەوەکان هەموو کاتێ خاڵییە لە عەقڵ و پڕیەتی لە توندوتیژی زمانەوانی و توندوتیژی فیعلی، چونکە ئەوانە ناتوانن هیچ جۆرە دیالۆگێك سازبدەن.

لەبەشی غەزەو کەناری خۆرئاوا هێرش کرایە سەر 5 کڵێسا و زەرەرو زیانێکی زۆریان لێکەوت. لە باشوری کەناری خۆرئاواو لە (تولکەرەم)و(تۆباس) هێرشکرایە سەر 2کڵێسا. لە (مەقادیشۆ)ی پایتەختی سۆماڵ، ڕاهیبێکی ئیتالی لە خەستەخانەدا کوژرا. لە نێجیریاو لە بەرواری 22 ئەیلول، ئاپۆرەیەك لە مۆسڵمانان لە پایتەختی ویلایەتی (جیجا) 11 کڵێسایان سوتاندو ئاگریان بەردایە دەیان یانەو دوکانی مەسیحیەکان، هەروەها بەبیانوی ئەوەی ژنێك هاوکات لەگەڵ قسەکانی پاپادا سوکایەتی بە پێغەمبەر کردووە، خانووەکەی ڕوبەڕوی تالانکردن بووەتەوە[6].

لە شاری غەزەو سوپای مەهدی لە عێراق هەڕەشەی ئەوەیان کرد گەر پاپا داوای لێبوردن نەکات، ئەوا مەسیحیەکان ئازاردەدەن و بە خاچپەرستەکان وەسفیان کردن. پەرلەمانی پاکستان بەکۆی دەنگ داوایان لە پاپاکرد لێدوانەکەی بکشێنێتەوە، وەزارەتی دەرەوەی پاکستان پاپای بە نەزان وەسفکرد. ئەندامی ئەنجومەنی پسپۆڕانی ئێران "ئەحمەد خاتەمی" کە پیاوێکی ئاینیە، لێدوانەکەی پاپای بە (بێ ئەقڵ)دایە قەڵەمو ڕایگەیاند: (جێگای داخە سەرۆکی مەسیحیەکان هێندە نەزان و کەم ڕەوشتە)، هەروەها داوای لەپاپا کرد لەسەر ئەژنۆ دانەوێتەوەو داوای لێبوردن بکات[7].

"یوسف قەرزاوی" بۆ کەناڵی جەزیرە قسەی کردو وتی: (ناکرێ لەئاست ئێشوئازاری لێدوانەکەی پاپادا بێدەنگبین). "قەرزاوی" ڕۆژی 21 ئەیلولی 2006 جارێکی تر لەسەر کەناڵی جەزیرە دەرکەوتەوە، وەلێ ئەمجارەیان دنەی موسڵمانانی دەدا هەر کەسێ سوکایەتی بە پێغەمبەر بکات بیکوژن و دەڵێ: (مرۆڤ گەر جوێن بە دایك وباوکی بدرێ تورەدەبێ و وەڵام

دەداتـەوەو لەوانەیـە کەسـی جوێنـدەر بکـوژیٚ، ئـەی چ بکـەین گـەر جوێنەکـە ئاراسـتەی ئـاین‌و پێغەمبەرەکەی کرابیٚ[8]).

ڕابـــەری شۆڕشــــی ئیـــسلامی "عــــەلی خامەنـــەئی" دەڵـــیٚ: (قـــسەکانی پاپـــا لـــە چوارچێوەی پیلانـەکانی ئـەمریکاو ئیسرائیل، حەڵقەیـــــەکی دیکەیـــــە لـــــە جـــــەنگی خاچپەرسـتەکان). شـێخی ئەزهـەریش دەڵـیٚ: (پاپا عەیامێك بـوو بێدەنگ بـوو، هـەر کـە کەوتـە قـسەکردن کـوفری کـرد). سـەرۆك وەزیرانـی تورکیا "ڕەجـەب تـەیب ئـەردۆغان" لێدوانـەکانی پاپـای بـە (دزێـو)وەسـفکرد. لـە بـەرواری 18 ئـــەیلولی 2006 ســـکرتێری گـــشتی یـــەکێتی زانایـانی موسـڵمان "محمـەد سـەلیم ئـەلعوا" وتارێکی لە ڕۆژنامەی (الاسبوع) نوسی‌و تێیدا پاپـای بـە (گێـلو درۆزن) وەسـفکردو دەڵـیٚ: (ئـــەوەی پاپـــا وتـــی هیـــچی لـــەو کـــەرێتی‌و بەدرەوشتیەی ڕەسمە دانیمارکیەکان کەمترنییە. ئەوەی پاپا وتـی درۆیـەو شایەنی کەسێك نییـە عەقڵی هەبیٚ‌و خاوەنی ئاینێکیش بێت [9]).

لە 28 ئەیلولی 2006 لـە ڕۆژنامـەی (وەفد)، دیـسانەوە "محەمـەد سـەلیم ئـەلعوا" پاپـای بـە: (تاوانبــارو گــەلحۆ) وەســفکرد. لــە جاکارتــا کۆمەڵەیـەکی ئیـسلامی تونـدڕەوی ئەندۆنیـسی خۆپیـشاندانێکیان سـازداو چـەند دروشمێکیـان بـەرزکردبوەوە کـە دەڵـیٚ: (پاپـا لەخاچـبدەن)، (ڤاتیکان بەرەی شەڕە)، (پێغەمبـەر مەزنـەو پاپا گرگن‌و خوێڕییە[10]).

لــە بــەریتانیا خۆپیــشاندانێك ســازکراو دروشمـی: (ئیـسلام ڕۆمـا ڕادەمـاڵیٚ)، (مەسـیح کۆیلـەی خودایـە[11]) بەرزکرایـەوە. لـە عێـراق‌و لەشـاری بەسـرە، چـەند کڵێـسایەکی کاسـۆلیکی سوتێنران‌و ئەنجومەنی شورای موجاهیدین کە هەشت تاقم لەخۆدەگریٚ‌و لەنێویاندا ڕێکخـراوی قاعیــدەش هەیــە، بەیاننامەیــەکیان دەرکــردو تێیـداهاتووە: (ئـەی خزمـەتکاری خـاچ، ئێـوەو ڕۆم بــەم نزیکانــە دەدۆڕێــن)، (ئــەی کــافرو تاعونـەکان، ئێمـە بـەردەوامین لـە جیهـادا تـاکو خودا یارمەتیمان دەدات ملتان بپەڕێنین)، (خاچ تێکدەشکێنین‌و مەی دەڕێژین‌و جزیـە دادەنێین، ئەوکات یان بە ئیسلام ڕازیدەبن یان بە شمشێر، موسـڵمانان وەك چـۆن پێـشتر قوسـتەنتنییەیان داگیرکرد، ئاوا ڕۆما داگیردەکەن[12]).

یەکێك لەسەرکردەکانی مـەحاکمی ئیسلامی کە بەم دوایانە دەستیانگرت بەسەر سۆماڵدا (لە ئەنجامی هێرشی سەربازی سوپای ئەسیوبیا بۆ سەر سۆماڵ‌و بە پشتیوانی حکومەتی پێشوی سـومال، تـوانرا مـەحاکمی ئیـسلامی لـەو وڵاتـە دەرپـەڕێنن، واتـە لـە ئێـستادا سـومال بەدەسـت حکومەتــە شــەرعیەکەی خۆیەوەیــە-وەرگێــڕی کــوردی-)، داوایکــرد پاپــا بکــوژن‌و داوای لــە موســڵمانان کــرد تۆڵــە بکەنــەوەو ڕایگەیانــد: (هەرکەســیٚ ســوکایەتی بــە پێغەمبــەر بکــات، پێویستە بکوژریٚ[13]). لە پاکستان‌و لە بەرواری 18 ئـــەیلولی 2006 ڕۆژنامـــەی (ئۆســـاف) فەتوایــەکی لــەژێر نــاوی مەڵبەنــدی (جــامتود داوا)، بــاڵی سیاســی ڕێکخــراوی ســەربازی (طیبــة)ی پاکستانی بڵاوکـردەوە، تێیـدا داوای کوشتنی پاپا دەکات[14]

"ئەیمەن ئەلزەواهیری"و "محەمـەد موعەمـەر قــەزاف" داوایــانکرد پاپــا ببێتــە ئیــسلام. لــە زۆربــەی بەیاننامــەو لێدوانەکانــدا پاپــا بــە

نەخوێندەوارو ناهوشیار وەسفکراوە، لەوانە (ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی)، (یەکێتی نێودەوڵەتی زانایانی موسڵمان)، (ڕێکخراوی جیهانی بۆ سەرکەوتنی پێغەمبەر)، (ڕێکخراوی فوقەهاکانی ئەمریکا). ئەمە گەرچی پاپای ڕۆما بەیەکێك لە گەورەترین فەیلەسوفانی ئەم سەردەمەی جیهان دادەنرێ. "هاشم ساڵح" لە ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط) ئاوا وەسفی پاپا دەکات: (لە مێژووی پاپەویەتدا گەورەترین پیاوی ئاینیە کە فەیلەسوفە). "هاشم ساڵح" بەردەوام دەبێ و دەڵێ: (دانی پێدادەنێم من سێجار وتارەکەیم لە وەرگێڕانە فەرەنسییەکەیەوە خوێندووەتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانم لێی تێبگەم، دڵنیاش نیم لەوەی توانیبێتم سەرجەم وتارەکەم ئیستیعاب کردبێت[15]).

ئەو کاردانەوەیەی بەرامبەر ڕەسمە دانیمارکیەکان و لێدوانەکانی پاپای ڕۆما ڕویدا، دەکرێ لەیەك ڕستەدا کورتیبکەینەوە کە ڕەوتێکی فراوان لە تونڕەوەکانی جیهانی ئیسلامی تەبەنی دەکەن و بە تاقە دروشمی نارەزایی دادەنێن، ئەویش بریتیە لە (چەقۆکێشی چارەسەرە). ئەم هەموو کوشتن و وێرانکردن و شەقاوەیی و هەڵچونە هێستریائامێزانە، بەلای هەزاران شێخی تونڕەوو ملیۆنان لە شوێنکەوتووەکانیانەوە کارێکی ڕەوایە. ئەی سەبارەت بەو سوکایەتیکردنەی ڕۆژانە لەجیهانی ئیسلامیەوە بەرامبەر بە ئاینەکانی دیکە دەکرێ، بە تایبەتی بە ئاینی جوولەکە و مەسیحی، بڵێین چی؟ هەروەها چی بەو لێدوانانە بڵێین کە بانگەشەی کوشتنی خەڵکی بێتاوان و هاندانی وێرانکردن و تالان و بڕۆیی دەدەن. دەڵێن ئەمجارە سوکایەتیکردنەکە لە سەرۆکی کلێسای کاسۆلیکیەوە هاتووە و سەرچاوەی مەترسییەکەش ئالێرەدایە. ئەی سەبارەت بەو سوکایەتیکردنەی لەلایەن گەورەترین سەرانی جیهانی ئیسلامیەوە کە بەرامبەر بەوانی دیکە دەردەچێت، دەڵێن چی؟.

ئەمەی خوارەوە هەندێ لەو لێدوان و قسانەیە کە گەورە پیاوانی ئاینی ئیسلام و سیاسیەکان و بانگەشەکەرانی تونڕەویی لە جیهانی ئیسلامی، ڕایانگەیاندووە، هەر هەموشی قسە وتنە بە ئاینەکان و ئەوانیتر، بانگەشەی تیرۆرو توندوتیژی دەکەن و دژی گفتوگۆو دژی مرۆڤایەتین:

* فەتوای لیژنەی دەرکردنی فەتوای سعودیە، ژمارە 1940 بۆ تەکفیرکردنی جوولەکەو مەسیحیەکان و تێیدا هاتووە: (لەسەر زەوی هیچ ئاینێك ڕاست نیە، تەنها ئیسلام نەبێت، لە بنچینەکانی ئیسلامدا هاتووە هەر جوولەکەیەك و مەسیحیەك نەبوو بە ئیسلام، پێویستە وەك کافرێك حسابی بۆ بکرێ، هەروەها نابێ موسڵمان بەو داوایە ڕازیبێت کە لە یەك کۆمەڵگادا داوای دروستکردنی مزگەوت و کلێسا و پەرستگا دەکەن، چونکە لەوەدا دانپیانانێك بە ئاینێکدا هەیە جگە لە ئاینی ئیسلام، هەروەها نابێت تەورات و ئینجیل چاپبکرێن[16]).

* فەتوای لیژنەی دەرکردنی فەتوا لە سعودییە، ژمارە 21413 سەبارەت بە دروستکردنی کلێسا لە دورگەی عەرەب دەڵێ:

(هەر ئاینێ جگە لە ئاینی ئیسلام بریتیە لە کوفرو گومڕایی، هەر شوێنێکی عیبادەت جگە لە شوێنەکانی ئیسلام، بریتیە لە شوێنی کوفرو گومڕایی، ئەوەی پێی وایە جوولەکەو مەسیحی لەسەرحەقن، ئەوە کتێبی خوا بەدرۆدەخاتەوە، لەبەرئەوە زانایان هاوڕان لەسەر حەرامکردنی دروستکردنی پەرستگای کوفر لە نمونەی کڵێسا لەوڵاتانی موسڵماناندا، هەروەها نابێ لە وڵاتی ئیسلامدا دوو قبلە پێکەوە هەبن. دورگەی عەرەب دوو ئاین پێکەوە کۆناکاتەوە تەنها یەك ئاین نەبێ کە ئاینی ئیسلامە، ئەمەش بەپێی فەرمودەی سەحیحی پێغەمبەر کە مالكو ئەوانیتر ڕیوایەتیان کردووە[17]).

* فەتوای شێخی ئیسلام "بن تیمییە" بە تەکفیرکردنی مەسیحیەکانو کڵێساکانیان، لەو فەتوایەدا هاتووە: (ئەوەی لەوبڕوایەدایە کڵێساکان ماڵی خودانو تێیدا خودا دەپەرسترێت، یان ئەوەی جوولەکەو نەساری دەیکەن خودا پەرستییە، ئەو کەسە کافرە. ئەوەی لەو بڕوایەدایە سەردانی ئەهلی زمە بۆ کڵێساکان، لە یەزدانی نزیکدەکاتەوە، ئەوە هەڵگەڕاوەتەوە، گەر لە نەزانینەوە ئەوەی کردو پاشان هەستی کرد ئەوە حەرامە، کەچی هەر سوربوو لەسەرجێبەجێکردنی، ئەوا دەبێتە کەسێکی مورتەد[18]).

* شێخی ئەزهەری پێشوو "عبدالحليم محمود" لە کتێبێکیدا بەناونیشانی (ئیمان بەخودا) دەڵێ: (مەسیحیەکان وەك نەخۆشییەکی کوشندەن کە لە یەکێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ یەکێکی دیکە، پێویستە لەسەر موسڵمانەکان بیانچەوسێننەوەو بەشێوەیەکی خراپ مامەڵەیان لەگەڵدا بکەنو بەسوك تەماشایان بکەنو تێکەڵیان نەبن، تاکو ئەو کاتەی ناچاردەبن بێنە سەرئاینی ئیسلام[19]).

* فەتوای شێخی ئەزهەری پێشو "عەلی جاد ئەلحەق" بۆ تەکفیرکردنی جوولەکەو مەسیحیەکان دەڵێ: (ئافرەتی موسڵمان نابێ ببێت بە هاوسەری کەسێکی ناموسڵمان، چ جوولەکە یان نەسرانی، ئەوانەی لەسەر ئەو دوو ئاینەن، بەکافرو موشریك وەسفدەکرێن[20]).

* تەکفیرکردنی "یوسف قەرزاوی" بۆ جوولەکەو مەسیحیەکانو کتێبەکانیان، ئەمەش چەندینجارلە کتێبو کۆڕو سیمینارە تەلەفزیۆنیەکانیدا دەبینرێ، دواهەمینیان بەرپەرچدانەوەی لێدوانەکانی پاپای ڕۆما بوو، قەرزاوی لەوبارەیەوە دەڵێ: (مەسیحیەکان مەخلوق بە خالق دەشوبهێنن، ئەمەش بۆئەوەی مرۆڤ بکاتە کوڕی خودا یان بیکاتە سێیەکی خودا یاخود بەشداری لە بەشێك لە خودادا بکات. قورئانی پیرۆز تاقە بەڵگەنامەیەکی ئاسمانییە کە بە سەلامەتی ماوەتەوەو تەحریف نەکراوەو گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە[21]).

* "موعەمەر قەزافی" سەرۆکی لیبیا لەبەردەم یەکێتی ئەفریقادا وتی: (محەمەد ناسخی هەمو ئاینەکانی پێش خۆیەتی، گەر عیسا لەسەردەمی پێغەمبەردا بژیایە، دەبووە شوێنکەوتوی موحەمەد، ئەوەی پێیدەوترێ عەهدی کۆنو عەهدی تازە، ئەسڵو ئەساسی نییە، چونکە ئەو دووانە نەسخکراونو ساختەنو دوای عیسا بە سەدان ساڵ نوسراونەتەوە، موسڵمانانی ئەوروپا، ئەوروپا دەکەنە کیشوەرێکی موسڵمان، ئەوروپاو

ئەمریکا بەتێپەڕینی کات یان ئەوەتا ڕازیدەبن بەوەی ببنە موسڵمان یان ئەوەتا جەنگ دژی ئیسلام ڕادەگەیەنن، سەرۆکی ئەمریکا گلاو موشریکە[22].

* ئەوەی داعییەی ئیسلامی "زەغلول النجار" دەیڵێ و دەینوسێ، وەك: (پێویستە موسڵمانان بەهەموو ڕێگایەك تێکۆشن بۆ ڕوخاندنی ئیسرائیل[23]). (ئاینی جوولەکە ئاینێك نییە لە ئاینەکان، هێندەی ئەوەی حاڵەتێکی نەخۆشییەو لە چوارچێوە مرۆڤایەتیەکەی هاتووەتە دەرەوەو چووەتە ناو بازنەی شەیتانەکانەوە[24]. (بێباوەڕان و موشریکان و دووڕووەکان، بەتایبەتی ئەوانەیان کە خاوەنی کتێبن و ئاینەکەیان تەحریف کردووە، وەك جوولەکە تاوانبارەکان کە لە مێژودا بەکۆڵەکەی کوفر دادەنرێن و تاکو ڕۆژی ئەمڕۆشمان هەر وان و تاکو ئەو ڕۆژەش کە خودا زەوی دەپێچێتەوە هەر بەوشێوەیە دەمێننەوە، ئەوان قێزەونترین جۆری کوفرن[25]).

هەڵوێستی هەندێ لەوانەی پێیاندەوترێ ئەهلی کتێب و پەیمان، بەتایبەتی کافرەکانیان، ئەوانەی لە ئەنجامی لادانیان لە عەهدو پەیمانەکان لە ڕێگا دەرچوون، وەك ئەو شوێنکەوتوانەی "موسا"و "عیسا" سەلامی خوایان لێبێت، کە لە عەهدو پەیمانەکانیان دوورکەوتونەتەوە، پاشان بێبەریکردنی مەسیح لەو قسە درۆزنانەی کە دەڵێن گوایە بانگەشەی خودایەتی کردووە[26].

* "خالد مشعل" سەرۆکی بزوتنەوەی حەماس، لە لێدوانێکیدا دەربارەی وێنە دانیمارکیەکان دەڵێ: (ئومەتی موحەمەد دەبێتە سەرکردەی جیهان و بەڕێوەی دەبات، لە فەلەستین دەشکێن و شکاندنەکەشیان دەستپێکردووە، لەعێراق دەدۆڕێن. ئومەتی موحەمەد لە فەلەستین و عێراق دەیبەنەوە. گەر داوای لێبوردن لە ئومەتەکەمان نەکەن، پەشیماندەبنەوە. ئومەتەکەمان کاتێ بە پشتیوانی خودا جیهان بەڕێوەدەبات، ئەودەم لێیانخۆش نابێت، ئومەتەکەمان بەڕێوەیە[27]).

* ئەو فەتواو بیروڕایانەی هەفتانە "یوسف قەرزاوی" دەربارەی تیرۆرو کوشتن و پێکدادان ڕایاندەگەیەنێ، وەك: (لە وەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بە سەربڕینی "نیك بێرج" بارمتە ئەمریکیەکە لە عێراق، ئایا ئەو سەربڕینە ئیسلامییە یان غەیرە ئیسلامیە، دەڵێ ئەوەی ڕویدا کاردانەوەیەك بوو لەبەرامبەر ئەو کارە وەحشیانەی ڕودەدات، عێراقییەکان لەبەرامبەر ئەو وەحشییەتە ترسناك و دڕندانەیەی ئەمریکا، دەتوانن چی بکەن؟[28]).

"قەرزاوی" دەربارەی کوشتنی جوولەکە دەڵێ: (ئێمە بەناوی ئیسلامەوە جوولەکە دەکوژین. ئاینمان فەرزیدەکات لەسەرمان جوولەکە بکوژین. جیهاد فەرزێکە لەسەر هەمو ئومەتی ئیسلام. نابێ ئاین لە جەنگەکە دووربخەینەوە، دورخستنەوەی ئاین لە جەنگەکە هۆکاری دۆڕاندنمانە. کاتێ لەژێر دروشمی ئیسلامدا دەچینە نێو جەنگەوە سەردەکەوین، تەنانەت بەردو داریش دێنە قسەو دەڵێن ئەی موسڵمان، ئەی بەندەی خودا، جوولەکەیەك لە دواتەوەیەو بیکوژە[29]).

* "قــەرزاوی" دەربــارەی تــیرۆر دەڵــێ: (تـیرۆری نێودەوڵـەتی ئـەمریکا پێیهەڵدەسـتێ، ئـەوە ڕەتدەکەینـەوە بـەکارە ئیستـشهادییەکان بـوترێ کـاری خۆکـوژی، جیهـادو مقاومەمـە بـۆ وەرگرتنەوەی حەق تیرۆرنییە، تەنانەت ئافرەت لــــە کۆمــــەڵگای ئیــــسلامیدا ئامــــانجی موجاهیـدەکانن، چـونکە سـەرتاپای کۆمـەڵگای ئیسرائیلی کۆمەڵگایەکی سەربازییە[30]).

* "قـەرزاوی" سـەبارەت بـە ئـازادی دەڵـێ: (دابینکردنـی ئازادیمـان بـۆ ئـەوە دەوێ خـەڵکی بڵـێن شـەریعەتمان دەوێو حوکمـەکانی خـودا جێبەجێ دەکەین[31]).

* "قــەرزاوی" ســـەبارەت بــــە هێنــــانی ئافرەتێکی بیانی دەڵێ: (یـەکێ لە مەرجەکانی هێنـانی ئـافرەتێکی بیـانی ئەوەیـە ئافرەتەکـە شــەریف بێــت، بــەڵام ئــاخۆ لــە خۆرئــاوادا ئــافرەتێکی شــەریف هەیــە؟ هــەرگیز نــابێ ئافرەتێکی موسڵمان شـوو بـە پیـاوێکی غـەیرە موسڵمان بکات[32]).

* "ئەیمــــەن زەواهــــیری"و جــــەنگی گەردونیانەی قاعیدە دژ بە خۆرئاوای مەسیحی دەڵــــێ: (هــــەر ئامانجێــــك لــــە خۆرئــــاوای خاچپەرسـت، چ مـەدەنی یـان سـەربازی بێـت، ئامـانجی موجاهیدەکانـە، بـەلای موسـڵمانانەوە هـــەموو میللـــەتانی خۆرئـــاوا جـــەنگاوەری شـــەڕکەرن دژ بـــە موســـڵمانەکان. پێویـــستە شـەڕەکەمان جیهـاد بێـت لـەپێناو خـوادا، تـاکو ئاینی خـودا سـەرکەوێو هـەموو خـاکی ئیسلام هەر لە عێراقەوە بۆ ئەندەلوس ڕزگاربکرێن[33]).

"ئەیمـەن زەواهـیری" لـە کتێبێکیـدا بـەناوی (سوارچـاکان لـە ژێـر ئـاڵای پێغەمبـەردا)دەڵـێ: (ئامانجمــــان حــــوکمکردنو ئینتیماکردنــــە، حوکمکردن بریتیـە لـە حکومـەتی ئیسلامی کـە شـەریعەت جێبـەجێ دەکات، ئینتیماش بریتیـە لـە دابڕانـی تـەواوەتی لەگـەڵ کافرەکـان، هـیچ پەیوەندییەکی دیبلۆماسی یان سەربازی یاخود بازرگانیان لەگەڵدا نەبەسرێت. بێ بـەریبوون لـە پەرســــتگاکانیانو عــــاداتو تەقالیــــدیان، جلوبــەرگیانو دامودەزگاکانیــانو زانــستو بەهاکانیان).

* "محەمــەد حــەبیب" جێگــری سـکرتێری گــشتی ئیخــوان موســلمینی میــسر دەڵــێ: (مقاوەمە لە عێراقو فەلەستین، بەرگریکردنـە لـە شـەرەفو کەرامـەتی ئومـەتو یەکـەمین هێڵـی بـەرگری هـەموو جیهـانی ئیسلامیە، لەبەرئـەوە کـارە ئیستـشهادییەکان لـە فەلەسـتینو عێـراق بەرگرییە بۆ گەڕاندنەوەی باوەڕو ئیمانو هیوا، ئەو ئومەتـەی شارەزای سنعەتی مـەرگ نـەبێت، شایەنی ئەوەنییە بژی[34]).

* "محەمــەد مەهــدی عــاکف" ســکرتێری گــشتی ئیخــوان موســلمین لــە میــسر دەڵــێ: (جیهانی خۆرئاوا، ئـەمریکاو ئـەوروپا، دژایـەتی ئیسلام دەکـەنو نایانـەوێ ئیسلام لەسـەر پێـی خــۆی ڕاوەســتێ. پێویــستە موســڵمانان ببنــە خاوەنی بۆمبی ئەتۆمی[35]).

* "محەمــەد مەهــدی عــاکف" دەڵــێ: (گــەر هەربستێکی ئیسلام داگیربکرێت، جیهاد دەبێتـە فەرزێکی بەڵگەنەویست، من یەکەم کەسم لەهـەر کوێیـەك بێـت، دەمـەوێ چەك دژی شەقاوەکانی جوولەکـە هـەڵبگرم، بـەڵام گرفتەکـە لـە ڕژێمـە جاهیلەکاندایە، ئـەو جاهیلانـەی حوکمی میسر دەکەن، پێیان دەڵێم بگەڕێنەوە بۆلای خودا، گەر

ئەوە نەكەن، ئەوا بەم نزيكانەو بە پشتيوانی خودا، ميللەت پانتان دەكاتەوە(36)).

* داعيەی ئيسلامی "عبدالصبور شاهين" دەڵێ: (ململانێكانمان لەگەڵ خۆرئاوا ڕەگێكی ئاينی هەيە. لە ڕاستيدا ئەوان ئيسلام ڕەتدەكەنەوە، ململانێمان لەگەڵيانـدا لەبەر ئەوەيە ئەوان ئيسلام ڕەتدەكەنەوە(37)).

لە ئينسايكلۆپيدياى ئيسلاميدا هاتووە: (بڵاوكردنەوەی ئيسلام بە شمشێر فەرزێكە لەسەر هەموو موسڵمانێك(38)).

* تەماشای ئەوەبكەن وەزارەتی ئەوقاف لەميسر لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت بڵاويدەكاتەوە: (مەسيحيەكانو جوولەكەكان، بە تێكەڵكردنی وەحی ئەسڵی لەگەڵ لێكدانەوەی مرۆڤەكاندا، كتێبە پيرۆزەكانيان خراپكردووە. ئيسلام ئەوە دەزانێ كە باوەڕی تەواوەتی تاقە ڕايەڵێكە دەتوانێ هەموو مرۆڤەكان يەكبخات، بۆيە پێويستە لەسەرمان بە قەڵەمو شمشێر هەموو پيلانەكانی جوولەكەو ماسۆنیو ڕۆژهەڵاتناسیو هەڵمەتی تەبشيری وردوخاش بكەين. هيچ بەرژەوەندی يان ئاشتييەك لەگەڵ ئەهلی كتێبدا نييە، تاكو لەناويان دەبەينو ئێمە دەبينە باڵادەست. ڕەگەزپەرستی ئاينی جوولەكەو وادەكات ئامۆژگارييەكانيان پێكەنيناوی بێت. باوەڕی (التثليث)و مردنی مەسيح لە مەسيحيەتدا، هەموو پرنسيپە ئەخلاقييەكانيان ڕەتدەكاتەوە(39)).

* موفتی "د.عبدالرحمان بن احمد فايع الجرعی" ئەندامو دەستەی وانەوتنەوە لە زانكۆی (مەليك خالد) لە وەڵامی پرسياری خوێندكارێكی كۆليژی پزيشكی دەربارەی بەكارهێنانی لاشەی مردوو لە دەرسی فێربونی توێكاريدا دەڵێ: (ئاساييە لەكاتی پێويستی خوێندكارانی پزيشكيدا، لاشەی مردوويەك بەكاربهێنرێ، بەڵام ئەو لاشەيە نابێ لاشەی كەسێكی موسڵمان بێت، چونكە لاشەی كەسی موسڵمان چ بە مردوويی يان بە زيندووی پێويستە ڕێزی لێبگيرێت، وەلێ كەسی نا موسڵمان گوێ بە لاشەكەی نادات(40)).

* "محمەد نەزال" ئەندامی مەكتەبی سياسی حەماس لە پاڵپشتكردنی بۆ قاعيدە دەڵێ: (ئێمە لەگەڵ هەموو هەوڵدانێكداين دژ بە ئيمپرياليزم، گەر قاعيدە بە مەبەستی شەڕكردن لەگەڵ ئيسرائيل هات بۆ فەلەستين، ئەوا ئێمە پێشوازی لێدەكەين(41)).

تەنانەت ئەنفلەوەنزای باڵندەش دەخەنە ئەستۆی جوولەكەوە.

* جوولەكە بەرپرسن لە بڵاوكردنەوەی ئەنفلەوەنزای باڵندەو نەخۆشييەكانی ديكەو ئەنتراكس، ئەمانەش دوای بڵاوكردنەوەی (جمرة الخبيثة)و شێتی مانگا(42).

ئابەم شێوەيە سەرجەم گوتاری ڕاديكاليزمی ئيسلامی كە كۆنتڕۆڵی ڕەوتی گشتی توندڕەويی كردووە لەوڵاتانی ئيسلامی، گوتارێكی تەكفيرييە بۆ جوولەكەو مەسيحييەكان، گوتارێكە هانی تيرۆرو كوشتن دەدات، گوتارێكە ڕەخنە لە كتێبی پيرۆزی جوولەكەو مەسيحييەكان دەگرێو دەيەوێ تەحريفی بكات، گوتارێكی دوژمنئاميزە بەرامبەر بە خۆرئاواو ئەمريكاو ئيسرائيل، گوتارێكە توندوتيژی بەكارێكی پيرۆز دادەنێو بە مەهانەی ناڕاست پاساو بۆ تيرۆر دەهێنێتەوە،

گوتارێکە لەبەرامبەر تیرۆرستانو کردەوەکانیان نەرمونیانــــە، گوتارێکـــــە دژ بـــــە بـــــەها مرۆڤایەتییەکان.

لێرەوە هەموو جیهان لەبەردەم مەترسی توندڕەوە ئیسلامییەکانو تیرۆریاندایە، لەبەردەم ئەو دابەشکردنە شەڕانگێزییەیاندایە کە بۆ جیهانی دەکەن، (کافرەکانو باوەڕداران، دارئیسلامو دار الحرب، الولاء و البراء، جیهاد).

توندڕەوەکان لەژێر پەردەی ئەوەی پێیدەوترێ جیهاد، پاساو بۆ هەموو تاوانو خوێنڕشتنو کوشتنی بێتاوانو دەستدرێژیکردنە سەر خەڵکانی مەدەنیو منداڵ دەهێننەوە. لەبەر ئەمەیە "دانیال بایبس" دەڵێ: (جیهاد سەرچاوەی یەکەمی تیرۆرە لە جیهاندا[43]).

"عەفیف الاخضر" دەڵێ: (جیهاد مەترسییەکە بۆسەر هێمنیو ئاسایشی جیهانو شارستانیەتەکەی، تیرۆرو جیهاد دوو ناون بۆیەك شت، هەمان ئەو هەڕەشەیە پێکدەهێنن کە فاشیەت لە سییەکانی سەدەی ڕابردودا خستییەوەو مرۆڤایەتی بەرەو جەنگی دووەمی جیهانی پەلکێشکرد کە 65 ملیۆن کەس تێیدا لەناوچوون. ئەو جیهادەی ئیسلامییەکانی ئیسلام پێشکەش بە جیهانی دەکەن، ئەو دەرمانەیە کە ماوەی بەکارهێنانی لە سەدەی شازدەهەمەوە بەسەرچووە، گواستنەوەی ئیسلام لە جیهادەوە بۆ سیاسەتو لە بەداوەوە بۆ شارستانیەت، تەحەدایەکی جیهانییە[44]).

وەك ئەوەی "ئەحمەد بەغدادی" دەڵێ: (جیاوازی چییە لەنێوان ئەوەی هێتلەر بە ئاشکرا کتێبەکانی دەسوتاند، لەگەڵ ئەوەی دەستەو تاقمە ئاینیەکان کتێبە فیکرییەکان قەدەغەدەکەن؟ چی بەوە بڵێین کە داوای لە ڕەگوڕیشە دەرهێنانی بەهائییەکان دەکات لە میسر، تەنها فاشی نەبێت؟ ئەی چی بەوە بڵێین کە داوای کوشتنی شیعەکان دەکات لە عێراق، گەر فاشی نەبێت؟ ئەی بەو کەسانە بڵێین چی کە لێناگەڕێن خەڵکانی دیکە تەبشیر بۆ ئاینەکەی خۆیان بکەن یان لێناگەڕێن خواپەرستی بە ئاینەکەی خۆیان بکەن، گەر فاشی نەبێت؟ چی بەوە بڵێین هەڕەشە لە کوشتنی ڕۆشنبیرەکان دەکات، گەر خۆی فاشی نەبێت؟ هەموو ئەوانەی بەم جۆرە کارانە هەڵدەستن فاشین، بگرە نازیشن[45]).

کێ لەسەریەتی داوای لێبوردن بکاتو کێ دادگایی کێ بکات.

وەك ئەوەی سەرۆك وەزیرانی پێشوی ئیسپانیا "خۆسێ ماریا ئەزنار" دەڵێ: (بۆچی پێویستە هەموو کاتێ خۆرئاوا داوای لێبوردن بکات، لە کاتێکدا جیهانی ئیسلامی هەرگیز داوای لێبوردن ناکات، من هیچ ڕۆژێ نەمبیستووە موسڵمانێك داوای لێبوردن بکات لە هێرشکردنە سەر ئیسپانیاو داگیرکردنی بۆ ماوەی هەشت سەدە، گومانم نییە لەوەی پێویستە لەسەرمان ڕوبەڕوی ئیسلامی توندڕەوو ڕادیکاڵ بوەستینەوە کە کاریگەری بەسەر جیهانی ئیسلامییەوە هەیە، هیچ چارەیەکی دیکە نییە تەنها ڕاوەستان نەبێت بەرامبەر بە ئیسلامی فەندەمێنتاڵیزم. ئێمە بەردەوام هێرشمان دەکرێتە سەر، بۆیە لەسەرمانە بەرگریبکەین[46]).

ئەو هاتوهاوارە ئیسلامییەی داوادەکات خۆرئاوا لە هەموو شتێکی گەورەو بچوکدا داوای لێبوردن بکات، کەچی ئاوڕ لە هەڵە قورس و ناخۆشەکانی خۆی و گوتارە دوژمنکارانەکەی و هەڵسوکەوتە شەڕانگێزەکەی خۆی ناداتەوە، ئەو قسەیەی "نزار قەبانی" بەسەردا پیادەدەکرێ کە بۆ لاواندنەوەی "تەها حسێن" وتویەتی: (چاویلکەکەت دابنێ تۆ کوێرنیت، بەڵکو ئەوە ئێمەین کوێرین).

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**


1-جريدة الأهرام 3 فبراير 2006

2-قناة الجزيرة 3 فبراير 2006

3-إيلاف:صالح الراشد " ايهما اخطر الرسام الدنمركي أم هولاء"،8 فبراير2006

4-العربية نت 20 فبراير 2006

5-قناة الجزيرة ،برنامج أكثر من رأي

6-رويترز، 21 سبتمبر2006

7-الجزيرة نت،15 سبتمبر 2006

8-قناة الجزيرة ،21 سبتمبر 2006

9-جريدة الأسبوع، 18 سبتمبر 2006

10-وكالة الأنباء الفرنسية، 18 سبتمبر 2006

11-بي بي سي ،18 سبتمبر 2006

12-وكالة الأنباء الفرنسية، 18 سبتمبر 2006

13-وكالة الأنباء الفرنسية، 17 سبتمبر 2006

*14- Pakistani Journal "Ausaf" September, 18, 2006*

*Markaz-Ud-Dawa(MUD),A political wing of the Lashkar-E-Toiba(LET).*

15-هاشم صالح :جريدة الشرق الأوسط 28 سبتمبر 2006

16-اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء بالمملكة العربية السعودية، الشيخ عبد العزيز بن باز- الشيخ عبد العزيز آل الشيخ- الشيخ د. صالح بن فوزان الفوزان فتوي رقم 19402 عام 1993.

17-اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والأفتاء بالسعودية. عبد العزيز بن عبد الله آل الشيخ- عبد الله بن عبد الرحمن الغديان – بكر عبد الله أبو زيد- صالح بن فوزان الفوزان، فتوي رقم 21413 لعام 1996

18-انظر ابن تيمية " الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح" وهو الكتاب الملئ بألهجوم السافر على المسيحية .

19-أنظر د. عبد الحليم محمود: الإيمان بالله.

20-المستشار محمد سعيد العشماوي: فتوى ومقال، جريدة الأهالي 10 أبريل 1996

21-يوسف القرضاوي: الشريعة والحياة قناة الجزيرة، تصريحات بابا الفاتيكان تجاه الإسلام، 17 سبتمبر 2006

22- قناة الجزيرة، 10 أبريل 2006

23-قناة اقرأ، 2 أبريل 2006

24-جريدة الأهرام، 22 يوليو 2002

25-جريدة الأهرام، 15 يوليو 2002

26-جريدة الأهرام،1 يناير 2002

27-خالد مشعل في خطبة الجمعة في جامع المرابط بدمشق 3 فبراير 2006

28-قناة الجزيرة، الشريعة والحياة، 16 مايو 2004

29-قناة الجزيرة، 25 فبراير 2006

30-قناة اقرأ ،12 مارس 2006

31-قناة الجزيرة، 6 فبراير 2005

32-قناة الجزيرة ،12 مارس 2006

33-قناة الجزيرة 11، سبتمبر 2006

34-قناة المنار، 8 أبريل 2004

35-قناة العالم ،14 مايو 2006

36-قناة الجزيرة ،30 يوليو 2006

37-عبد الصبور شاهين، قناة الناس، 10 يوليو 2006

38-دائرة المعارف الإسلامية الجزء (11) ص 3245

39-نبيل عبد الملك ،" هل المسلمون قادرون على الحوار مع الآخر" ، موقع إيلاف 3 اكتوبر 2006 ويمكن الوصول للموقع الالكتروني لوزارة الاوقاف المصرية عبر هذا الرابط

http://www.islamic-council.com/non-muslims_u/Chapter3.asp

40- بسام درويش ،" اطباء المستقبل" ، موقع الناقد

41-محمد نزال، قناة العربية، 28 يوليو 2006

42-نيو تي في، برنامج "بلا رقيب" ماريا معلوف 31 مايو 2006

43- *Daniel Pipes:New York Post ,Dec.,31,2002*

44- العفيف الاخضر: كيف نصالح الإسلام مع العالم؟،شفاف الشرق الأوسط، 23 مارس 2006

45-أحمد البغدادي: السياسة الكويتية، 9 سبتمبر 2009

46-محاضرة

# پەیوەندی نێوان خەڵك و فەلسەفە

ویلاردون کواین

لە فارسییەوە: هاوار ئەحمەد

ئەو شتەی بە فەلسەفە ناوی دەبەن چییە؟ پرۆفیسۆر – ئادلەر– بڕوای وایە کە فەلسەفە لە نیوەی سەدەی رابووردوەوە بە شێوەیەکی بنەڕەتی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. چیدی فەلسەفە لەگەڵ خەڵکی ئاسایی نادویّ و رووبەرووی ئەو کێشە و بابەتانە نابێتەوە کە سوودی مرۆڤایەتی تێدایە. فەلسەفە چییە؟ ئایا فەلسەفە شتێکی دیاریکراوە کە تووشی ئەم گۆڕانە هاتووە؟ یان خودی وشەی – فەلسەفە – بەرگێکی دیکەی پۆشیوە، پێشتر بە شتێك دەوترا و ئێستا بە شتێکی دی؟ لە ڕاستیدا ئادلەر خۆی سەرقاڵی کارێکی بیّ بایەخی واتاناسی وشەیەکی سیّ بڕگەیی نەکردوە، ئیتر ئەم وشەیە چەندە باق و بریقەداریش بێت. ئەو دەڵێت کە فەلسەفە سەرەڕای ئەو گۆڕانانەنیش کە بەداخەوە بەسەری هاتووە، لەڕاستیدا بە جۆرێك لە جۆرەکان هەمان بابەتەکانی پێشوە. رەنگە ئادلەر بۆ پیشاندانی ئەم مەسەلەیە، پەیوەست بوونی مێژووی گۆڕاوی ئەم بابەتە بهێنێتەوە. بەلاّم پەیوەست بوون خەسڵەتێکی وەك گواستنەوەی مانایی وشەیەکی سیّ بڕگەیشە. رەنگە بارودۆخمان لە هەڵسەنگاندنی ئەم بوارە گۆڕاوە باشتر بێت ئەگەر لە باتی ئەم کارە تەماشای ئەو چالاکی و هەوڵە راستەقینەیەی کۆن و نویّ، ئاسان تێگەیشتن یان تەمومژاوی، کاریگەر یان بێهودە بکەین و پاشان ریّ بە خۆمان بدەین وشەی "فەلسەفە" لە جێگای شیاوی خۆیدا دابنێین.

ئەرەستۆ سەرەڕای شتەکانی دی، پسپۆڕی فیزیا و سروشت ناسێکی پێشڕەوییش بوو، ئەگەر جیهان ناسی باڵی تیوری فیزیا بێت، ئەفلاتوون بێجگە لە شتگەلێکی دیکە پسپۆڕێکی فیزیایش بوو. دیکارت و لایب نیتس–یش پسپۆڕی فیزیا بوون. ئەو سەردەمە سروشت ناسی و فیزیا، ناوی –فەلسەفە– بوو. ئەم لقانە تا سەدەی نۆزدەش ناویان فەلسەفەی

سروشتی بوو. ئەفلاتون، دیکارت و لایب نیتس زانای ماتماتیکیش بوون!، لاك، بارکلی، هیوّم و کانت بە زۆری دەروونناس بوون. هەموو ئەم ئەستێرە درەوشاوانە و ئەوانەی دیکەش کە ئێمە وەك فەیلەسوف ڕێزمان هەیە بۆیان، زاناگەلێك بوون بەدوای تێگەیشتنێکی سیستماتیکانە لە ڕاستی. لە ڕاستی گەڕانەکەیان دەگەیشتە ئەودیوی زانستە – ووردبینەکان– بەپێی پێناسەی ئەمڕۆ، چەمکگەلێکی بنچینەییتر و بەرفراوانتر هەبوون کە دەبا روونكاك ببنەوە و گرێکانیان کرابایەتەوە. بەلاّم لە پێوەری گەورەدا، تێهەلّچون لەگەلّ ئەم چەمکانە و گەڕان بە دوای سیستەمێکدا، هێشتا پارچە بوو لەگەلّ گشت چالاکیە زانستیەکاندا. دەسکەوتە تیۆری تر و گشتی ترەکانی تیورەیەك، ئەو شتەیە کە ئێمە ئەمڕۆ کە بەشێوەیەکی جیاکراوە ناوی لیّ دەنێین فەلسەفە. بیّ لەمەش ئەو شتەی کە ئێمە ئەمڕۆکە لە ژێر ناوی فەلسەفەدا بە دوایەوەین، کاتێکە بە بۆچوونی من لە لوتکەی تەکنیکی خۆیدا بێت، زۆرێك لەم تایبەتمەندییانەی تێدایە.

تا سەدەی نۆزدە هزرێکی پلەیەك بە تەنها دەیتوانی گشت ناسینە زانستیەکان لە هەر بوارێکدا بێت، بخوێنێت. ئەم بارودۆخە رێکوپێکە بە بەرفراوانبوون و قولّبوونەوەی زانست کۆتایی پێهات. جیاوازییە وردەکان جێی خۆیان لەم جەنجالّەدا کردەوەو و زاراوەگەلێکی ناتەبای هونەری لە هەموو سوچێکەوە سەریان هەلّدا، کە هەلّبەت زوربەیان بەڕاستی پێویست بوون. مەسەلەکانی فیزیا، میکرۆبیۆلۆژی، ماتماتیك دابەش بوون بەسەر بابەتگەلێکی –فەرعی– تردا و هەر کامێکیان لە دەرەوەی سنوریاندا، لە ڕوانگەی رەمەکی خەلّکەوە یا بیّ واتا بوون یا تێگەیشتن لێیان، زۆر قورس بوو لە بۆیان، تەنها پسپۆڕ تێدەگا کە جێگای ئەم بابەتانە لە دیدێکی گشتیتردا، لە کوێدایە. لەو سەردەمەدا فەلسەفەش لەو شوێنەدا کە پەیوەست بوو بە زانستەوە، پێشکەوت!. پێشکەوتنی فەلسەفە وەك هەر بەشێکی دیکەی زانست، جیاوازی و پەیوەندیگەلێکی خستە ڕوو کە پێشتر لەبیرکرابوون. وەك هەر بەشێکی دیکەی زانست، بابەتەکان شیتەلّ بوون بۆ ئەندامە پێکهێنەرەکانیان. بابەتگەلێك کە ئەگەر بەجیا لێیان وورد دەبووینەوە، دەبا بیّ بایەخ بهاتنایەتە بەرچاو یاخود خراپتر لەوە. رێك سەد سالّ لەمەوبەر لۆژیکی –وێنەیی– ڕنسانس خۆیی کاملّ کردو لە دەستەکانی – گوتلوب فرگە–دا بوونە زانستێکی جدی. لە سالّەکانی باشتردا تایبەتمەندییەکی سەرنج راکێشی فەلسەفەی زانستی، سوود وەرگرتنی ڕوو لە زیاد بوونی ئەم لۆژیکە نوێیە بەتوانایە بوو.

ئەم لۆژیکە لە هەرچی پتر قولّبوونەوەی روانگەکان و روون کردنەوەی بابەت و رێگەچارەکان بەکارهاتووە. هەروەها بە یارمەتی ئەم لۆژیکە، پەیڤ و هێما هونەرییەکان شوێنگەیەکیان بۆ خۆیان بینیوەتەوە و لە هەمانکاتدا کە بە چاکی یارمەتی لێکۆلّەرەوەکانیان دەدا، خوێنەرانی ئاساییان لە –فەلسەفە– بێگانە دەکرد.

لەم قۆناغەدا تایبەتمەندییەکی دیکەی سەرنج ڕاکێش لە فەلسەفەی زانستیدا، گرنگیدانی روو لە زیاد بوون بە سروشتی زمان. ئەم گرنگی دانە وەك خۆبەدوورگرتن نەبووە لەوە بەرباس خستنی بابەتە جیدییەکان.

ئەم بابەتە کاردانەوەی ڕەخنەگرانەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ چەندین سەدە بەر لە ئێستاو بەرهەمە کلاسیکیەکانی ئەزمونگەرا بەریتانیەکان –لاك، بارکلی، هیوم و لە هەموان ئاشکراتر بتنام. لە شەست ساڵی ڕابردوودا ئەم بابەتە بە شێوەیەکی روو لە زیادبوون ناسراوە، کە بۆچوونە ئەبستراکتەکان و دەرونگەراییە سوننەتیەکانی ئێمە لە واتا، هزر، چەمك، چییەتی، گشت بە سیستماتیك نەکراوەکان و پێناسە نەکراوەکان – بنچینەیەکن تەواو سستو نەکراوی پێکهێناوە بۆ تیۆرێك لەمەڕ جیهان. تەنها بە جەخت کردنەوە لەسەر زارەکانو چۆنیەتی فێربوونیان و هەروەها پەیوەندییان بە شتومەکەکانەوە کۆنترۆڵ بەسەر بارودۆخەکەدا دێتە دی. بابەتی زمانی تایبەتمەند، هەرچەندە – ئادلەر – بە شتێکی بێ سود یاخود بێ بایەخ ناوی هێناوە، بابەتێکی گرنگە. لە روانگەی فەلسەفییەوە کاتێك ئەم بابەتە گرنگی پەیدا دەکات کە بۆمان دەردەکەوێت تیۆری واتای باوەڕ پێکراو دەبێ تیۆرێك بێت بۆ لە بار بەکارهێنانی زمان و زمان هونەر و لێهاتووییەکی کۆمەڵایەتیە، شتێکە کە بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی – تەڵقین – کراوە. جەخت کرا بوو بەسەر گرنگی ئەم بابەتە لەلایەن – ڤینگشتاین–ەوە و پێشتریش بەهەمان شێوە لەلایەن –دیوئی–یەوە جەختی لەسەر کرابوویەوە، بەڵام بابەتەکە بۆ هەر کەسێك کە لە دەرەوەی زەمینەکەیەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات، گرنگیەکەی لە دەست دەدات. ئەمە راستە کە زۆرێك لەو نوسینانەی کە لەژێر ناونیشانی فەلسەفەی زماندا دەنوسرێن، هیچ دەرەنجامێکی فەلسەفی تێدا نییە. هەندێك نوسین کە لە روانگەی خوێندنەوەی زمانەوە سەرنج راکێشن، یاخود تارادەیەك سەرنج راکێشن – تەنها بەهۆی پەیوەندییەکی لاوازەوە – لە نێوان فەلسەفە و زمانناسیدا – خۆیان کردووە بە نێو گۆڤارە فەلسەفیەکاندا. هەندێك لەوانە کە بانگەشەی ناواخنێکی – ناوەرۆك – زیاتری فەلسەفی دەکەن، لە ڕاستیدا شایانی تێڕوانین نین. چونکە کۆنترۆڵکردنی چۆنیەتی، لە بڵاوکراوە فەلسەفیە تازە سەرهەڵداوەکاندا، لاوازە. فەلسەفە ماوەیەکی دوور و درێژە لە ژێر عەزابدا بووە لە مەڕ جیاوازی ئەوەی کە چ بابەتگەلێك شایانی تێڕوانین و گرنگی پێدانن، ئەو عەزابەی کە زانستە پەتیەکان نەیانچەشتووە. قوتابیانی فەلەکناسی دەشێ بکرێنە دوو بەش – ئەستێرە ناسان، بەخت گرەوەکان، بەو ئاسانیەی کە دەشێ ئاژەڵە ماڵییە بچووکەکان بکرێن بە دوو بەشەوە – مەڕ، بزن. بەڵام لەوانەیە دابەشکردنی فەیلەسوفەکان بە دوو دەستەی – "ناخ خوێنەران" و بێ شکۆکان بەو ئاسانیە نەبێت. ئەم بابەتە لەوانەیە بەهۆی خودی سیستماتیك نەبوون و بێ تەرتیب بوونەوەو هەروەها تایبەتمەندی ئەبستراکت و تیۆرییەوە بێت.

پەرەپێدان و فراوانکردنەوەی زۆرێك لە بابەتە تەمومژاوییەکانی فیزیا، دەکرێ زۆرینەی

خەڵکی لێتێگەیەنرێ. من لە مەڕ ئەم بابەتە خۆشحاڵم، چونکە بەهرەیەکم هەیە لە بواری فیزیادا و هەر چەندەش ناتوانم بێ بنێمە نێو ئەو رێچکەیەوە. فەیلەسوفێکی باشگەر تەفسیرکارێکی باشیش بێت، لەوانەیە بتوانێت ئەم کارەش لەبۆ فەلسەفەی هونەری باو ئەنجام بدات. ئەم کارە هونەرمەندی دەوێت، چونکە بەشێوەیەکی لەسەدا سەد ئەو شتەی کە لە روانگەی فەلسەفییەوە گرنگە، – تەنانەت گەر بە روونیش شیکار بکرێت و لە جێی خۆیدا بخرێتە بەر باس نابێتە جێی رەزامەندی زۆرینەی تاکەکان. من بیر لە بابەتە کیمیاییەکان دەکەمەوە، هەست بە گرنگیەکەی دەکەم، بەلاّم بەدواداچونێکی ووردبینانەم نییە لە بۆی، هەر بەو شێوەیەی کە هۆکارێك بەدی ناکەم لە بۆ ئەوەی زۆرینەی خەڵکی بەشێوەیەکی سەپێنراو گرنگی بدەنە مەیلە فەلسەفییەکانی من. ئەگەر لە بری بانگهێشت کرانم لە بۆ زنجیرەی تەلەفزیۆنی "رابەرانی هزر" لە $T.V$ بەریتانیا راوێژیان بکردایا لەگەڵ من، لەمەڕ سودمەندبوونی، گومانی خۆمم دەردەبڕی. ئەو شتەی کە لە ژێر ناوی فەلسەفەدا باسم لێوە کردووە، ئەو شتەیە کە من ناوم لێناوە فەلسەفەی زانستی، کۆن یاخود نوێ، ئەم هەمان ئەو سیستەمەیە کە – ئادلەر– گازندە و رەخنەی هەیە لە رەوتی ئەم رۆژانەی دوایی. (هەڵبەت) بەم ناونیشانە تەمومژاوییەوە، من خوێندنەوە فەلسەفیەکانی بواری بەها ئەخلاقی و جوانیناسییەکاندا رەت ناکەمەوە. هەندێ لەم خوێندنەوانە بە قاڵبێکی شیکارییەوە دەتوانن خاوەن رۆحێکی زانستی بن. (لە نێو وەها قاڵبگەلێکدا) ئەم خوێندنەوانە دەتوانن شتێکی کەم، هەلێکی ئیلهامبەخش و ئاسوودەیی بەخش، پێشکەش بکەن. ئەو قوتابیانەی کە قۆناغی –ماجستێر–ی فەلسەفە پتر لە بۆ بەدیهێنانی ئارامی دەخوێنن گومرا دەبن و لە هەر حاڵەتێکدا بۆی هەیە قوتابیانێکی زۆر باش نەبن، چونکە بزوێنەرەکەیان بەدواداچونێکی وردبینانەی عەقلاّنی نیە. ئەو نوسینانەی کە دەبنە هۆی هەڵچون و پاڵپشتی کارن، جێگەی ستایشن، بەلاّم شوێنیان لە نێو – رۆمان، هۆنراوە، گوتاربێژی و ووتارە ئەدەبیەکاندایە. فەیلەسوفەکان – بە واتای پیشەیی ووشەکە – لە بار نین لە بۆ وەها کارێك. لە هەمان کاتدا فەیلەسوفەکان دەسەلاّتێکی تایبەتیان نیە بۆ ئەوەی یارمەتی کۆمەڵگا بدەن کە هاوسەنگی خۆیان بپارێزن، هەرچەندە هەمووومان دەبێ هەموو ئەو شتەی کە لە تواناماندایە ئەنجامی بدەین. ئەو شتەی کە پێویستیە هەمیشەییەکان ئامادە دەکات هزرە: بەڵێ حیکمەت – *Sophia*– نەك بەشێوەیەکی سەپێنراو فەلسەفە – *philosophia*.

**سەرچاوە:**

کتاب ماه ادبیات و فلسفه – خرداد و تیر 1381.

# ڕیشە بەرایی‌و بنەڕەتییەکانی دیموکراسی

مەڵڤین. ئای. یورۆفسکی (Melvin. I. Urofsky)[1]
لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

**(تا دەوڵەتی خەڵك، لەلایەن خەڵك‌و لەپێناو خەڵكدا، لە مەیدانی ڕۆژگاردا نەسڕدرێتەوە)**
**-پریزدێنت ئەبراهام لینکۆڵن**
**وتاردانی گتیسبۆرگ** 1863

پریزدێنت لینکۆڵن لەماوەی یەکێك لە جەنگە ترسناکەکانی ناوخۆدا کە بۆ پاراستنی ولاتەیەکگرتووەکان لەئارادا بوو، لەکۆتایی وتاردانێکی بەناوبانگی خۆیدا بۆ تەرخانکردنی گۆڕستانێکی میللی لە (*Gyttysburg*) ڕەنگە ناسراوترین پێناسی دیموکراسی لە مێژووی ئەمریکادا بداتە دەست. مەبەستی ئەو لە (دەوڵەتی خەڵك‌و لەلایەن خەڵك‌و لەپێناو خەڵکدا) ئەوە بوو کە ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی دەوڵەتێکی دیموکرات کە ئەو هێندە جوان خستییەڕوو، بۆ هەموو ئەو میللەتانە دەگونجێت کە ئارەزوومەندی بن.

دیموکراسی دژوارەو دەوڵەتی دیموکراسی ڕەنگە ئاڵۆزترین‌و کێشەدارترین فۆرمی دەوڵەتان بێت. کاروباری ئەم دەوڵەتە لێوانلێوە لە قەیرانەکان‌و دژیەکییەکان‌و پابەندە بەئەوەی کە ئەندامەکانی بەجدی‌و سەرسەختییەوە بەرەوپێشەوەی بەرن.

دیموکراسی بۆ دەرەنجامەکانی نەخراوەتەڕوو بەڵکو بۆ وەلامدانەوەیە. دەوڵەتێکی ئازاد لەوانەیە نەتوانێ بەهەمان خێرایی دەوڵەتێکی ستەمکارەوە کاربکات، بەلام کاتێ کە لەپرۆسەی کاری خۆیدا بەڵێنی دا، دەتوانێ سود لە سەرچاوەکانی جۆششی پشتگیریی گشتییەوە وەربگرێت. بەدڵنیاییەوە دیموکراسی لە فۆرمە ئەمریکاییەکەی خۆیدا، هەرگیز بەرهەمێکی کامڵ نییە، بەڵکو هەمیشە لە حاڵەتی پەرەسەندن‌و گەشەکردندایە. سیمای

دەرەکــی دەوڵــەت لــە وڵاتەیــەکگرتووەکانی ئەمریکا بەدرێـژایی دوو سەدە گۆڕانێکی کەمی بەخۆوەبینیوە، بەڵام ئەگەر واز لە نۆڕینی سادە بێنین و بگەینە قوڵی، گۆڕانێکی قوڵ دەبینین. لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆرینـەی ئەمریکاییـەکان لـەم بڕوایــەدان –و ڕاستیــشە– کــە ئــەو بنــەما بنەڕەتییــەی کــە ژێرخــانی دەوڵەتەکــەیان پێکـدەهێنێت، ڕاسـتەوخۆ لەچـەمکگەلێکەوە سەرچـاوە دەگرێـت کـە لەسـەرەتادا لەلایـەن ئامادەکـارانی دەسـتورەوە لەسـاڵی (1787) ڕۆشن کرایەوە.

لـەم لاپەڕانـەدا، هـەوڵمان داوە هەنـدێ لـەم بنەمایانە ڕوون بکەینەوەو پوختەیەك لە زەمینـە مێژووییەکانی پەیدابوونیان بخەینەڕوو و ئەوە ڕوون بکەینەوە کە بۆچی ئەوانە بۆ میکانیزمی کــارکردنی دەوڵــەتی وڵاتەیــەکگرتووەکانی ئــەمریکا بەتایبــەتی و بــۆ دیموکراســی بەشێوەیەکی گـشتی گـرنگن. لەبەرئـەوەی هـەر دیموکراسـییەك سیـستەمێکە لـە گەشـەکردن و پەرەسەندندایە، هـەروەها لـەم لاپەڕانەدا هەندێ لــە کــرچ و کاڵییــەکانی سیـستەمی دەوڵــەتی وڵاتەیـەکگرتووەکانیان خـستۆتەڕوو و ڕوونـی دەکەینـەوە کـە چـۆن میللـەتی ئـەمریکا هـەوڵی داوە لەگەڵ ئەم مەسەلانەدا ڕووبەڕوو ببێتـەوە. هیچ کەسێ بانگەشەی ئەوە ناکات کە مۆدیلی دیموکراسـی ئـەمریکا بەهەمانـشێوەی کـە بـۆ وڵاتەیـەکگرتووەکان هێنــدە ســەرکەوتووبووە، هـەمان مۆدیلیـشە کـە هـەموو دیموکراسییەکان پێویــستە پــەیڕەوی لێبکــەن. هــەر میللــەتێك پێویستە دەوڵەتەکەی لەسەر بنەمای داخوازییە کلتــوریی و مێژووییــەکانی خــۆی ئۆرگــانیزە بکـات، بـەڵام ئامـانج لـەم وتارانـە ناسـینی ئـەو بنــەما بنــەڕەتی و بناغەییانەیــە کــە بەچەشــنی جۆراوجـــــۆر، پێویـــــستە لـــــە هـــــەموو دیموکراســـییەکاندا هـــەبن. بۆنمونـــە دەکـــرێ شێوازی وردی داڕشتنی یاساکان، بەشێوەیەکی بـەرفراوان جیـاواز بن، بـەڵام بـەبێ بایەخدان بە فـۆرم و چەشـنەکەیان، سـەرجەمیان پێویـستە شــوێنکەوتەی ئــەم بنــەما ڕیــشەییە بــن کــە هاوڵاتیـان دەبـێ دەسـتوەردانیان لـە پرۆسـەی کــاردا هــەبێت و هەســت بکــەن کــە خــاوەنی ئەم یاسایانەن.

ئــەم دەکــرێ ڕیــشەییانە کامانــەن؟ ئێمــە (11)یانزدە بنچینەمان ناساندووە کە بـەبڕوای ئێمـە کلیلـە گرنگـەکانی ئـەم بابەتـەن کـە لـە وڵاتەیـەکگرتووەکان چۆن دیموکراسـی گەشـەی کردووەو کاردەکات.

***پەیڕەویی لە دەستور:**

یاسـادانان پێویـستە لەچوارچێوەیەکداو بـە پەیڕەویکردن لە بارۆمەترێکی دیاریکراو ئەنجام بدرێت، دەبـێ ڕێبازگـەلێکی بڕیارلەسـەردراو بـۆ داڕشتن و گـۆڕینی یاسـاکان هـەبێت، و لەهەنـدێ لە بوارەکانـدا –واتا لەوشوێنانەی کە پەیوەنـدی بە مـافی تاکەکەسـەوە هەیـە– پێویـستە دوور لـە هـەواو هەوەسـی یاسـای زۆرینـە بێـت. دەسـتور، خـۆی یاسـایەکە بـەڵام لـە هەمانکاتـدا زۆر لـەو زیـاترە. گەڵاڵەنامــەی ژیاریانــەی دەوڵەتــە کــە لەســەر بنــەماکانی هێــزو لقــە جیاوازەکــانی و بەهەمانـشێوە سـنوری دەسـەڵاتەکانی دەوڵـەتی بنیـات نـاوە. یـەکێك لـە خەسـڵەتە کلیلییـەکانی هــەبوونی دەسـتور ئەوەیــە کــە ئــەم چوارچێوە

بنەڕەتی و ڕیشەییە ناتوانرێ بەهۆی ئارەزوو و هەوەسی زۆرینەیەکی کاتییەوە بەئاسانی بگۆڕدرێت. ئەم کارە پێویستی بە ڕەزامەندی تاکەکەسیانەیە کە بەشێوەیەکی ڕوون و نائالۆز بخرێتەڕوو.

لەساڵی (1787) لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەستور (27)جار ریفۆرمی قبوڵ کردووە. داڕێژەرانی دەستور پرۆسەی ئەم ریفۆرمکردنانەیان کردە گرفت، بەلام ناموممکینیشیان نەکرد. زۆرینەی ریفۆرمە دیموکراسییەکان لەرێگەی بەرفراوانبوونی ئازادییەکانی تاکەکەس و لابردنی جیاوازییە نەژادییەکان یا رەگەزییەکانەوە گەشەی پێبەخشراوە. هیچکام لەم ریفۆرمانە بەئاسانی قبوڵ نەکراوە، بەلام کاتێک کە دانراوە پشتیوانی زۆرینەی مەزنی خەڵکی هەبووە.

*هەڵبژاردنی ئازاد:

بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە دەوڵەتێك تا چ ئەندازەیەك بە باشی خراوەتەڕوو، ناتوانرێ بە دەوڵەتێکی ئازاد هەژمار بکرێت، مەگەر ئەو بەرپرسانەی کە لە لوتکەی ئەودان لەلایەن هاولاتیانەوە بەئازادانەو ئاشکرایانە هەڵبژێردرابن. شێوازی کارو میکانیزمی هەر هەڵبژاردنێك لەوانەیە لە ئەویتر جیاواز بێت، بەلام بنەما بنەڕەتییەکەی بۆ هەموو کۆمەڵگا ئازادەکان یەکسانن: دەستراگەیشتنی هەموو ئەو هاولاتیانەی کە مەرجی دەنگدانیان تێدایە، پارێزگاریی لە تاکەکان لە هەمبەر پیادەکردنی گوشار بۆ دەنگدان، ژمێرەکردنی ئاشکراو ڕاستگۆیانەی دەنگەکان. لەبەرئەوەی وەرگرتنی دەنگ لەسەر ئاستێکی بەرفراوان هەمیشە لەبەردەم بەهەڵەداچوون و تەزویردایە، تا ئەو شوێنەی کە لە تواناداییە دەبێ بۆ خۆپاراستن وردەکاریی تیادا بکرێت، تا ئەگەر مەسەلەیەك هەبوو یان دەرەنجامەکانی هەڵبژاردنە زۆر گرنگەکان نزیك بوو (بەهەمانشێوەی کە لە هەڵبژاردنی ساڵی 2000ی ولاتەیەکگرتووەکان ڕووی دا) خەڵك سەرنج لەوە بدەن کە لەگەڵ بوونی کێشەکاندا، هێشتا دەبێ دەرەنجامەکان پەسەند بکرێت و پێوەی پابەند بن.

*حکومەتی فیدراڵ، دەوڵەتە هەرێمی و ناوچەییەکان:

ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سیستەمی فیدراڵی دەوڵەتەکەی خۆیدا تایبەتە، لەم سیستەمەدا هێزو چانسی هەڵبژاردن لە نێوان دەوڵەتی میللی و دەوڵەتە هەرێمی و ناوچەییەکاندا دابەش بووەو پراکتیزە دەکرێت بەلام ئەگەر ئەم مۆدیلە بۆ میللەتێکی تر گونجاو نەبێت، هێشتاش کۆمەڵە وانەیەك هەن کە دەتوانرێ لێی وەربگیردرێن. هەتا دەوڵەت لە خەڵك دوورتر بێت، کاریگەرییەکەی کەمترەو کەمتر جێگەی متمانەیە. لەگەڵ هەبوونی دەوڵەتە هەرێمی و ناوچەییەکاندا، ئەمریکییەکان دەتوانن لەنزیکەوە چاودێریی هەندێ لە بەرپرسە هەڵبژاردەکانی خۆیان بکەن. ئەوان دەتوانن ئەو سیاسەت و بەرنامانەی ڕاستەوخۆ بەو پیاو و ژنانەی دایانڕشتووەو بە ئەوانەی کە پراکتیزەی دەکەن، ببەستنەوە. سەرەڕای ئەوە، چڕبوونەوەی تواناکان،

بەدەستەوەگرتنی نایاساییانەو داگیرکردنی هێزەکانی دەوڵەت زۆر دژوارتر دەکات.

لەسەر بنەمای ئەو بنەمایەی کە دیموکراسییەکان دەبێ هێزەکانو بەرپرسیارێتییەکان ناسێنترالّ بکەن، لەوانەیە لە وڵاتێکی بچوکو تاڕادەیەك وەکیەکدا زۆر گرنگی نەبێت، بەڵام لە وڵاتێکی بەرفراوانی خاوەن گروپو نەتەوە ناهەمەچەشنەکاندا، بەئامرازێکی پارێزەرانەی گرنگ هەژمار دەکرێت.

*داڕشتنی یاسا:

مێژوو نیشانی دەدات کە مرۆڤ بەدرێژایی (5) هەزارساڵ، یاساگەلێکی فەرمی داڕشتووە، بەڵام ئەو ڕێبازانەی کە لەڕێگەیەوە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان ئەم یاسایانەیان لێیەوە بەرهەمهێناوە، کۆمەڵە جیاوازییەکی قوڵیان لەگەڵ یەکتردا هەبووەو لە بڕیارەکانی (خوداوەند- شا)ەوە بگرە تا ڕای زۆرینە لە میتینگە گوندییەکاندا لەخۆدەگرێت.

لە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، یاسا لەسەر ئاستە بەرفراوانەکان دادەڕێژرێت، لە ئەنجومەنە لۆکاڵییەکانی شارۆچکەکانەوە بگرە تا یاسادانەرە هەرێمییەکان تا کۆنگریسی وڵاتەیەکگرتووەکان، بەڵام لە هەموو ئەم ئاستانەدا، هاوڵاتیان چ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو چ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، کاریگەریان هەبووەو بەشێوازێکی بەرفراوان پشکیان لە فۆرمەڵەکردنیاندا هەبووە.

هەڵسوڕاوانی ناوەندەکانی یاسادانان، ئەوەیان دەستنیشان کردووە کە ئەوان لەهەمبەر هاوڵاتیانی خۆیاندا بەرپرسیار بوونو ئەگەر باشترین کۆمەڵەیاسا لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خەڵکدا نەهێننەئارا، لە هەڵبژاردنی ئایندەدا شکست دەخۆن.

کلیلی داڕشتنی یاسا لەچوارچێوەی دیموکراسیدا، شێوازی کار یا تەنانەت شوێنی ئەنجامدانەکەی نییە، بەڵکو بەرپرسیارییە لەبەردەم هاوڵاتیاندا، زەروورەتی دەستنیشانکردنی حەزو پێداویستییەکانی خەڵکی کە شیاوی بایەخە.

دەسەڵاتێکی دادوەریی سەربەخۆ:

(ئەلیکساندەر هامیلتۆن) لە (فیدراڵیست)دا لە ساڵانی (1788-1789) وەبیری هێنایەوە کە ئەو دادگایانەی لە دەسەڵاتی هەڵقوڵاوی شمێشێر یا گیرفانی پارە خاڵی بن، ئەوا کەم مەترسیدارترین لقی دەوڵەت دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا دادگاکان دەتوانن لەحکومەتێکی ئازادانەدا زۆر بەهێز بن، و لەزۆرینەی ڕووەکانەوە دادگا ئەو هەرەمە جێبەجێکارەیە کە لە ڕێگەیەوە مادده ئاڵۆزەکانی دەستور شرۆڤە کراوەو پراکتیزە دەکرێت. لە وڵاتەیەکگرتووەکان، دادگاکان دەتوانن یاساکانی کۆنگرێس یا بڕیارەکانی هەرێمەکان لەبەرئەوەی کە لەگەڵ دەستوردا ناکۆکە، بەپوچەڵی بزانن‌و تەنانەت کارەکانی سەرۆك کۆماریش هەر لەبەر هەمان هۆ، دووچاری هەمان چارەنوس ببێتەوە. لەوڵاتە یەکگرتووەکاندا سیستەمی دادگا گەورەترین داکۆکیکاری مافەکانی تاکەکانە. ئەمەش لەمرووەوە شیاوی بەدیهاتنە کە زۆرینەی

دادوەرەکان تا دواساتی ژیانیان بەرپرسی کاری خۆیـانن و دەتـوانن بـەدەر لـە کێشمەکێـشمە سیاسـییەکان، سـەرنجی خۆیـان ئاراسـتەی مەسەلە یاساییەکان بکەن. لەکاتێکدا کە هەموو دادگاکـانی دەسـتور یەکـسان نـین، پێویـستە ناوەنـدێك هـەبێت ئـەوە دەستنیشان بکـات کـە دەسـتور چـی دەڵێـت و لـە چ کاتێکـدا لقـە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت لە دەسەڵاتی یاسایی خۆیان تێپەڕاندووە.

***دەسەڵاتەکانی سەرۆك کۆمار:**

هـەموو کۆمـەڵگا مۆدێرنـەکان پێویـستە خـاوەنی سـەرۆکێکی پراکتیزەکـار بێـت کـە بتوانـێ بەرپرسـیارێتییەکانی دەوڵـەت لـە بـەڕێوەبردنێکی سـادەی بەرنامەیەکـەوە تـا ڕێنمـاکردنی هێزەچەکدارەکان بـۆ بـەرگریی لـە وڵاتەکـە، لـەکاتی جەنگـدا ئـەنجام بـدات. بـەڵام پێویـستە هێڵێکـی زیرەکانـە لـەنێوان تـەرخانکردنی هێـزی تـەواو بـۆ ئەنجامـدانی کارەکەو لە هەمانکاتدا بۆ سنورداركردنی ئەو هەڵبژاردنـە لـەپێناو ڕێگـەگرتن لـە دیکتـاتۆریی بکێشرێت.

لـە وڵاتەیـەکگرتووەکان، دەسـتور کۆمەڵـە هێڵێکـی ڕۆشـنی لەهەمبـەر دەسـەڵاتەکانی سـەرۆك کۆمـار کێـشاوەو لەهەمانکاتـدا نوسینگەکەی ئـەو یەکێکـە لـە دەسـەڵاتدارترین ناوەنـدەکان لەجیهانـدا. دەسـەڵاتەکەی لـە ڕەزامەندێتی خەڵك و تواناکانی ئەو کەسەی لە کۆشکی سپی دانیشتووە واتا سەرۆك کۆمار، بـە بـاش کـارکردنی لەگـەڵ لقـەکانی تـری دەوڵەتـەوە سەرچـاوە دەگرێـت. لێرەشـدا، ڕێکخراو و ستراکتوری ڕاستەقینەی نوسینگەی سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لەئارادا نییە، بـەڵکو ئـەو فـشارو سـنورداركردنانەی لـە ڕێگەیـەکی پرەنسیپیانەی وەك:"جیاکردنـەوەی دەسـەڵاتەکان" بەسـەر ئـەو نوسـینگەیەدا سەپێنراوە.

لـە دیموکراسـیدا، سـەرۆك کۆمـار پێویـستە لەڕێگـەی بـەکارهێنانی لێهاتوویـی سیاسـییەکانی خۆیـەوە چوارچـێوەیەك بـۆ هاریکـاریی لەگـەڵ دەسـەڵاتی دادوەریـی و لەهـەمووی بـاڵاتریش لەگـەڵ خەڵکـدا بهێنێتـەئاراوە. لەهەمانکاتـدا هـەموو هاوڵاتیـان پێویـستە دڵنیـا بـن کـە سـنورداریێتییەکانی دەستور، گرەنتی ئەوە دەکات کە سەرۆك کۆمار یا سـەرۆك وەزیـران خزمەتگوزاری خـەڵکن، نـەك ئاغایان بن.

*ڕۆڵـی چـاپەمەنی ئـازاد: مـافی خـەڵك بـۆ ئاگـاداربوون لـەکاروبار، پەیوەندییـەکی زۆر نزیکی لەگەڵ ماس میدیای ئازاد (ڕۆژنامەکان، تـۆڕە ڕادیـۆیی و تەلەفزیۆنییـەکان)دا هەیـە کـە بتوانن میکانیزمی کارکردنی دەوڵەت بخەنەژێر لێکۆڵینـەوەوەو بـێ تـرس ئەنجامـەکانی بەدواداچوون و تۆمەتەکان بخەنەڕوو.

یاسـای عـورفی بـەریتانیا هـەر جـۆرە ڕەخنەیەك لە پادشا (بەمانا فراوانەکەی یاسای هەموو دەوڵەتەکە) وەك تۆمەتێکی ئاژاوەگێڕیی بـەتاوان هـەژمار دەکـات. وڵاتەیـەکگرتووەکان سەرەنجام ئەم تاوانەی ڕاوەستاند و لەبری ئەوە، تیـۆرێکی بـۆ چاپەمەنی دەستنیشان کـرد کـە توانیویـەتی بەباشـی خزمـەت بەدیموکراسـی بکات. لەباروۆخێکی ئاڵۆزدا، لەوانەیە خودی

هاوڵاتییەك نەتوانێ واز لە كاری خۆی بهێنێت بۆ تەماشاكردنی دادگایی كردنەكان، دانیشتن لە كۆبوونەوەكانی یاسادانان یا باسوخواسەكان، یا لێكۆڵینەوەو بەدواداچوون بۆ شێوازی كاری دەوڵەت، بەڵام چاپەمەنی ڕۆڵی ئەلتەرناتیڤی هاوڵاتیان دەگرێتەئەستۆو لەڕێگەی ماس میدیاو نوسینەكانو هەروەها لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوە زانیارییە بەدەستهاتووەكانی خۆی دەخاتەڕوو، بەمپێیە ئەم هاوڵاتیانە دەتوانن لەسەر بنەمای ئەو زانیاریانە كاربكەن.

لە حكومەتێكی جەماوەریدا، بۆ گەڕان بەدوای گەندەڵیو نیشاندانی جێبەجێ نەكردنی دادپەروەریی لە میكانیزمی كاركردنی ناتەواو و ناكاریگەرانەی ناوەندی دەوڵەت، خەڵك پشت بە چاپەمەنی دەبەستن. هیچ وڵاتێك ناتوانێ بەبێ چاپەمەنی ئازاد سود لە بەخششی ئازادی وەربگرێتو یەكێك لە نیشانەكانی هەر حكومەتێكی ستەمكار، بێدەنگكردنی ماس میدیایە.

***ڕۆڵی گروپە بەرژەوەند تایبەتەكان:**

لەسەدەی هەژدەهەمو لەڕاستیدا بەزۆریی لە سەدەی نۆزدەهەمدا، یاسادانان بەگشتی پێناسی دیالۆگ یا گفتوگۆیەك بوو لەنێوان دەنگدەرانو نوێنەرە هەڵبژێردراوەكانیاندا لە كۆنگرە یاخود دەوڵەتە هەرێمیو ناوچەییەكاندا. لەبەرئەوەی دانیشتوانی كەمتر، بەرنامەكانی دەوڵەتی سنوردارترو پەیوەندییەكانیشی سادەتر كردبوو، پێویستی بەوە نەبوو كە هاوڵاتیان بۆ یاریدەدانی خستنەڕووی دیدگاكانی خۆیان پلەبەپلە سەردانی ڕێكخراوە پەیوەندیدارەكان بكەن. بەڵام لەسەدەی بیستەمدا كۆمەڵگا ئاڵۆزتر بوو و ڕۆڵی دەوڵەتیش بەرفراوان بوو.

هەنوكە زۆر مەسەلە هەن كە دەنگدەران دەیانەوێ ڕا دەربارەی دەرببڕنو بۆ ئەوەی خەڵكانیتریش لە بیروباوەڕەكانیان ئاگادار بكەنەوە، هاوڵاتیان گروپە پروپاگەندەییە پارلەمانییەكانیان هێناوەتە ئارا كە بەرگریی لە بەرژەوەندییە گشتیو تایبەتییەكان دەكەن، و هەروەها ڕێكخراوە نادەوڵەتییەكانیش (*NGO*) كە خۆیان بۆ مەسەلەیەكی تایبەت تەرخان كردووە.

ئەم ڕەهەندەی دیموكراسی ئەمریكییەكان، بۆتە ئامانجی ڕەخنەگەلێكی بەرفراوانی ناوخۆیی، هەندێ خەڵك بانگەشەی ئەوە دەكەن كە ئەو بەرژەوەندیانە لەگەڵ دەستەبەركردنی بڕە پارەیەكی زۆردا دەتوانن دەنگی خۆیان باشتر لەوانە بەرز بكەنەوە كە خاوەنی كۆمەڵە سەرچاوەیەكی سنوردارترن.

هەقیقەتێك لەم ڕەخنانەدا حەشاردراوە، بەڵام هەقیقەتی مەسەلەكە ئەمەیە كە سەدان گروپ لەم نێوانەدا هەن كە بەتایبەتی هاریكاریی فێركردنی گشتیو یاسادانانیان دەربارەی مەسەلەكان كردووەو لەم ڕێگەیەوە لەم چەرخە ئاڵۆزەدا یاریدەی زۆربەی هاوڵاتییە سادەكان دەدەن تا تێڕوانینەكانی خۆیان بە یاسادانەران بگەیەنن. لەگەڵ چوونەناو چەرخی ئینتەرنێت، ژمارەی ئەم دەنگانە تەنانەت زۆرتریش بووەو ئەم ڕێكخراوە نادەوڵەتیانە بەشێوازێكی كاریگەرانە یارمەتی پاڵاوتنو

ســــێنتراڵکردن لەســــەر پەیوەندییــــەکانی هاوڵاتیان دەدەن.

*پاراستنی مافی خەڵك بۆ زانین:

تابەرلەم سەدەیە، ئەگەر خەڵك بیانویستایە بـزانن شـێوازی کـاری دەوڵەتەکـەیان چـۆنە، بەگشتی تەنها کارێك کە دەیانکرد ڕۆیشتن بوو بـۆ تـەلاری شـارەوانی یـا ئەنجومـەنی شـارو گـوێگرتن لـە مـشتومڕو دانوسـتانەکان بـەڵام ئـــەمڕۆ ئێمـــە بـــەهۆی وەزارەتەکانـــەوە، سەروکارمان لەگەڵ بارودۆخ و کۆمەڵە بریارێکی بـەرفراوان و ئـاڵۆزدا هەیـە کـە زۆرینـەیان لـە ســـەدان لاپـــەڕە تێدەپـــەڕێت، پرۆسیـــسێکی یاسـادانان تەنانـەت کاتـێ کـە بـۆ خـەڵکیش ڕوون و ئاشـکرا بێـت، هێـشتا لەوانەیـە بـەلای خەڵکێکی زۆرەوە هێندە تێگەیشتنی گران بێت کـــە نـــەزانن بارودۆخەکـــە لەچـــیدایە. لـــە دیموکراسییەکدا، دەوڵەت دەبێ تا ئەو شوێنەی کـە دەتوانـێ شـەفاف بێـت، بەومانایـەی کـە شـــرۆڤەکردنەکان و بڕیاردانـــەکانی دەبـــێ بـــۆ شـــــرۆڤەکردن و لێکۆڵینەوەیـــــەی گــــشتیانە لەبەردەست هەموو خەڵکدا بێت.

ئاشـکرایە نابـێ هـەموو بڕیارەکـانی دەوڵـەت ڕابگەیەنـدرێت، بـەڵام هاوڵاتیـان مـافی خۆیانـە بــــزانن دۆلارەکــــانی داراییەکــــەیان چــــۆن خــــەرج دەکرێــــت، ئایــــا جێبــــەجێکردنی دادپـــەروەریی کامـــڵ و کاریگـــەرە یـــان ئایـــا نوێنـــەرە هەڵبـــژێردراوەکانیان، بەرپرســـیارانە کاردەکەن یاخود نا.

ئـەم مەسـەلەی کـە ئـەم زانیاریانـە چـۆن بەدەســـت دەهێنرێـــت، لـــە دەوڵەتێکـــەوە بـــۆ دەوڵـــەتێکی تـــر جیـــاوازە، بـــەڵام هـــیچ دەوڵـەتێکی دیموکراسـی ناتوانـێ بـە نهێنییـەکی تەواوەتیانە کار بکات.

* پارێزگاری لە مافە مەدەنییەکانی کەمینەکان:

ئەگــەر مەبەســتی ئێمــە لــە (دیموکراســی) حکومەتی زۆرینە بێت، ئەوا یـەکێك لـە مەسـەلە گرنگەکان لە دیموکراسییەکدا ئەو ڕەفتارەیە کە لەگەڵ کەمینەکاندا دەکرێت. مەبەستی ئێمە لە (کەمینە) ئەو کەسانە نییە کە دژ بەحیزبی براوە دەنگیان داوە، بەڵکو ئەوانەیە کە بەهۆی نـەژاد، ئایین یـا نەتـەوەوە، بەشێوازێکی جێگیر لەگـەڵ زۆرینـــەدا جیـــاوازن. لـــە ولاتەیـــەکگرتووەکانی ئـەمریکا، کێشەی گـەورە مەسـەلەی نـەژاد بـوو، ڕزگارکردنی کۆیلە ڕەشپێستەکان دوای جەنگی خوێنـاویی نـاوخۆ هاتـەدی و سـەدەیەکی تـر درێـژەی کێشا، تـاوەکو ڕەشپێستەکان توانیـان ئازادانە سود لـەو مافانـە وەربگـرن کـە دەسـتور پێ ی بەخشی بوون.

مەسـەلەی یەکسـانی نـەژادی کێـشەیەکە کـە تائێـستاش ڕووبـەڕووی ولاتەیـەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆتەوە بەڵام ئەمە بەشێکە لە سروشتی گەشونماکردنی دیموکراسی، پاڵنەرێکە بۆ پتر سەرتاپاگیربوون و چانسێکە بۆ ئەوانەی کە لە زۆرینـە جیـاوازن کـە نـەك تـەنها لـە چاودێریی پـارێزراون، بـەڵکو وەك هاوڵاتییـەکی کامـڵ و یەکسان لەمافدا، چانسی بەشداریکردنیشیان لە کۆمەڵگادا هەیە.

نمونەی ئەو میللەتانە زۆرن کە بەشێوازێکی خوێناوی و ترسناك لەگەڵ کەمینەکانی خۆیاندا ڕەفتاریـان کـردووە. جینۆسـایدی نازییـەکان دژ

بــە جولەكــەكان، یەكێكــە لــە ڕوونتریــن ئــەو نمونانــە. بــەڵام هــیچ كۆمەڵگایــەك ئەگــەر بەشێوەیەكی پلان بۆ داڕێژراو كۆمەڵە گروپێكی خــەڵك بــۆ پاراســتنی یاســاكان بێبــەش بكــەن، ناتوانن ئەم بەرزەفڕییەیان هەبێت كە خۆیان بە دیموكرات ناوزەد بكەن.

***كۆنترۆڵی ناسەربازییەكان بەسەر سوپادا:**

لەســەردەمە دێرینەكانــدا بەرپرســیارێتی ســەرەكی ســەركردەیەك، ڕێنمــاكردنی هێــزە سەربازییەكان بوو لەپێناو بەرگریی لە میللەتێك یــا ڕزگــاركردنی وڵاتێكــی تــردا هەربۆیەشــە خۆشەویستی جەنەڕاڵێكی سەركەوتوو ئــەوی لەڕێگــەی بــەكارهێنانی هێــزەوە دەگەیانــدە ڕێبەرایــەتی دەوڵــەتێك. ئــەو كەســەی ســوپای دەخــستە ژێــر كــۆنترۆڵی خۆیــەوە، بەئاســانی دەیتــوانی هــەموو كەســەكانی تــر لــە دەســەڵات بێبەش بكات.

لــە چــەرخی نوێشدا ئێمــە چەندین نمونــەی بێــشومارمان بینیــوە كــە ســەرهەنگ یــاخود جەنەڕاڵێك بەسودوەرگرتن لە هێزی سوپا، لە ڕێگــەی كودەتــاوە دەوڵەتــە ناســەربازییەكەی لەناوبردووە.

لــە دیموكراسیدا، سوپا نــەك تــەنها دەبــێ لــەژێر كــۆنترۆڵی بەرپرســە ناســەربازییەكاندا بێت، بەڵكو دەبێ خاوەنی كلتورێكیش بێت كە لەســەر بنــەمای ئــەوە جــەخت لەســەر ڕۆڵــی میلیتاریــــــــستەكان بكرێتــــــــەوە وەك خزمــــەتگوزارێكی خــــاوەن ئــــیرادە نــــەك فەرمانڕەوایانی كۆمەڵگا. گەیشتن بەم ئامانجە كاتــێ ئاســانترە كــە ســوپایەكی جــەماوەریی هــــەبێت كــــە ئەفــــسەرەكانی لەهــــەموو چین وتوێژەكانی كۆمەڵگاوە دێن و دوای قۆناغی خزمــەت، بــۆ ژیــانی ناســەربازییانە بگەڕێنــەوە، بــەڵام پرەنسیپەكەی یەكسانە، سوپا پێویستە هەمیــشە بــە ملكــەچ بمێنێتــەوە، كارەكــەی پارێزگارییە لە دیموكراسی نەك فەرمانڕەوایی.

لــەم وتارانــەدا، ئێمــە دەتــوانین لــە چــەمكگەلێكی زۆر قــوڵ بگــەین، یەكــەم و لــە هــەموان گــرنگتر ئەوەیــە كــە لــە دیموكراسیدا خــەڵك دواسەرچــاوەی هــەموو دەســەڵاتەكانن. دەســتوری وڵاتەیــەكگرتووەكانی ئــەمریكا ئــەم خاڵــەی بــە ڕاشكاوییەوە لــە وشــە بەراییــەكانی خۆیــدا ڕادەگەیــەنێت:" ئێمــە، خــەڵكی وڵاتــە یــەكگرتووەكانی ئــەمریكا... ئــەم دەســتورە دادەنــــێین و دەیــــچەسپێنین". هــــەموو دەســەڵاتەكانی دەوڵــەت پێویــستە لــە خەڵكــەوە سەرچاوە بگرێت، یا دەبێ لە لایەن ئەوانەوە وەك كارێكی ڕەواپێدراو قبوڵ بكرێت. ئەم قبوڵ كردنــە بەشێوازی جۆراوجۆری وەك پرۆسیسی داڕشتنی یاساكان و هەروەها هەڵبژاردنی ئازادو دادپەروەرانە دێتەدی.

دووەمــین بنــچینەی گــشتی ئەوەیــە كــە پێویستە جیاوازییــەك لــەنێوان دەســەڵاتەكاندا هەبێت تا هیچكام لە بەشەكانی دەوڵەت نەتوانن هێندە دەسەڵات پەیدا بكەن كە ئیرادە لە خەڵك بــستێننەوە. هەرچــەندە ســەرۆك كۆمــار لــە سیــستەمی دەوڵــەتی ئــەمریكادا هەمیــشە وەك دەسەڵاتدارترین پلە تێ ی دەنۆڕدرێت، دەستور ئــەو دەســەڵاتانەی سنوردار كــردووەو بەئــەركی دەزانێــت كــە ســەرۆكی لیژنــەی جێبــەجێكردن بەهەماهــەنگی لەگــەڵ بەشــەكانی تــری دەوڵــەت و

دەنگدەرانـدا دەسـتبەكار دەبێـت. ئەگەرچـی وا دێتەبەرچـاو كـە كـۆنترۆڵی ناســەربازییەكان بەسـەر سـوپادا دەسـەڵاتێكی زۆری لەدەسـت سەرۆك كۆماردا چڕ كردۆتەوە، كلتوری زاڵبـوون بەسەر سوپا لـە كۆمەڵگایـەكی ئازادانـەدا دژ بـە سـودوەرگرتنی نیگەتیڤانـە لـەم دەسـەڵاتە كـار دەكات. دادگاكانیش كاریـان نەك تـەنها بریتییـە لـــە ســـنورداركردنی هێـــزی دەســـەڵاتی جێبــەجێكردن، بــەڵكو لەهەمبــەر دەســەڵاتی یاسادانانیـشدا هــەمان دەسـەڵاتی هەیـە. لـە دیموكراسـیدا، دەوڵـەت پێویـستە خـاوەنی هاوسـەنگی بێـتو هـەموو بەشـە جیاوازەكـان دەبــێ پــەی بــە فەلـسەفەو زەروورەتــی ئــەو هاوسەنگییە ببات.

سـێیەم، مافـەكانی تاكەكـەسو كەمینـەكان پێویستە بـە ڕێزدارانـە هـەژمار بكرێنو زۆرینـە نابێ هێزی خۆی بۆ بێبەشكردنی هیچ كەسێك لـە ئازادییـە بنەڕەتییـەكان بـەكاربهێنێت. لـە دیموكراسـییەكدا لەوانەیـە ئـەم كـارە بـە زۆری كێشەدار بێت، بەتایبەتی ئەگەر دانیشتوانێكی جۆراوجــۆر هــەبن كــە لــەبارەی مەســەلە بنەڕەتییەكانــەوە خــاوەنی خــاڵی تێڕوانینــی جیاواز بن. بەڵام كاتێ دەوڵـەتێك كۆمـەڵێكی لە مافەكانی خـۆی بێبـەش كـرد، مافەكانی هـەموو كەسەكان دەكەوێتە بەردەم مەترسییەوە.

ئــــەم پرەنــــسیپە لەســــەرتاپای (نامــــە دیموكراسـییەكان)دا بـاس كـراوەو هـەركام لـە ناونیــشانەكانی، پــشتیوانی لــەم پرەنــسیپە بنــچینەیە دەكــات. ئــیرادەو خواســتی خــەڵك لەڕێگــەی هەڵبــژاردنی ئــازادو دادپەروەرانــەوە لەڕێگــەی داڕشــتنی یاســاكان، لــە ڕێگــەی چـاپەمەنی ئـازادەوە كـە كاروبـاری دەوڵـەت دەخاتە ژێر وردبینەوەو لە ڕێگەی مافی زانینی ئەوەی دەوڵـەت خەریكی چییە، زامن دەكرێت. خواســـتی خـــەڵك لـــە ڕێگـــەی گروپــــە بەرژەوەندخوازەكانــەوە، خۆیــان دەخەنــەڕوو تەنانــەت ئەگــەر لەگــەڵ یەكتریــشدا كــەمێ ناهەماهەنگ بن.

لــە وڵاتەیــەكگرتووەكان، جیاكردنــەوەی دەســەڵاتەكان بــەهۆی دەســتورەوە كــارێكی ناچــاریانەیەو بەڵگەنامەیــەكی بنــچینەییو بناغەییـە كـە خـەڵكی ئـەمریكا بـە گـشتی بـە پــیرۆزی دەزانــن. هــەروەها ئــەم بەڵگەنامەیــە (مەبەســـــتی لـــــە دەســـــتورە –و.ك–) وەك سـنوداركردنێكی سـەپێنراو بەسـەر دەوڵەتـدا ناودەبرێت كە بەشێوەی كۆنترۆڵی مەدەنییەكان بەسـەر سـوپاو بەشـێوەی بـوونی سیـستەمێكی فیدراڵی خۆی دەنوێنێتو مافەكانی كەمینـەكان لـە ڕێگـە جۆراوجۆرەكانـەوە دابـین دەكرێـت كـە گرنگترینیـــان دەســـــەڵاتێكی دادوەریـــــی سەربەخۆیە.

بــەڵام ئایــا دەتــوانرێ ئــەم پرەنــسیپە بــۆ كلتورەكانی تریش مۆدێلیزە بكرێت؟ وەڵامێكی ســادە بــۆ ئــەم مەســەلەیە نییــە، چــونكە ســەركەوتنی هــەر سیــستەمێكی دەوڵەتیانــە وابەســـــتە بـــــە فاكتـــــەرە ناوخۆییـــــە جۆراوجۆرەكانەوە.

لە ماوەی سـەردەمی كۆلۆنیالیزمی مێژووی ئـەمریكادا، دەوڵــەتی پادشــایی لــە لەنــدەن نەیدەتوانی كۆنترۆڵێكی نزیك بەسەر كۆلۆنیالە دوورەدەسـتە ئەمریكاییەكانـدا پیـادە بكـات، بەمپێیــە هێــزو دەســەڵات بــە یاســادانەرە

ناوچەییەکان سپێردرا. ئەمەش بووە مایەی سیستەمێکی فیدراڵی کە پوختەکەی لە دەستوردا خرایەڕوو کە نیشاندەری پێگەی مێژووی تایبەتیانەی خەڵکی ولاتەیەکگرتووەکانە. سەرنجدان لە چاودێریی دەسەلاتی زیاد لە سنوری پادشای بەریتانیا، بووەمایەی سنوردارکردنی دەسەلاتی پلەی جێبەجێکردن، لەکاتێکدا ئەزموونی هێزێکی نیمچەسەربازییانەی هاولاتیان، بنەماکانی کۆنترۆڵی سوپای لەلایەن مەدەنییەکانەوە دانا.

دابینکردنی مافەکانی تاکەکان کێشەدارتر بوو، بەلام هاوکات لەگەڵ گەشەو پەرەپێدانی دیموکراسی لە ولاتەیەکگرتووەکاندا، مافەکانی خەڵك لەسەرئاستی پیاوانی سپی پێستی خاوەن موڵكوماڵەوە بۆ پیاوانو ژنانی هەموو نەژادەکان، ڕەنگەکانو ئایینەکانو مەزهەبەکان بەرفراوان کرا.

جۆراوجۆربوونی خەڵك کە لەسەرەتادا لەپێناوی دەوڵەتدا بە مەسەلە دادەندرا، گۆڕا بۆ بنەمایەکی مەزنی دەسەلاتی دیموکراسی. لەگەڵ ئەم هەموو خەڵکانەدا، مەزهەبو کلتورە جۆراوجۆرەکان لەناو میللەتە مەزنە ئازادەکاندا، هەر هەوڵدانێك بۆ سەپاندنی ڕێبازێکی یەکسانو هەماهەنگی ژیان دەگۆڕێ بۆ کارەسات. لەبری تێکۆشان دژ بە جیاوازییەکانو ناهاوشێوەکان، خەڵکی ئەمریکا ئەم بیرکردنەوە جیاوازانەیان بۆ بەردی بناغەی بڕوای خۆیان بە دیموکراسی گۆڕی.

میللەتانی تر لەگەڵ ئەزموونکردنی دیموکراسی -کە هەمیشە ئەمە ئەزموونێکە- پێویستە ئەو خەسڵەتانەی لەم لاپەڕانەدا هاتووە هەڵبسەنگێنن و ببینن کە چۆن دەتوانن لەچوارچێوەی کلتورەکەی خۆیاندا بەباشترین شێواز دروستی بکەنو پشتیوانی لێبکەن. لێرەدا ڕێگایەکی یەکگرتوو لەئارادا نییە. بە وتەی (واڵت ویتمان *Walt Whitman*)ی شاعیری ڕێزداری ئەمریکایی، (دیموکراسی) زۆرینەی خەڵکەو ئەم ناوەندەش لەگەڵ خۆیاندا دژیەکن، بەلام ئەگەر ئێمە سەرنجی خۆمان ئاراستەی پرەنسیپە بنچینەییو هەمیشەییەکانی بکەین — کە دوادەسەلاتیشی وابەستەی خەڵك بێت کە دەسەلاتی دەوڵەت سنوردار بکرێتو پارێزگاری لە مافی تاکەکانی بکرێت- لەو بارەدا کۆمەڵە ڕێگایەکی بەرفراوان هەیە کە بەو ئامانجانە بگەین.

### پەراوێزەکان:

1-مەڵڤین. ئای. یورۆفسکی (*Melvin. I. Urofsky*)ی نوسەری ئەم وتارەو ئامادەکاری زنجیرە وتارەکانیتر، پرۆفیسۆری مێژوو و سیاسەتە گشتییەکانە لە زانکۆی ئەیالەتی ڤێرجینیا، نوسەرو ئامادەکاری پتر لە (40) پەرتوکە، دوا کتێبەکانی ئەو بریتین لە:

*-Warren Court (2001)*

*-A.march of Liberty: A Constitutional History of the United States. (2001)*

ئەم دوو پەرتوکەشی بەهاریکاریی لەگەڵ (*Paul Finkelman*)دا نوسیوە.

### سەرچاوە:

دموکراسی، نوسینده: ملیون یوروفسکی، فصل یکم، انتشارات وزارت امور خارجه امریکا.

SARDAM No. 49 2007

# تاوانبارکردن بە دزی – گەورەترین ستایشی من

ستیڤ ئالن

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

من وای بۆ دەچم کە هەموو نووسەران، هەتا ئەوانەشی کە کەوتوونەتە نێو خانەی نووسەرە هەرە بلیمەتەکان و شایستەی ئەوەشن وەك بلیمەت ناو دەربکەن، پێویستیان بە هاندان هەیە. بە تایبەتی لە سەرەتای ڕووکردنە دونیای نووسین. من هەمیشە دەمزانی کە دەتوانم بنووسم، بەڵام ئەمەیان تەنها بەو مانایە بوو کە لە چاو هاوپۆلەکانی خۆم، دەتوانم کەمەکێ جوانتر بنووسم. بیرکردنەوە لەوەی کە ڕۆژێك بێت ئەوەندە جوان بنووسم، بەڕادەیەك کە بەرهەمی کارو نووسینی خۆم بچنمەوە و ئەوەندەم دەستبکەوێت کە هەقی هەوڵ و تەقەللای خۆم بێت، خەیاڵێکی لەو جۆرە بە مێشکی مندا گوزەری نەکردووە، چ لە قۆناغی سەرەتایی و چ لە قۆناغی ئامادەییدا.

مامۆستایەکمان هەبوو کە من جێ سەرنجی ئەو بووم، لە ئامادەیی – هاید پارك – لە شیکاگۆ – ئیلینۆیس، کە دەتوانم بڵێم بایەخی تایبەتی بە من دەدا، وای لە من کرد کە بڕوا بەوە بهێنم من دەتوانم بەهرەی خۆم لە نووسیندا تاقی بکەمەوە، بە جۆرێك کە هەروەك ئارەزوویەك سەیری نەکەم، بەڵکو وەك کارو پیشە تێی بڕوانم، ناوی ئەو مامۆستایە – مارگرێت بایرن – بوو، ئینگلیزی پێ دەوتینەوەو هەر لە هەمان وانەدا فێری دۆزینەوەی تواناکانی نووسینی دەکردین کە دیارە بەشێك بوو لە وانەکە. هەڵبەتە هەرچییەکی کە بە منی دەوتەوەو چی فێر کردبام، هەر هەمان شت و بابەت بوو کە هەر هەموو قوتابیەکانی دیکە وەکو من بەشداریان دەکرد و تیایدا بەهرەمەند دەبوون، تەنها جیاوازی من لەگەڵ هاوپۆلەکانمدا ئەوەبوو کە ئەو خانمە هانی دەدام بابەتەکانم بخوێنمەوە، لەو ڕۆژگارەدا, بەتایبەتی شیعرەکانم.

زۆر سەرسامیش بووم کە (شیکاگۆ تربیون) پەیتا پەیتا شیعرەکانی منی بڵاودەکردەوە، نەك

هــەر ئەوەنــدە و بــەس، بــەڵکو زۆر ســەیری ستایــشی منیــان دەکــرد، بــێ مەبەســت و هەڕەمەکی، ستایشێك کە بۆ فەریکە نووسەرێك زۆرە دەســتی بکــەوێت. سەرنووســەرەکە بــە دزییــەوە نامەیــەکی نهـێنی بـۆ خـاتوو (بـایرن) نووسـی، تیایـدا سـۆراغی ئـەوەی کردبـوو کـە بزانێت ئاخۆ یـەکێك لە قوتابییەکانی –ستیفن ئالن – ناوێك، هەتا گەر بە ڕێکەوتیش بێت، بە دزیـنی نووسـینی کەسـانی دیکـەوە سـەرگەرم نییــە. گومــانی سەرنووســەرەکە سەرچــاوەی لــەوەوە گرتبــوو، کــە دیــارە میهرەبانانــەش درکاندبووی، ئاخر زۆر قورسە بڕوا بەوە بکەیت کەسێکی تەمـەن حەڤـدە سالّ داهێنـانێکی وای لێ بوەشێتەوە کە لە ئاستی نووسەرێکی خاوەن ئەزموونـدا بێت.

ئــەو کاتــەی کــە خــاتوو بــایرن نامەکــەی پیــــشان دام، مــــن کۆڵێــــك کــــەیفخۆش و سەراسیمە بـووم! تـا ئەوپـەڕی هـانی دەدام. لـە دڵـی خۆمـدا وتم – "لـەوە دەچێت مـن بەڕاسـتی نووسەر بم!"

سەرەڕای هەموو ئەم شتانەش خاتوو بایرن هــانی دام کــە بـچمە نــاو پێـشبڕکێیەکەوە کــە ڕێکخــراوی (کیڤیتــان) سەرپەرشــتی دەکــرد. بابــەتی دیــاریکراویش نووســینێك بــە نــاوی (دۆزینــەوەی ســەر لــە نـوێ –ی ئـەمریکا). لــە ڕوانگەیــەکی پیــشەگەرانەی نووســینەوە زۆر سەرسـام بـووم کـە نامەیـەکم پێگەیـشت تیایـدا نووسـرابوو کـە مـن پێـشبڕکێیەکەم بردۆتـەوە. خەڵاتەکەش چەکێکی سەد دۆلاری بوو لـە پـاڵ ئاهـــەنگێکی نـــانخواردن لـــە ئـــوتێلێکی زۆر ناوەڕاستی شیکاگۆ.

لەو ڕۆژگارەدا دایکم بەوەی نەزانیبوو کە من خولیـای نووسـینم، یـان هـەتا شـتێك سـەبارەت بـەو مەسـەلەیە بزانێـت، تـەنها بـە ئاسـتەمێك نـەبێت، هەسـتی پێنـەکردبوو. ئـەو ئێوارەیـە کـە گەڕامــەوە مــاڵێ، هــیچ نەیپرســی ئــاخۆ ئــەو ئێوارەیـەم چـۆن گوزەرانـد. منـیش چـەکی سـەد دۆلارییەکـەم خـستە سـەر مێـزی نـانخواردنی بـەیانیمان بـۆ ئـەوەی کـە ئەگـەر بـەیانی لەخـەو وەئاگاهات بیبینێت یەکسەر چوومە ناو جێگا.

سیناریۆکە ئـەوە روون دەکاتـەوە کە چـەندە گرنگ و پڕ بایەخە ئاوڕ لە کوڕ و کچە گەنجەکان بدرێتـەوە و هـان بـدرێن تـاوەکو پـتر مەشـق و ڕاهێنان بکەن و پەرە بە توانا و بەهرەی خۆیـان بــدەن کــە دەکرێــت لــە ڕۆحیانــدا هــەبێت. چــەند ســاڵێك دواتــر تــوانیم پاداشــتی ئــەو یارمـەتی و وەسـتانەی خـاتوو مارگرێـت بـایرن بدەمــەوە بــەوەی کــە کۆمەڵــە شــیعرێکی خــۆم پێشکەش کرد.

لـە سـەرێکی دیکـەوە.. لەوانەیـە بـێ هانـدان قوتابییـە بەهرەمەندەکان هـەرگیز ئـەو حـەزەیان لــەلا دروسـت نــەبێت کــە فێـر بـبن، تواناکـانی خۆیــان گەشــە پێبــدەن، یــان وزە و توانــا شاراوەکانی خۆیـان بدۆزنـەوە. هـەر بـۆ نموونـە، لـە هـەمان ئامادەییـدا، مامۆسـتایەکی دیکـە کـە زمانی ئیسپانی پێ دەوتینەوە، لە وانەکانی ئەو خانمـەدا ئامـادە دەبـووم، بـەڵام زۆر بەداخـەوە شتێکی زۆر کـەمی فێرکردم چونکە ئـەو خانمـە سارد و سڕ بوو، لـە هـەمان کاتدا تیرو توانجی تێدەگرتین و گاڵتـەی پێدەکردین، لـەوە دەچـوو سەبارەت بە هاندانی قوتابییەکان هیچ نەزانێت. لــەوەدا بەهرەمەنــد بــوو کــە ســووکایەتی بــەو

قوتابیانە بكات كە نەیانتوانی خێرا و ئاسان فێر بن. ئەو هەڵوێستە دژوارەی وایكرد كە من دوور كەومەوە. دیارە بەشێكی ئەوەی كە من ئەمڕۆكە لە زمانی ئیسپانیدا كارامە نیم دەگەڕێتەوە بۆ كاریگەریی خراپی ئەو خانمە.

وەك دەبینن.. ئەمڕۆكە من فێری بەزمێكی دیكە بووم كە پەیوەندی بە ڕابردوومەوە هەیە، فێری ئەوە بووم كە هەر كەسێك دەتوانێت شتی زۆر چاك لە نموونەی خراپەوە فێر ببێت. بەدمەستی و خواردنەوەی زۆری مەی لە خانەوادەكەی دایكمدا گرفتێكی راستەقینە بوو. هەر لە دەرئەنجامی ئەوەی كە نموونەی خراپی ئەو بەدمەستانەم بینی، هەر لە منداڵیمەوە، بۆیە من هیچ خولیایەكم بۆ خواردنەوە نییە. هەمان كێشەم لەگەڵ جگەرە كێشاندا هەیە. دایكە بەستەزمانەكەم لە رۆژێكدا دوو پاكەتی دەكێشاو ببووە قوربانی نیكۆتین، هەر لە داخی چرە دووكەڵی بێ كۆتایی، كۆكین، تەپڵەكی پڕ لە ئاغزە جگەرە، بۆنی زۆری ناخۆشی دووكەڵی جگەرە كە لە ماڵەكەمدا بلاْودەبۆوە و بگرە جلەكانیش بۆنی جگەرەیان گرتبوو.. هەر لە داخی ئەم شتانە من لە ژیانمدا جگەرەیەكم نەكێشا.

دیسانەوە دەڵێم كە نووسەرە گەنجەكان پێویستیان بە هاندان هەیە. هەر بەهۆی كاریگەری خاتوو بایرن بەسەر منەوە، من توانیم لەزەت لە نووسینی كتێبان بكەم، گۆرانی نووسین بۆ تەلەفزیۆن. بڵێ چیتر؟ من لە هەموو ئەم نووسینانەدا تاقە یەك وشەم لە كەس نەدزیوە.

سەرچاوە:

*NewYork Times*

*Best Authors*

*Jack Canfield*

*Mark Victor Hansen*

*Bud Gardner*

*Chicken Soup for the Writers' Soul*

*p. 173-171.*

# ئەخلاق و ڕەخنەی ئەخلاقی

## گفتوگۆیەك لەگەڵ د. عبدالکریم سروش

لە ئینگلیزییەوە: هادی محەمەد

پ/ د. سروش، ماوەیەکە لە ئێران دوورکەوتویتەوەو ئێمەش بێ بەش بووین لە بەڕێزت. ڕاستییەکە ئەوەیە کاتێك سەیری کارەکانی یەك دوو ساڵی ڕابردووت دەکەین، بیرۆکەیەکی هاوبەش دەبینین. "ئەخلاقی خودایان" *Ethics of Gods* کۆکراوەیەکی مەقالەکانتە ساڵی 2001 بە چاپ گەیەنرا، لەو مەقالانەش: "کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای ئەخلاقی" و "ڕەخنەی ئەخلاقییانەی دەسەلأت" بەرچاوکەوتن. هەروەها ووتاریشت هەبووە بە تایبەتی دووانیانم لە یادە: "زیندووکردنەوەی ئەزموونی موعتەزیلە" تیایدا تەرکیزت کردۆتە سەر قوتابخانەی موعتەزیلە وەکو قوتابخانەیەکی عەقلأنی و ئەخلاقی فکر، هەروەها " پەیوەندی نێوان ئەخلاق و دەسەلأتی سیاسی". ئێستا دەبێت ئەوەش بڵێم کاتێك گەڕایتەوە بۆ ئێران ستایشی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمیت کرد و لە بارەیەوە دووایت، لە ووتارەکەتدا باست لەو دەلیلانە کرد کە بۆچی مەولانا زۆر ڕێزی لە بێدەنگی *Silence* گرتووە، لەناو ئەو دەلیلانەشدا باست لە بەهای ئەخلاقی بێدەنگی کرد لای مەولانا. فاکتەری هاوبەش لە هەموو کارەکانی دوو ساڵی رابردووتدا بریتییە لە ئەخلاق *Ethics*. ئەگەر ئەمە وەکو پێشەکییەك بۆ پرسیارەکەم ڕەچاو بکەم، ئایا ئەوەت قبوڵە ماوەی دووساڵی ڕابردوو، بایەخدانی د. عبدالکریم سروش بە "ئەخلاق" بووە؟

و/ڕاست دەکەیت. بەڵێ قبوڵمە کە ئەم دوو ساڵە بگرە زیاتریش بایەخدانم بە ئەخلاق بووە. ووتم "ئەم دوو ساڵە بگرە زیاتریش" چونکە پێش ئەم دوو ساڵەش ئەخلاق بابەتێکی جێی گرنگی بوو بۆ من. هەر لە شۆڕشی ئیسلامییەوە کە گەڕاومەتەوە بۆ ئێران، فەلسەفە و ئەخلاقم لە زانکۆدا ووتۆتەوە. چیرۆکی ئەخلاق هەمیشە زەینی منی داگیرکردووە و هەرگیز پشتگوێم

نەخستووە جا چ لە بواری کردەییدا بێت یاخود بـــواری تیـــۆری. هەمیـــشەش هەوڵمـــداوە قوتابیـەکانم فێری بیرکردنەوەیەکی قووڵ بکەم لەسەر بابەتی ئەخلاق..

پ/ ئەم کارە بە کوێی گەیاندیت؟

و/ بـەو جێگەیـەی گەیانـدم کـە ڕەهەنـدی کردەیی ئەم بابەتە لە زەینمدا وردە وردە بالآیی خـۆی وەرگـرت. واتـە، لـە سـەرەتادا زیـاتر فەلسەفەی ئەخلاقم دەووتەوە بەلآم لە کاتێکی دیاریکراودا، چوومە ناو بواری ئەخلاقەوە.

پ/ شێوازەکەت چی بوو؟

و/ هـەروەکو خـۆت دەزانیـت، فەلـسەفەی ئـەخلاق یـان – مەیدانـە *Meta- field* واتـە فەلـسەفەی مەیـدانی ئەخلاقـە، لـە کاتێکـدا مەیدانی ئەخلاق یەکەمین مەیدانێکی ڕێککراوە کـە ڕاسـتەوخۆ پەیوەنـدی بـە کـردارو جیهـانی دەرەکـی و ڕەفتـاری مرۆڤەکانـەوە هەیـە. لـە مەیـــدانی ئەخلاقـــدا، هەوڵمـــداوە بنـــەما تایبەتییـەکان دابنـێم و بەشێوەیەکی تایبـەتیش لـە "خـود"ەوە *self* دەسـتپێکردووە. واتـە، مـن قوتابییەکانم فێرکـردووە کە ئێمە "خـود"ێك و "ئەوی دیکە"مان *other* هەیە. سەرجەم بابەتی یـاخود کـاری مەیـدانی ئـەخلاق بریتییـە لـە پاکژکردنـــەوەی خـــود لـــەوی دیکـــە، واتـــە سڕینەوەی ئەوی دیکە.

پ/ئـەم سـڕینەوەی ئـەوی دیکـە چـی دەگەیەنێت؟

و/ مانـای ئەوەیـە کـە هـەموو بەدکارییـەکان "ڕەزیلەتـەکان *vices*" سـەر بـە ئـەوی دیکـەن و هەمان پێکهاتەو بونیادی ئێمەی مرۆڤیان نییە واتـە لـە بونیـاددا *Structure* لە ئێمـە جیـاوازن.

تەنانـەت ئەگـەر بێنـە نـاو بوونمانـەوە پێویـستە دەریانپەڕێنین و لە خۆماندا بیانسڕینەوە. بەڵام فەزیلەتـەکان *Virtue* هـەمان بونیـاد و پێکهاتـەی ئێمەیان هەیە، کاتێکیش دێنە ناو بوونمانەوە، وامـان لێدەکـەن زیـاتر خۆمـان بین و "خـود"مـان بـەهێزبێت. ئەمەیـە چـۆنیەتی دابەشـکردنی ڕەفتاری خەڵکی بۆ چاکە و خراپە و بەهاکانیش *Values* دیـوی پـۆزەتیڤ و دیـوی نێگـەتیڤیان هەیـە. بـەها نێگەتیڤـەکان بـریتین لـە ئـەوانی دیکەو بەها پۆزەتیڤەکان بریتین لە خودەکان..

پ/ چـی وایلێکردیـت گرنگـی بـدەیت بـە ئەخلاق؟

و/ هەمیـــشە پرســـیارێك زەیـــنی مـــنی پرکـردووە: سـەرەڕای ئـەم هـەموو مـشتومڕە دوورو درێژو هەندێك جار زۆر گرنگ و گەورەیە کە هەمان بووە و هەشمانە لە بارەی ئەخلاقەوە، ووتاربێـژەکان لـە ووتارەکانیانـدا لـە بارەیـەوە دەدوێن، لە پۆلەکانی خوێندندا دەووترێتەوەو وەکو ئامۆژگاری دەدرێتـە خەڵکی، باشە بۆچی ئێمـەی ئێرانـی یـاخود بڵـێین ئێمـەی موسـڵمان ئەوەنـدە لـە ئـەخلاقی ڕاسـتەقینە دابـڕاوین؟ هیوادارم ئەو پرسیارەی کە دەیورووژێنم نەبێتـە هـۆی دڵتـەنگی بـۆ هـیچ لایـەك: بۆچـی ئەوەنـدە نائـەخلاقین *unethical*؟ بۆچـی ئەوەنـدە لـەناو ئێمـەدا درۆکـردن و قـسەی ناشـیرین بەرامبـەر کەسـانی دیکـە و سـوکایەتی کـردن بەخـەڵکی بـاوەو زاڵـە؟ لـەوەش گـرنگتر بـۆ دەبێـت پێمـان وابێـت ڕێـساکانی فیقهـی ئیـسلامی بـالآتر و گرنگتربن لە ڕێسا ئەخلاقییەکان؟ یاخود ئەوە چۆنە کە موسڵمانێکی کردەیی هەرگیز نوێـژە نەریتییـــەکانی نافـــەوتێنێت بـــەلآم ناتوانێـــت

کـــۆنترۆڵی زمـــانی و درۆکـــانی و قـــسه نابەجێکانی و سوکایەتی کردنەکانی بکات بەبێ ئـەوەی هەسـت بـە پەشـیمانی بکـات؟ جگـە لەمانەش، کێشەی مافەکانی خەڵکی لە ئارادایە. ئـەوە چـۆنە کـە هەنـدێك کـەس ئەوەنـدە بـە دڵـــسۆزی و پیرۆزییـــەوە پابەنـــدن بـــە ئامۆژگارییـەکانی فیقـە و ئـایین بـەڵام کاتێـك مافەکانی کەسانی دیکە دێتە ئاراوە، دەیانخەنە لاوەو دەیانکەن بە ژێر پێوە؟؟

پ/ باشـــە، کەواتـــە وا دەردەکـــەوێت کـــە هۆکارەکان تەنها لە ئەخلاق خۆیدا نابینرێن.

و/ بەڵێ، سەد لە سەد وایە. ئەمـەش وای لـە مـــن کـــرد وورده وورده ســـەرنجم لـــە تیـۆرایزەکردنی فەلـسەفەی ئـەخلاق و مەیـدانی ئەخلاقـەوە بگوازمـەوە بـۆ نـاو ئـەو بارودۆخـە کۆمەڵایـــەتی و ئـــابووری و دەروونییانـــە کـــە تیایانـدا فەزیلەتـە ئەخلاقییـەکان دەچـنە نـاو بوون و رەفتاری کەسەکانەوە، پاشانیش ویستم بزانم لەم ڕووەوە چۆن شتەکان لە ڕابردوودا لە کلتوری ئێمەدا وەستاونەتەوە.

پ/لـــە مەقالەکەتـــدا بـــەناوی "کۆمـــەڵگای مـــەدەنی، کۆمـــەڵگای ئـــەخلاقی"، باســـت لـــە چەندان دەلیل کـردووە بـۆ ئـەم نائەخلاقێتییـە یـاخود دەبێـت بڵـێم قـەیرانی ئـەخلاقی. تکایـە زیاتر بۆمان روونبکەرەوە.

و/دەرککی ئەوەم کرد کە دەلیل گـەلێکی زۆر هەن لە پشت چیرۆکی دابـەزینی ئـەخلاق لـە نـاو ئێمەدا: ئێستا باس لـە دوو دەلیل لـە گـرنگترین دەلیلـەکان دەکـەم. یەکـەم: لـە سـەردەمێکی تایبەتیـدا، بـواری یـاخود مەیـدانی فیقـە بـە شێوەیەکی تایبـەتی زاڵ بـوو. جـەخت کردنـەوە لەسەر ئەو بیرۆکەیـە بـوو کـە موسڵمان کەسێکە رەفتارەکانی بە گوێرەی فیقە بووە واتـە هاوتـا بـووە لەگـەڵ ئـەمر و نەهییەکانی فیقەدا. ئەگـەر بەشێوەیەکی گشتی لە مەسەلەکە بڕوانین، ئەوا بەهێزی فیقە بۆتە هۆی لاوازکردن و پەکخستنی ئـەخلاق. ئەمـە تـەنها لـە بـواری کردەییـدا ڕووی نـەدا بـەڵکو لـە بواری تیۆریشدا روویدا. ئەگـەر ســـەیری کلتـــوری ئێرانـــی ئیـــسلامی بکـــەیت، دەبینیـت ژمارەیـەکی زۆر کتێـب لەسـەر فیقـە نووســـراوە، بـــەڵام هیـــچی وا لەســـەر ئـــەخلاق نەنوسـراوە شـایانی بـاس کـردن بێـت. تەنانـەت بیریارەکانمـان بیرۆکـەکانیان لـە چوارچـێوەی فیقهـدا بـەکاربردووە. هـەرگیز بیرۆکـەکان تـا ئاسـتێکی زۆر گـەورە لـە چوارچێوەی ئەخلاقدا گەشـەیان پێنـەدراوە، هەرچـەندە مەودایـەکی سادەو بێ توانای فکر هـەبووە لـە بواری فیقهدا بـەڵام بیرکردنـەوە لـە بـواری ئەخلاقـدا تەنانـەت نـەیتوانیوە شـان بەشـانی ئـەم بیرکردنـەوە سـادەیەی فیقـە هـەنگاو بنێـت. ئـەم لاوازی و پەکخستنەی ئەخلاق کارەساتبار بوو..

پ/ بەدڵنیاییـەوە، ئـەم بەڵگـە هێنانـەوەی بـەڕێزت ناکرێـت بـەکاربهێنرێت بـۆ لاوازکردنـی فیقە، گوایـە ئـەم جـۆرە لێکدانەوەیـە فیقـە لاواز دەکـات، لــە جیــاتی ئــەوە پێویــستمان بــە دۆزینەوەی چارەسـەرێکە بـۆ ئـەم دۆخـە لاوازەی ئەخلاق . تا چەند هاوڕای لەگەڵمدا؟..

و/ بـەڵێ وایـە. لەبەرئەوەیـە ووتـم ڕەخنـەی ئەخلاقی *ethical critique* پێویستە هـان بـدرێت. هــەروەها دەبێــت رەخنەیــەکی ئەخلاقییانــەی فیقهــیش هــەبێت. ســەیرکە کاتێــك ئــەخلاق دەخەینـە لاوە فیقهیش دووچاری کێشە و بـەڵا دەبێت. لەبەرئەمەیە بیرم لـە رەخنـەی ئـەخلاقی کردۆتـەوە: رەخنـەی ئـەخلاقی زۆربـەی شتەکان

بە ئایین و فیقھ و بابەتەکانی دیکەشەوە. بێگومان بواری فیقھ دەبێت لە زۆر گۆشەی جیاوازەوە رەخنە بکرێت، یەکێك لە گرنگترین ئەو گۆشانە گۆشەی ئەخلاقە.

پ/ هیچ بەڵگەیەکی بەرجەستەت لە مێشکدایە؟

و/ بۆ نموونە، پرسی مافەکانی مرۆڤ *Human Rights* لە فیقھی ئێمەدا زۆر لاوازە، ئەم پرسە رەھەندێکی ئەخلاقی جدی ھەیە. ئێمە دەڵێین ئەم شتە یاخود ئەو شتە مافێکە. ئەگەر ئەم مافە پێشێلکرا، ئەوە نارەواییە *Injustice*. نارەوایش رەزیلەتێکەو بەکارێکی نائەخلاقی دادەنرێت. ئەوەی من دەیڵێم ئەوەیە لەناو ئێمەدا ژیانی فیقھییانە ژیانی ئەخلاقییانەی خستۆتە مەترسییەوە..

پ/ زۆر باشە، وا دەردەکەوێت پرسیارە لاوەکییەکەم گفتوگۆکەمانی بەلارێدا بردبێت. تۆ بە نیازبوویت باس لە دوو ھۆ *reason* بکەیت بۆ لاوازی ئەخلاق. یەکەمیان زاڵێتی فیقھ بوو. ھۆیەکەی دیکەیان چییە؟

و/ ھۆیەکەی دووەم ئەوەیە کە ئێمە بۆ چەندان سەدە تەنانەت پێش ھاتنی ئیسلامیش بۆ ئێران لە ژێر دەستی سیستمە ستەمکارییەکاندا ژیاوین و سیستمە ستەمکارییەکانیش چەندان کەموکورتیان ھەبوو، یەکێك لە خراپترین و ترسناکترین کەموکورتی سیستمە ستەمکاریەکان بریتییە لە دواکەوتنی ئەخلاق. ئەخلاق لەژێر دەستی سیستمە ستەمکارییەکاندا گەشە ناکات و دەخنکێت. زۆرینەی خەڵکی باوەڕیان وایە سیستەمی ستەمکاری خراپە چونکە دەیانچەوسێنێتەوە. بێگومان ئەمە یەکێکە لە خراپەکانی سیستمە ستەمکارییەکان. بەڵام لەمەش گرنگتر، ستەمکاری *Tyranny* خراپە چونکە ئەخلاق دەچەوسێنێتەوە، بەو مانایەی ئەخلاق ھەڵدەوەشێنێت و لە باری دەبات. بەتەواوی ئەخلاق بەرەو خنکان دەبات.

پ/ لەوە دەچێت بتەوێت بڵێیت کە خودی کەسی ستەمکار دەبێتە پێودانگ و مۆدێل بۆ ئەخلاق؟

و/ لە سیستەمە ستەمکارییەکاندا، ھەرەمێك ھەیە. خەڵکی بنکەی ھەرەمەکە پێکدەھێنن و فەرمانڕەواکانیش لوتکەی ھەرەمەکە. لەبەرئەوەی سیستەمەکە ستەمکارییە، ھیچ رێسایەك نییە بۆ پاراستنی مافی کەسێك جگە لەوەی ئەو کەسە دەبێت خۆی لەو پێودانگەی تۆ باست کرد نزیکتر بکاتەوە، واتە خۆی نزیك بکاتەوە لە فەرمانڕەواکان یاخود لە لوتکەی ھەرەمەکە. ئەو کەسەی نزیکترە لە چەقی دەسەڵات، بەھێزتر و بەدەسەڵاتتر دەبێت. دواجار دەتوانێت مافەکانی خۆی بەدەست بێنێت و تەنانەت مافەکانی خۆیشی تێپەڕێنێت.

پ/ مەبەستت لەم تێپەڕاندنە چییە؟

و/ مەبەستم ئەوەیە ھەموو مافەکان و فەزیلەتەکان و بەھاکان دەخاتە ژێر پێیەوە لە پێناو نزیکتربوونەوە لە لوتکەی ھەرەمەکە. بەم شێوەیە، خەڵکی دەبنە پلە پەیژەکانی تاکێك و ئەویش وا ھەست دەکات کە ھەموو شتێك شایانی چەوساندنەوەیە لە پێناو بەدەستھێنانی دەسەڵات و نزیکتربوونەوە لە ھەڵگرانی دەسەڵات. بارەکە بەم شێوەیەی

لێـدێت، ئـەخلاق دەبێتـە یـەکێك لـە قوربانییـە یەکەمینەکانی ستەمکاری.

بەداخەوە، ئێمە لە ڕێڕەوی مێژووی خۆماندا ڕووبەڕووی ئەم دوو نەخۆشییە (زاڵێتی فیقھ و ســتەمکاری) هــەردووکیان بووینەتــەوە. لــە کۆمەڵگایەکدا فیقهێکی بـەهێز دروست بێت و لەگـەڵ سـتەمکارییەکی بـەهێزدا تێکـەڵ ببێـت، واتە لە کۆمەڵگایەکدا ستەمکاری سیاسی بناغە لەسـەر فیقـھ دابنێـت و فیقهـیش لـە شـێوازێکی ســـتەمکارییانەدا رابهێنرێـــت، ئـــەخلاق دوو ئەوەنـــدە دەگوشـــرێت و دواهەناســـەکانی خۆی دەدات..

پ/لـە هـەر ئاسـتێکدا بێـت، کردەوەیـەکی نائـەخلاقی یـاخود تەنانـەت دژە – ئـەخلاقی فرمانی تایبەتی خۆی هەیە. کەسێك درۆ ناکات ئەگـــەر درۆکـــردن یارمـــەتی نـــەدات لـــە بەدەستهێنانی ئامانجێکی خوازراودا. لەوانەشە بکرێـت فیقـھ لـە هـەمان ئـەم دیـدە بەرژەوەنـدی خـوازی یـاخود فرمانییـەوە لێـی بڕوانرێـت. بـە مانایـــەکی دیکـــە دەکرێـــت بووترێـــت: لەســـەردەمێکی تایبەتیـــدا فیقـــھ هێنـــدە کـــارابووە تەنانـــەت هـــەژموونی خـــۆی ســـەپاندووە بەســـەر فەلـــسەفەی سیاســـی و ئەخلاقــدا و ئــەخلاقی بــەم دۆخــەی ئــەمڕۆ گەیانـدووە. ئەمـە هەڵـەی فیقـھ نییـە، هەڵـەی بناغەیـەکی نەشـیاوە یـاخود بـابڵێین دیـدێکی وەزیفییە بۆ فیقھ.

و/ مـن ئینکـاری ئـەوە ناکـەم فیقـھ فرمـانی (وەزیفـە *Function* )هەیـە. سـەرەڕای بـوونی کۆپی دیاریکراو، ئینکاری ئەوە ناکەم کە ئەمڕۆ فیقھ فرمانێك جێبەجێ دەکات. ئەو کێشەیەی من لەگەڵ فیقهدا هەمە بریتییە لە بەهێز بوون و زاڵبـوونی فیقـھ و لـە بەرامبـەردا لاوازبـوونی ئـەخلاق. ئـەگینا مـن پـێم وانییـە کـە بـوون و جەوهەری فیقھ لە بنەڕەتدا زیان بەخشە.

لـە کۆمـەڵگاو مێـژووی کلتـووری ئێمـەدا، خـەڵکی ئـەو تێڕوانینـەیان هـەبووە کـە فیقـھ دەتوانێت وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە بداتەوە کە لـەبارەی ڕەفتـاری مرۆییـەوە دروست دەبن. تەنانـەت ئـەمڕۆش کەسـانێك دەبیـنم باوەڕیـان وایە چاکە *good* و خراپە *bad* دەکرێت لە فیقھ و پرنـسیپەکانی شـەریعەتەوە دەربهێنرێـت. هـەر پرســـیارێکیش لـــە بـــارەی بکـــە و مەکـــەی کەسێکەوە واتە کردارێك ئەنجام بدات یاخود نا، تەنها دەبێت ڕووبەڕووی فەقیهە ئیسلامییەکان بکرێتـەوە چونکە ئەوان کەسانێکن پسپۆڕن لـە وەڵامدانـــەوەی ئـــەم جـــۆرە پرســـیارانە. ئەمـــە تێڕوانینێکی هەڵەیە کە هەمیشە لە کۆمەڵگای ئێمـــەدا متمانـــەی خـــۆی هـــەبووە. بـــەردەوام ووتوومـــە ئـــەوە لەبـــەر بـــوونی هـــەمان ئـــەم نەخۆشییانەوە بووە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا کە غـــــەزالی کتێبەکـــــەی خـــــۆی بـــــەناوی "زیندووکردنـــــەوەی زانـــستە ئاینییـــــەکان" نووسـیوە. لـە پێـشەکی و بەشـەکانی دیکـەی کتێبەکەیدا، ئاماژە بەم کێشە دەکات و تێبینی ئەوە دەکات کە فیقھ ئەوەندە بەهێز و زاڵ بـووە ئـەخلاقی گوشـیوەو بـچوکی کردۆتـەوە. غـەزالی ڕای وایـە کـە زیندووکردنـەوەی یـاخود بوژاندنـەوەی *Revival* ئاین سـەد دەرسـەد پشت لەســـەر زیندووکردنـــەوەی ئـــەخلاقی ئـــایینی دەبەستێت. ئەمە غـەزالی بووە لـەو کاتـەدا ئـەم نەخۆشییانەی دەستنیشانکردووە. باوەڕم وایـە لــەمڕۆدا کێـشەی ئێمــەش هــەمان کێـشەیە. ئەخلاقی ئاینیمان زۆر لاواز بووە.

پ/ لەوەناچێت ئەخلاق تاکە فاکتەربێت واتە تەنها ئەخلاق لاواز بووبێت؟

و/ بـەڵێ، ئـەمڕۆ هـەموو بـوارە ئاینییـەکان لاوازن. لـــە بارودۆخـــە هەنووکەییەکانـــدا، دینناســـی (ئیلاهیاتناســـی *Theology*) و ڕاڤـــەکردن *exegesis* و خوێنـــدنی پرنـــسیپە ســـەرەتاییەکان.. هتـد لاوازن و گەیـشتوونەتە قۆناغی مەیین. لە سەردەمێکی تایبەتی مێژووی کلتـوری ئیـسلامیدا، ڕاسـتەوخۆ دوای کۆچـی دوایـی پێغەمبـەری ئیـسلام، هـزری ئـاینی هزرێکـی لەبـەر ڕۆیـشتوو بـوو، بـەو مانایـەی وەستاوو چەق بەستوو نـەبووە. ئەگەر سەیری ئـەم ماوەیـە بکـەیت، چـەندان قوتابخانـەی تیـۆری‌و فیقهـی و دینناسـی هـزر دەبینیـت. هـەروەها تـەوژمێکی زۆر فراوانـی بیرۆکـەکان بوونی هەبووە لەگەڵ دژە تەوژمەکانیان، ئەمە تا ئاسـتێکی گـەورە دووچـاری سەرسـووڕمانمان دەکـات. بزوتنـەوەی هـزری ئـاینی لـەو کاتـەدا کتومـت وەکـو گرکانێـك وەهـابوو کاتێـك چـالاك دەبێـت و بەخێراییـەکی زۆر مـادەی تـواوەی شـێوە و قـەبارە جیـاوازی لێدێتـە دەرەوە. بـەڵام لەگـەڵ تێپـەڕبوونی کاتـدا، ئـەم مـادە تواوانـە ساردبوونەوەو مەیین. ئێستا ئێمە لە سەردەمی مەیینـــدا دەژیـــن. دینناســـییەکەمان، ڕاڤەکردنەکـــەمان و خوێنـــدنی پرنـــسیپە سەرەتاییەکان لە قۆناغی مەییندان و هیچمان بەدەستەوە نەماوە جگە لە دووبارە کردنەوەو یادهێنانەوەی قاڵبە دارێژراوەکان. لەبەرئەوەیە بیرکردنەوەی ئاینیمان تەواو لاوازبووە. هەروەها ئـەم لاوازبوونـەش لـە فیقهـدا بـەدی دەکـەین. ئەوەی جێگـەی داخـە ئەوەیـە ئـەم فیقهـە لاوازە ئەخلاقـــە لاوازتربووەکـــەی گوشـــیوەو خستوویەتیە مەترسییەوە و ژێرپێی ناوە.

پ/بەهـەرحاڵ، هـەموو سـەردەمێك پێویـستی تایبـەت بـەخۆی هەیـە. لـەو سـەردەمەدا موسڵمانەکان خۆیان چەقیان نەبەستبوو، ئەمە بـە چاوپۆشـیکردن لـە بیرکردنـەوەیان واتـە بیرکردنـەوەیان هـەر جۆرێـك بووبێـت خۆیـان نەگەیشتبوونە ئاستی چەق بەستوویی. بەڵام، ئێمـە ئـەمڕۆ گەیـشتووینەتە ئاسـتی چـەق بەستوویی و جێگری ئەم بابەتانە، وایە یان نا؟

و/ ئەمـە چـەق بەسـتوویی نییـە، بـەڵکو مەیینـە. ڕێـچکەی بنـەڕەتی چـالاك کـردن و لەبەرڕۆیـشتنی بیرکردنـەوەی ئـایینی ئەوەیـە دەبێت خۆمان لەم قۆناغی مەیینە ڕزگار بکەین. لـە بەرامبەریـشدا، بـۆ ئـەم کـارە پێویـستمان بـە ئازادییـە. مـەرجی پێـشین بـۆ لەبەرڕۆیـشتن و گۆڕاوی بیرکردنەوەی ئاینی لە هەموو لقەکانیدا بریتییـە لـە ئـازادی بـەبێ هـیچ فـشار و بێنـە و بەرەیـەك. لەسـەر ئـەم ڕەوشـە هەنووکەییـەمان ناکرێـت گـۆڕاوی و لەبـەر ڕۆیـشتوویی لـە بیرکردنـەوەی ئایینیـدا بێتـە کایـەوەو قۆنـاغی مـەیینی بیرکردنـەوەی ئـایینیش لـە هـەموو لقەکانیـدا درێـژە دەکێـشێت.. ئـەمڕۆ ئەگـەر کەسێك هەر شتێك بڵێت کە جۆرێك لە ئاماژەی نابـاوو ناسـوونەتی تێـدا بێـت لـە بـارەی بیرکردنـەوەی ئایینییـەوەو کـەمێك دژایـەتی و نابـەدڵی لـەخۆ بگرێـت، ئـەوا دنیایـەك تۆمـەت دەدەنـە پـاڵی و دووچـاری ئـەو چارەنووسـە دەبێت کە ئێمە دووچاری هاتووین..

پ/بێگومـان، هـیچ کـەس گرنگـی ئـازادی ڕەت ناکاتـەوە لـە گەشـەکردن و بەرزبوونـەوەی

ئاستی هزر و کلتور بەڵام ئازادیش سنوری خۆی هەیە..

و/ کە دەڵێم ئازادی ***Freedom*** مەبەستم بەرەڵڵایی نییە و گومانم هەیە لەوەی هیچ کەسێك بەرگری لە ئازادی بکات و لە پێناویدا تێبکۆشێت بە نیەتی دروستکردنی بەرەڵڵایی بەڵام ئازادی مەرجێکی پێشینەیی زەرورییە بۆ بوژاندنەوەی ئەو لقانە لە هزری ئایینیدا، پاشانیش دەتوانین لەبەرڕۆیشتووییە ئەسڵییەکە بگەڕێنینەوە بۆ هزری ئایینی، ئەوکاتە دەکرێت مەودایەکی فراوانی قوتابخانەی هزر لە فیقهو ديناسی و ڕاڤەکردندا دەربکەون و خۆیان نیشاندەن و هەموو کەسێکیش دەتوانێت بێتە مەیدانەکەوەو ئەو کاتەش تەوژمێکی زیندووی بیرۆکەکان و تەوژمە پێچەوانەکانیان دەکرێت دروست ببن و بیریارەکانیش بوارێکی یاخود مەیدانێکی کراوەیان دەبێت بۆ بیرکردنەوە. لەگەڵ گەشەپێدانی لەسەرخۆی بیرۆکەکان، چەندان بیرۆکەی لاواز دەپوکێنەوەو بیرۆکە ڕەسەنە بەهێزەکانیش دەگەشێنەوەو ئەو کاتە لەبەر ڕۆیشتووییەکی نوێی هزر دەبینین. لێرەدا ڕاستییەك هەیە ئەویش ئەوەیە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆر دەووترێت لەبارەی بزووتنەوەی گەورەوە کە هەبوونیان شتێکی باشە و زەرورەتی ئەمڕۆیە، بەڵام کاتێك بیریارەکان لە سەلامەتی و شان و شکۆیان بترسن و دڵنیانەبن و تەنانەت نەتوانن لە کەمترین شتە بنەڕەتییەکانی ژیان چێژوەرگرن، چۆن دەکرێت چاوەڕوانی ئەوەیان لێبکرێت پێبنێنە مەیدانەکەوە؟

پ/ ئەگەر هیچ بەرهەڵستییەکت نییە لەسەر قسەکانی پێشتر با لەسەر ڕەخنەی ئەخلاقی بدوێین. گومانی تێدا نییە کاتێك لە بارەی ڕەخنەی ئەخلاقییەوە قسە دەکەیت، گریمانەی دیاریکراو لە زەینتدا هەیە. پێش ئەوەی بزانین ڕەخنەیەکی ئەخلاقی چی دەگەیەنێت واتە مانای چییە، پێویستە بزانین گریمانەکانت یاخود گریمانە پێشینەکانت ***assumption*** چین: بۆچی دەبێت هەمیشە ئەخلاقی بین و مانای ئەخلاقیبوون چییە و پرسە بنەڕەتییەکانی ئەم بابەتە چین؟

و/ گرنگترین پرنسیپ لە مەیدانی ئەخلاقدا ئەوەیە مرۆڤ پێویستە ئەخلاقی بێت و ژیانێکی ئەخلاقی بژی. ئەگەر کەسێك پرسیارم لێبکات دەلیلت چییە بۆ ئەم قسەیەت واتە بۆ دەبێت من ئەخلاقییانە بژیم، منیش دەڵێم هیچ دەلیلێکم نییە: ئەمە گریمانەیەکی پێشینی یاخود پرنسیپێکی بنەڕەتییە کە دەبێت خۆت بە باشی بزانی و قبوڵی بکەیت واتە کاتێك ژیانی تۆ دەبێتە ژینێکی ئەخلاقی کە بڕیار بدەیت ئەخلاقییانە بژیت و ئەو جۆرە ژینە بە باش بزانیت.

پ/ پێموایە هیچ کەس کێشەی لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا نییە کە خەڵکی دەبێت بە ئەخلاق بن، بەڵام –

و/ هیوادارم کەس کێشەی لەگەڵدا نەبێت، خۆ ئەگەر کێشەیان هەبوو ناتوانم چارەسەری بکەم. ئەمە پرنسیپی یەکەمە. ئەم پرنسیپە وەك ئەوە وایە کاتێك کەسێك بڵێت جیهانی دەرەکی (واقعی) بوونی نییە. من دڵنیام هیچ قوتابخانەیەکی فەلسەفی هزر (***Thought***) ناتوانێت وەڵامی بداتەوە، واتە ناتوانن

بیسەلمێنن کە جیهانی دەرەکی (واقعی) بوونی هەیە چونکە هیچ دەلیلێك *reason* بۆ ئەوە نییە. کەواتە پێویستە لە بناغەیەکەوە یاخود پرنسیپێکەوە دەست پێبکەین، ئەمە وایلێکردووین من بەرامبەر تۆ دابنیشم و تۆش بەرانبەر من دابنیشیت. من بوونم هەیە و تۆش بوونت هەیە. گفتوگۆیەکی معقول دەکەین. ئێستا ئەگەر تۆ وا وێنابکەیت کە خەون دەبینیت، هەروەها منیش واوێنا بکەم کە خەون دەبینم، ئەو کاتە هەرگیز ناتوانین بیسەلمێنین کە بوونمان هەیە و ئێستا گفتوگۆ دەکەین.

پ/ ئەو گریمانە پێشینەی ئەخلاق کە دەبێت بە ئەخلاق بین و ژیانێکی ئەخلاقییانە بژین جێگای مشتومڕ نییە. بەلاّم ئەمە ئەو جێگەیەیە کە کێشەکە لێوەی دەست پێدەکات.

و/ بەڵێ هەروەکو حافز دەیگوت "عشق لە سەرەتادا سادە دەردەکەوێت، پاشان کێشەی هەمەجۆر لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت". زۆرباشە، ئێمە ئەخلاقمان قبوڵ کردووە، بەلاّم ئەم ئەخلاقە چییە؟، ژیانێکی ئەخلاقییانە بژین چی دەگەیەنێت؟ سوکرات دەڵێت: "ژیانێکی بڕیارلێنەدراو (تاقینەکراوە) شایانی ژین نییە"، ئەمە شتێکی لە بارە بۆ گوتن، بەلاّم چ شتێك ژیانێکی باش – بڕیار لێدراو (تاقیکراوە) پێکدەهێنێت و لە بنەڕەتیشدا بڕیاردان (حکمدان) چییە، لەسەر چ پێوەرێك ئێمە بڕیاردانەکانمان هەڵدەسەنگێنین؟ ئەمانە هەموویان پرسیاری گرنگن و وەلاّمدانەوەیان ئاسان نییە. بێگومان مەودایەکی فراوان و هەمەجۆری قوتابخانەی ئەخلاقی بوونیان هەیە کە ئێمە دەکرێت وەکو خاڵی دەستپێکردن بەکاریان بهێنین و ئەو قوتابخانانە دەکرێت هەڵوێست و شێوازمان دیاری بکەن. بەلاّم خاڵی گرنگ لێرەدا ئەو عەقیدەیەیە کە ئەم شێوازە بێت یاخود هەر شێوازێکی دیکە، دەبێت لە پێگەیەکی ئەخلاقییەوە دەستپێبکەین. دەبێت قوتابخانەیەکی هزر هەڵبژێریت کە لای خۆت پەسەندە. جا ئەرستۆییت، کانتیت، بەرژەوەندیخوازیت، یاخود ئەخلاقناسێکیت و. بەهەر شێوەیەك بێت، دەبێت ئەو پێگەیە نیشان بدەیت کە تیا وەستاویت و لێوەی دەستپێدەکەیت. لە ڕەخنەی ئەخلاقیشدا، تۆ دەبێت لە پێگە ئەخلاقییەکەی خۆتەوە مامەڵە لەگەڵ فیقهو دەسەلاّت و ئاین و بابەتەکانی دیکەدا بکەیت و لەسەر ئەم بناغەیە ڕەخنەیان بکەیت. بێگومان ڕەخنەکردنی شتێك مانای تیشك خستنەسەر ئەو شتەیە نەوەکو لەکەدارکردنی..

پ/ ئەگەر کەسێك بکرێت بڵێت ڕەخنەکردن *Criticism* میتۆدێکە، ئەو کاتە دەکرێت بڵێین ڕەخنەی ئەخلاقی میتۆدی جێبەجێکردنی (تطبیق) بەهاکانە *Values*، بەدەربڕینێکی باشتر، ڕەخنەی ئەخلاقی واتای بەکارهێنانی شێوازێکی بڕیاری بەهایە تا چەند ئەم پێناسەیەت قبوڵە؟

و/ ڕەخنە خۆی لە خۆیدا میتۆد نییە، ڕەخنە میتۆدی هەیە. واتە ڕەخنە دەبێت لەسەر بنەمای میتۆدێك جێبەجێبکرێت. واتە بریتییە لە کارکردن لە پێگەیەکی دیاریکراوداو پڕچەك بوون بە بیرۆکەکان و چەمکەکان و بڕیارەکان (حکم *Judgments*) و پاشانیش جێبەجێکردنی ئەم بیرۆکەو چەمك و بڕیارانە

بەسەر ئەو مادەدا کە ڕەخنەدەکرێت، ئەو کاتە بڕیارێکی پتەو دەکرێت دەربکرێت. بێگومان، ڕەخنە جارجار بەکاردەهێنرێت بۆ ئاشکراکردنی دژیەکییە ناوخۆییەکانی سیستەمێك و هەندێك جاریش هەڵوەشاندنەوەو پارچەپارچەکردنی سیستەمێك هەر بە ڕەخنە ناودەبرێت. هەموو ئەمانە ڕەخنەن. بۆ نمونە، سەردەمێك هەبوو خەڵکی ڕەخنەی مارکسیزمیان دەکرد لێرەو لەوێ و دژیەکییە ناوخۆییەکانی سیستەمەکەیان ئاشکرادەکرد. ئەو کەسانە سەرقاڵی ڕەخنەکردنێکی فەلسەفی بوون. دەیانگوت هەندێك لە پێکهاتەکانی قوتابخانەی هزری مارکسیزم پێکهاتەی لاوەکین بە گوێرەی ئەو پرەنسیپە فەلسەفییە دیاریکراوانەی بەکاریان دەهێنا. هەندێك جاریش ڕەخنەی ئەخلاقیان بەسەر مارکسیزمدا جێبەجێ دەکرد. دەیانگوت مارکسیزم دواجار تەرکیزکردنێکی بەهێز لەسەر هێزی دەوڵەت دێنێتە کایەوەو ئەم تەرکیزکردنەش دیکتاتۆریەتێکی ترسناك دروست دەکات.

پ/ دەتوانم لە ئاستە تیۆرییەکەدا لەوە تێبگەم کە دەیڵێیت، بەڵام کاتێك دەمهەوێت ئەم ووتانە بخەمە بواری کردارییەوە لە بارێکی بەرجەستەدا، دووچاری کێشە دەبم، دەتوانیت کەمێك بە زاراوەی بەرجەستەتر درێژەی پێبدەیت؟

و/ کاتێك لە بارەی ڕەخنەی ئەخلاقی فیقه یاخود سیاسەتەوە قسەدەکەم، بە کورتی هەوڵدەدەم تیۆرییەکان بخەمە بواری کردەییەوە. بۆ نمونە دەپرسین: ئایا سیستەمێکی فەرمانڕەوایی ولایی (فەرمانڕەوایی کردن لەلایەن فەقیهێکەوە) بەدکاری (ڕەزیلەتی) تایبەتی بەرهەم دێنێت یاخود نا؟ ئەمە ڕەخنەکردنێکی ئەخلاقی سیستەمی سیاسی ولاییە. ئەگەر ئێمە توانیمان لە ڕێگەی زانستی ئەخلاق و کۆمەڵناسی و هۆکار و دەرەنجامی کۆمەڵایەتییەوە نیشانی بدەین کە سیستەمی ولایی، بە مەبەستەوە بێت یاخود بێ مەبەست، ڕەزیلەتی یاخود فەزیلەتی تایبەتی خۆی بەرهەم بێنێت لە کۆمەڵگادا، ئەوا ڕەخنەکردنێکی ئەخلاقی سیاسەتمان لە وڵاتەکەماندا کردووە. هەمان شتیش دەتوانرێت بووترێت لەسەر ڕەخنەکردنێکی ئەخلاقی ستەمکاری. هەروەها ڕەخنەکردنێکی ئەخلاقی دیموکراسیش بەهەمان شێوە دەبێت.....

ئەمڕۆ، هەندێك لە پیاوانی ئایینی ڕەخنەکردنێکی ئەخلاقییانەی دیموکراسی دەخەنەڕوو. دەڵێن دیموکراسی جۆرێك لە ئازادی و بەرەڵلایی بەرهەم دێنێت و ئەم بەرەڵلاییەش دەبێتە هۆی خستنەوەی ڕەزیلەت و کرداری نا ئەخلاقی کە ئێمە پێمان وایە لە ڕووی ئەخلاقییەوە شایانی ڕەخنەکردنن. ئەمە ڕخنەکردنێکی ئەخلاقییانەی دیموکراسییە. کەواتە ئەگەر ئەو ڕەخنەکردنە ڕاست بێت، ئەوا بەراستی ڕەخنەکردنێکی ئەخلاقییانەی دیموکراسییە.

ئەمڕۆ، هەندێك لە بیریارە ڕۆژئاواییەکان و شوێنکەوتووانی هابرماس بەتایبەتی ڕەخنەی مۆدێرنیتە دەکەن. دەڵێن مۆدێرنیتە ئەو پەیمانانەی پێیداوین نەیهێنایە دی. هەروەها ئەمەش ڕەخنەکردنێکە. تۆ پەیمانت داوە جیهان خۆشگوزەرانتر بکەیت، مافە شیاوەکانی خەڵکی دابین بکەیت، کۆلۆنیالیزم نەهێڵیت،

جەنگ لە نێوان نەتەوەکاندا بنەبڕ بکەیت.. بەڵام پەیمانەکانت نەهێنایەدی...

پ/ سەددەرسەد دەتوانرێت هەمان ڕەخنە ئاراستەی ئایین بکرێت. کەسێك دەکرێت بڵێت ئایین پەیمانی زۆر شتی داوە بە خەڵکی بەڵام نەیتوانیوە بیانهێنێتەدی.

و/ ئەمە خوێندنەوەیەکی مەکسیمالیستیانەی ئایینە واتە ئەو ئاینەی زۆرترین فرمان (وەزیفە) لە کۆمەڵگادا ڕادەپەڕێنێت و دەستدەخاتە هەموو کایەکانی دەرەوەی خۆی. من شەخسی خۆم باوەڕم وایە ئایینەکان پەیمانی چەند شتێکی کەمیان بە خەڵکی داوە. بەڵام ئەوانەی خوێندنەوەیەکی مەکیسمالیستیانەی ئایینیان بەلاوە پەسەندە باوەڕیان وایە ئایینەکان پەیمانی زۆر شتیان داوە بە خەڵکی چی لەم دنیا و چی لەو دنیا. ئەم ڕاڤەکردنەی ئایین دەکرێت ڕەخنە بکرێت. کەسێك دەکرێت بڵێت چی بەسەر ئەم هەموو پەیمانانەدا هات؟ خەڵکی بۆ چەندان هەزار ساڵ باوەڕیان بە ئایینەکان هێناوە. ئایا ئەو پەیمانانەیان بۆ هاتۆتەدی کە ئایینی ئەوانەی داوای ئەوپەڕی شت دەکەن (*Maximalists*) پەیمانی پێدابوون؟ ئایینی ئەمانە زۆر ئاسانە بدرێتە بەرهێرشی ڕەخنە. ئەمە ئەوەیە من دەیڵێم. یەکێك لە ڕێگاکانی کەمکردنەوەی ئەم ڕەخنانە بریتییە لە پەیماندان بە شتانێکی کەم. ئەمە زۆر گرنگە. چەندە پەیمانەکان کەمتربن، زیاتر پەیمانەکان دەپارێزرێن و وەڵامدانەوەی ڕەخنەش ئاسانتر دەبێت.

پ/هێشتا ناتوانم لە هەموو ئەو زاراوانە تێبگەم کە پەیوەندی بە ڕەخنەی ئەخلاقییەوە هەیە. ڕەخنەی ئەخلاقییانەی دەسەڵات کە زۆر بە دوور و درێژی لە بارەیەوە دواویت، ئەم ڕەخنەیە هەوڵدانە بۆ نیشاندانی ئەوەی چۆن بونیادی دەسەڵات یاخود هێز (*Power*) نادادپەروەری *Injustice* بەرهەم دێنێت و دەبێتە هۆی ستەمکاری *Tyranny*، وە چۆن ئەم ستەمکارییە ڕەزیلەتەکان بەرهەم دێنێت. ئەم مەسەلەیە واتە دەسەڵات (هێز) چۆن لە باری ئاییندا دەکەوێتەوە؟ ئەگەر مەبەستمان لە ئایین بریتی بێت لە تێگەیشتنی ئایینیانەی خەڵك یاخود دەرککردنی بابەتە ئایینیەکان، ئەو کاتە ڕەخنەکردنی ئەخلاقییانەی ئایین پێویستی بەچی دەبێت؟..

و/بابەشێوەیەکی دیکە پێناسەی ئایین بکەین. دژنیم بەو پێناسەیەی تۆ کردت، بەڵام پێموایە لە بابەتگەلێکی ئاوەهادا زۆر بە تەسکی ئاینت پێناسەکردووە. لانیکەم ئایین دوو دیوی هەیە: یەکێکیان ناوەکییە *Internal* و ئەوی دیکەیان دەرەکییە *external*. دیوە ناوەکییەکەی ئایین پەیوەندیدارە بە ئەزموونە ئایینیەکانی خەڵکی و ئەو ڕاستییەوە کە خەڵکی خۆیان بە بەندەی خودا دەزانن و جۆرێکی تایبەتی ئەخلاق لەناو خۆیاندا گەشە پێدەدەن. ئەم دیوە ناوەکییەی ئایین کایەی ئیمان *Faith* عەقیدە *Belief* و ئەزموونی ئایینی دەگرێتە خۆی و وا لەو تاکە دەکات سروشت و کەسایەتییەکی تایبەتی و پەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ بووندا هەبێت. بەڵام دیوە دەرەکییەکی دینداری شتێکی دیکەیە. کاتێك هەمان ئەو تاکانەی ئەزموونی ئایینی و سروشتێکی تایبەتیان هەیە، لەگەڵ یەکدیدا کۆدەبنەوەو لە هەمان

کۆمەڵدا دەژین، ژیانی دەرەکیان بارودۆخێکی تایبەتی وەردەگرێت، لەبەرئەوە ڕەوشی ژیانیان جیاوازە لەو خەڵکانەی کە هەمان دیدیان نییە. ئەم دیوە دەرەکییە کە دیوە ڕێکخراوەکەی ئایینە، شوناسێکی کۆیی بۆ باوەڕداران دروست دەکات و ئەم شوناسە کۆییەیە بە تەواوی پشت دەبەستێت لەسەر پابەندبوون بە کۆڕێکی یاخود کۆبوونەوەیەکی تایبەتی ئەو تاکانە. ئەمەیە دەبێتە هۆی دروستبوونی زنجیرەیەك عەقیدەو و بیرو بۆچوونی نوێ کە بە هیچ شێوەیەك لە دیوە ناوەکییەکەی ئاییندا نابینرێنەوە. لەسەر بنەمای ئەم ڕوونکردنەوەیە، هەردوو دیوەکەی ئایین دەکرێت بکەونە بەر ڕەخنەی ئەخلاقی.

پ/ بە چ مانایەك؟ مەبەستتە بڵێیت لەسەر دیوە ناوەکییەکەی ئایین دەتوانین ڕەخنەی ئەزموونە ئایینییەکانی باوەڕداران بکەین و لەسەر دیوە دەرەکییەکەشی..

و/ نمونەیەك دەهێنمەوە. لە سەردەمی هاوچەرخدا، بەناوبانگترین ڕەخنەگرەکانی دیوی ناوەکی ئایین بێ باوەڕە بونگەراکان بوون. بونگەراکان باوەڕیان وایە کە ئایین بەو مانایەی پەیوەندی نێوان خوداو بەندەکانی بێت زۆر نائەخلاقییە چونکە ئەم پەیوەندییە وادەکات مرۆڤی سنوردار لەبەردەم خودایەکی بێ سنوردا دابشکێت بۆ سفر. ئەم پەیوەندییە مرۆڤ کەم دەکاتەوە بۆ ئاستی سفر بۆ ئەوەی خودایەکی بێ سنور بهێنێتە ناو بوون و ژیانی خەڵکییەوە. ئەوان ئەم پەیوەندییە بە نائەخلاقی دەبینن و دەڵێن بۆ ئەوەی مرۆڤ بە مرۆڤی بمێنێتەوە، پێویستە بێ خودا بێت و واز لە خودا بهێنێت.

ڕەخنەکردنی ئەخلاقییانەی ئایین لەلایەن ئەم بیریارە بونگەرانەوە لەسەر ئەوە بەندە کە مەحاڵە هاوتەبایی و هاوژیانییەك لە نێوان بوونێکی بێ سنورو بوونێکی سنورداردا دروست ببێت. دەڵێن کاتێك خودایەکی بێسنور دەچێتە ناو مرۆڤی سنوردارەوە، ئەو کاتە مرۆڤ ناچار دەبێت هەڵبێت و هیچ لە پاشی بەجێنامێنێت واتە لە مرۆڤبوون دەکەوێت.

هەروەها ڕەخنەکردنە ئەخلاقییەکانی دیوە دەرەکییەکەی ئایین هێندەی مانگی سەر لە ئێوارە ئاشکرایە. مارکسستەکان بەشێوەیەك ڕەخنەی ئایینی ڕێکخراو (دیوە دەرەکییەکە) دەکەن و لیبراڵییەکانیش بەشێوەیەکی دیکە. زۆرێك لە خەڵکی ڕایان وایە کە بنەڕەتخوازی *Fundamentalism* لە ئایینی ڕێکخراوەوە سەرچاوە دەگرێت. خوالێخۆشبوو د. عەلی شەریعەتی باوەڕی وابوو چینی روحانیەت *Clergy* سەر بە ئایینی ڕێکخراوە، ئەم دیوەی ئایینی ڕەخنەدەکرد واتە دیوە دەرەکییەکەی. ڕەخنەکردنە ئەخلاقییەکانی دیوە دەرەکییەکەی ئایین لە دواجاردا هەوڵدانە بۆ نیشاندانی ئەو بەدکارییانەی کە ئایینە ڕێکخراو یاخود دامودەزگاکراوەکان گۆشکراون پێی و ئەو بەدکارییانەی ئەو ئاینانە بەرهەمی دێنن.

پ/ ئەو پێودانگانە *Criteria* چین لەم ڕەخنە ئەخلاقییانەدا بەکاردەهێنرێن؟ واتە ئەو ئامرازە چییە ڕەخنەگرە ئەخلاقییەکان بەکاری دەهێنن؟ حیکمەتی کۆییە یاخود داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان، بنەما مێتافزیکییەکان یاخود شتێکی ترە؟ بنەمای بڕیاردانە – بەهاییەکانیان چییە؟

و/ ئێمـــه سیـــستەمێك دەخەینـــه بـــەر ڕەخنـەکردنێکی ئـەخلاقی و بنەماکـەی لەسـەر ئـەو پێودانگـه ئەخلاقییانـه دەبێـت کـه ئێمـه باوەڕمان پێیەتی-

پ/ ئـەم پێودانگانـه ڕۆشـن دەرناکـەون و لێڵییەکی پێوه دیاره.

و/ ســەیرکه، ئێمــه باوەڕمــان وایــه کــه شکۆمەندی مرۆڤەکان دەبێت بپارێزرێت و ڕێزی لێبگیرێـت. ئێـستا ئەگــەر شـتێك هــاتوو و مرۆڤـەکانی شـکاند و لەکـەداری کـردن، ئێمـه ڕەخنـەکردنێکی ئـەخلاقی ئـەو شـته دەکـەین و دەڵێین ئەو شته بەدکاری بەرهەم دێنێت. ئێمه دەڵـێین سـتەمکاری خراپـه چـونکه شـکۆمەندی مرۆڤـەکان دەشـێوێنێت و لەکـەداری دەکـات. خوالێخۆشـبوو عەللامــه موحەممــەد ئیقبــال ڕەخنـەی کۆیلایـەتی *Slavery* دەکرد لەسـەر ئـەو بنەمایـەی لـه کۆیلایەتیـدا، مرۆڤـەکان لەکـەدار دەکرێن و دەشکێنرێن، پیرۆزیان، شکۆمەندی و گــــەورەییان دادەشــــکێته ســــفر. خۆتــــان دەزانــن، کانــت بــاوەڕی وابــوو مرۆڤــەکان ئامــــانجن *End* نــــەك ئــــامراز *mean*. ئەمــــه پرنـــسیپێکی ئەخلاقییـــــه لـــــه سیـــــستەمی فەلسەفی کانتـدا. ئەگـەر ئـەم پرنـسیپەت قبـوڵ بێــت ئــەوا لەســەر ئــەم بنەمایــه دەتوانیــت ڕەخنــــەی هــــەر سیــــستەمێك بکــــەیت کــــه مرۆڤــەکان بــه ئــامراز دادەنێــت و ئامرازانــه تەماشـایان دەکـات و دەتوانیـت بڵێیـت ئـەو سیـستەمه نائەخلاقییـه. بـه کـورتی، پێویـسته پێـودانگ بـۆ ڕەخنەکردنـه ئەخلاقییەکـەت لـەو سیـستەمه ئەخلاقییـەوه وەربگریـت کـه خـۆت تیایدا هاوبەشیت..

پ/لـه چـاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامـەیی نوێـدا، خۆت وەکو *Nominalist*[1] وەسف کردووه. ئایا هــیچ ناکۆکییــەك بــوونی نییــه لــه نێــوان بیرۆکـــــەکانی *Nominalism* کـــــه مەســـــەله گـشتییەکان تـەنها وەکـو نـاو تەماشـا دەکـات لەگـەڵ ئەخلاقدا کـه لـه بنەڕەتـدا مامەڵـه لەگـەڵ مەسەله گشتییەکاندا دەکات؟.

و/ بـا کـەمێك شـتەکان ڕونبکەمـەوه، لـەو چــاوپێکەوتنەو ژمارەیــەك لــه ووتارەکانمــدا وتومــه: پێموایــه دیــدەکانم نــزیکترن لــه *nominalism*. نزیکەی بیست ساڵێك لەمەوپێش وا بــیرم دەکــردەوه کــه چــیرۆکی واقعگــەرایی *realism* باشتره لەناوگەرایی. بەهەر جۆرێك بێت بڕیارم دا که دەبێت پێگەیەك بۆ خۆم له نێوان ئــــەم دوولایــــەدا هەڵبــــژێرم چــــونکه ئەمــــه مەســـەلەیەکی زۆر بنـەڕەتی و جەوهەرییـه. بـۆ چــــەندان ســــاڵ ئارگیومێنتــــەکان و هــــزری هەردوولام بۆ ئەم مەسەلەیه تاووتوێ کرد. له کۆتاییـــدا، بـــەرەو ناوگـــەرایی هـــاتم، یـــاخود گونجاوتره بڵێم: ناوگەرایی بۆ من زیاتر جێی دڵخۆشـییه، پێویـسته ئـەوەش بڵـێم ناوگـەرایی فرەیـــی *plurality* لـــه جیهانـــدا باشـــتر ڕوون دەکاتـەوه. ئـەم ناوگەراییـه بـه ڕەهـایی زەرەر لـه ئــەخلاق و بــەها ئەخلاقییــەکان نــادات. بــه دەربڕینێکی تر، بەها ئەخلاقییەکان لە جێگای خۆیان دەمێننەوه.

پ/ وا دەردەکـــــــەوێت هـــــــــەردوو پێگەکــه (*Nominalism* و واقعگــەرایی) وەکــو یـــەك قبـــوڵ دەکـــرێن، یـــاخود دەشـــێت بڵـێم وەکویـەك ڕەت دەکرێنـەوه. هـەردووکیان دژیەکن، وانییه؟

و/ بەڵێ، دژیەکن. دەتوانین هەر دەلیلێك دژی واقعگەرایی بیهێنینەوە بەرامبەر بکەین لەگەڵ دەلیلێك دژی ناوگەرایی دەیهێنینەوە. مەسەلەکانیش لە بواری مێتافزیکادا، هەر بەم شێوەیەن. لە فەلسەفەی مێتافزیکادا، بەدەستەوەدانی بەڵگەی بەرجەستە مەحاڵە. هەر لەبەر ئەمەش، کەسێك لەسەر بنەمای بەڵگەهێنانەوە ناتوانێت ببێتە واقعگەرا یاخود ناوگەرا. هەرگیز فەلسەفە ئەم پرسەی پێ چارەسەر ناکرێت. ئەمە ئەوەیە ویتگنشتاین بەردەوام دەیووت و پێموایە زۆر راستە: "فەلسەفە هەموو شتەکان لە جێگای خۆیدا بەجێدەهێڵێت". واتە هیچ شتێك لەم جیهانە ناگۆڕێت یاخود جێگای پێ چۆڵ ناکات.

باوەڕم وایە ئەم پێناسەیە زۆر راستە لە بارەی فەلسەفەی مێتافزیکاوە. ئەو پرنسیپە مێتافزیکییەی تۆ باوەڕت پێیەتی هەر چییەك بێت، جیهانی دەرەکی هەر بە جیهانی دەرەکی دەمێنێتەوەو رووداوەکانیش بەهەمان رووداو دەمێننەوە.

بە نیسبەت ئەخلاقیشەوە هەمان شت راستە. واتە دەتوانم بڵێم لە کایەی مێتافزیکادا لە ناوگەراییەوە نزیکترم. بەڵام ئەمە زەرەر چ بە ئەخلاق یاخود سیاسەت ناگەیەنێت، تەنانەت چەند گرێیەکی کەمیش لەم کایانەدا دەکاتەوە. لە راستیدا فەلسەفە هەمان ئەو گرێ کردنەوەیە، بەو مانایە نا ئێمە چاوەڕوانی ئەوەمان هەبێت هەموو گرێکان بکرێنەوە چونکە ئەگەر فەلسەفە هەموو گرێکان بکاتەوە ئەو کاتە فەیلەسوفەکان بێکاردەبن. ئەگەر رۆژێك هات هەموو ئەو گرێیانەی ئێستا بوونیان هەیە کرانەوە، ئەو کاتە فەیلەسوفەکان خۆیان یەکەم کەس دەبن هەندێك گرێی تازە دەخوڵقێنن بۆ ئەوەی فەیلەسوفەکانی داهاتوو بتوانن بیانکەنەوە.

پ/ بەهەر جۆرێك بێت، شێوازە تایبەتییەکەت بۆ ئەخلاق جێی گرنگی پێدانە. تۆ دادپەروەری (عەدالەت *justice*) وەکو سەرجەمی فەزیلەتە ئەخلاقییەکان تەماشا دەکەیت. پاشان، تۆ پێتوایە کە درۆکردن و راستگوتن بریتین لە ناوی سروشتی کردارەکانو دەشڵێیت درۆ یاخود راستی دەکرێت خۆیان دادپەروەرانە یاخود نادادپەروەرانە بن. وا دەردەکەوێت ئەم شێوازە تا رادەیەك ئەرستۆییە، بیرۆکەکانی ناوگەرا دەتوانن بچنە مەیدانەکەوەو کاریگەری پۆزەتیڤ یاخود نێگەتیڤیان هەبێت.

و/ بەڵێ ئەمە پێگەی منە کە ئاماژەت پێدا. باوەڕم وایە دادپەروەری فەزیلەتێکی زیادەیە بەو مانایەی خۆی لە خۆیدا فەزیلەت نییە. دادپەروەری خۆی بەهایەکی ئەخلاقی نییە، بەڵکو سەرجەمی بەها ئەخلاقییەکان عەدالەتە (دادپەروەری)ە بێگومان، هەر چەندە ئەم پێگەیە ئامادەمان دەکات بۆ رەخنەکردنی ئەخلاقییانە، بەهیچ شێوەیەك شێوازی رەخنەکردن ناشێوێنێت.

پ/ لەسەر ئەم بنەمایە، وا دەردەکەوێت تۆ ئەخلاق بە شتێك دەزانیت ئایین تێدەپەڕێنێت یاخود بەهێزترە لە ئایین، یاخود لانیکەم تۆ ئایین بە سەرچاوەی ئەخلاق نازانیت. لێرەوە ئەم پرسیارە دروست دەبێت: سەرچاوەکانی ئەخلاق چین و بناغەکانی لە کوێدان؟

و/ بەو دەلیلەی کە ئەخلاق پەیوەندیدارە بە ڕەفتاری مرۆڤەوە، ئەگەر مرۆڤەکان نەبن، ئەخلاق بێ مانایە. ئێمە ڕەفتاری ئاژەڵ ئەخلاقیانە ڕەچاو ناکەین چونکە ئەوان مرۆڤ نین. ڕەفتاری ئاژەڵ ملکەچی چاکەو خراپە نابێت، هەمان شتیش دەتوانرێت لە بارەی فریشتەکانەوە بگوترێت چونکە ئەوان مرۆڤ نین بەو مانایەی چ ئاژەڵ و چ فریشتە ئیرادەیان نییە وەکو مرۆڤ. بەڵام کاتێك باسی مرۆڤ دەکەین، ڕەفتاریان ئەخلاقییانە مامەڵەی لە تەکدا دەکرێت چونکە مرۆڤەکان نیەتی چاك و خراپیان هەیە و لە "دەبێ *Ought*" و "نابێ *ought not*" تێدەگەن. لێرەوە، بناغەی ئەخلاق واتە ئەو شتەی وای لە ئەخلاق کردووە شیاو بێت بوونی مرۆڤەکانن. ئەگەر لەبەر بوونی ئەم بوونەوەرە (مرۆڤ) نەبێت، ئەخلاقیشمان نابێت. ئەمە بنەمای ئەخلاقە. هەروەها ئەو پرسیارەی دەڵێت: "دەبێ" و "نابێ" لە کوێوە سەرچاوە دەگرن یاخود چاکە *good* و خراپە *bad* مانای چی دەگەیەنن و سەرچاوەی ئەرك *duty* چییە، ئەمە خۆی مشتومڕێکی باووزاڵە لە فەلسەفەی ئەخلاقدا، لەسەر ئەم پرسیارانە قوتابخانە جیاوازەکان وەڵامی جیاواز دەدەنەوە، لەبەرئەوەی هەریەك لەو قوتابخانانە بنەمایەکی جیاوازی هەیە بۆ ئەخلاق.

پ/ ئەم پرسیارەم بۆیە کرد چونکە دەزانم تۆ پێتوایە شێوازی هەڵسوکەوت و ئەخلاقی جیاواز هەیە. بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئێمە دەڵێین شێوازی هەڵسوکەوتی جیاواز هەیە، ئایا دەتوانین پێداگری نەکەین کە کۆمەڵگای نامەدەنی شێوازی هەڵسوکەوتی تایبەتی خۆی هەیە یاخود سیستەمێکی ستەمکاریش شێوازی هەڵسوکەوتی تایبەتی خۆی هەیە؟ لەسەر ئەم بنەمایە، چۆن دەتوانیت بزانیت کۆمەڵگای مەدەنی *Civil society* ئەخلاقیترە لە کۆمەڵگای نامەدەنی *Non – civil society*.؟

و/ بەڵێ بە دڵنیاییەوە، شێوازی جیاوازی ڕەفتار و ئەخلاقی جیاوازمان هەیە. هەموو کۆمەڵگایەك شێوازی ڕەفتاری تایبەتی خۆی هەیە. بەڵام بیرت نەچێت: لە کۆمەڵگایەکی مەدەنیشدا نمونەی ڕەفتاری نەشیاوو نا ئەخلاقی و سەقەت دەبینین. ووتومە شتانێك هەن ئێمە بە شتانێکی نائەخلاقیان دەزانین وەکو ستەمکاری. بە دڵنیاییەوە نائەخلاقییە چونکە ئەو شتانە بەشێوەیەکی گواستراوە دەبنە هۆی دروستبوونی نادادپەروەری. ئێمە لە بارەی ئەم مەسەلەوە بە درێژی قسەمان کردووە. ئەمە گریمانەیەکی بنەڕەتییە، واتە ئەم شتانە لای ئێمە هیچ نین جگە لە نائەخلاقیەت و ڕەفتار سەقەتی. ئەم گریمانەیە هاوتایە لەگەڵ گریمانە بنەڕەتییە یەکەمییەکە: "پێویستە ژیانێکی ئەخلاقییانە بژین"..

**پەراوێز:**

1– باوەڕێکی فەلسەفییە کە دەڵێت هیچ واقعێك لە دەرەوەی بابەتەکانی تاکە کەسەوە نییە.

**سەرچاوە:**

www.drsoroush.com

# عەشق لە کۆمەڵگەیەکی بزۆکدا

سازدانی: سیگروم داڤید سدوتیر[1]
لە سویدییەوە: هیوا قادر

من زیگمونت باومانم لە خانوویەکی جوانیی ناو باخچەیەکی کێوییدا بینی، کە کەوتبووە سەر شەقامێکی هێمنی دەرەوەی ناوچە سەر سەوزەکانی لیدس، لەم ماوەی 32 ساڵەی ڕابردوودا ئەوێ هەمیشە شوێنی ژیانی ئەو بووە. بەربڵاوی کتێبە چاپکراوەکانیشی ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کە توانای بیرکردنەوەکانی باومان لەو جوڵە فیزیکییەی دەوروبەریەوە وەردەگرێت.

زیگمونت باومان یەکێکە لە هەرە کۆمەڵناسە ناسراوەکانی ئەوروپا، پێشتر پرۆفیسۆر بووە لە زانکۆی (لیدس) و دکتۆرای فەخری هەیە لە زانکۆی کۆپنهاگن. ئەو ئامادەبوونە ئارامەشی کە هەیەتی بەراورد بە نارێکی ژیانی وەك جولەکەیەکی پۆڵۆنی جیاوازن لە یەکتری.

باومان لە ساڵی 1925 لەدایك بووە. دوای ئەوەی کە پرۆفیسۆرییەکەی لە ساڵی 1968 لێسەندراوەتەوە، هەقی نیشتەجێبوونی لە ئیسرائیل پێدراوە، بەلاّم ئەو نەتەوە پەرستییەی کە لەوێ هەبووە لەگەڵ ئەودا نەگونجاوەو ژیانی ئارام و هێمنی لیدس زیاتر بۆ ئەو لەبارتر بووە.

هەندێ نووسینی لەسەر قەتل و عامکردن نووسیوە لەوانە (ئەوشویز و کۆمەڵگەی مۆدێرن) ساڵی 1989، لە کتێبی *Intimations of Postmodernity* کە خوێندنەوەی خۆی لەسەر مۆدێرنیتەو پۆستمۆدێرن خستۆتە ڕوو وە لە ساڵی 1992دا نووسیویەتی. هەروەها (ئیتیکی پۆستمۆدێرن) ساڵی 1993، لەگەڵ چەندەها کتێبی تردا کە ئەمانە چەند نموونەیەکیان بوون.

(*Liquid Love – on the Frailty of Human Bonds* 2000) ئەمە ناونیشانی دواهەمین کتێبێتی، بەلاّم لەم کتێبەدا هیچ ڕێپیشاندانێکی ئەوتۆی تێدا نییە کە چۆن بە باشترین شێوە ڕووبەڕووی عەشق ببیتەوە، لەم جۆرە کتێبانەدا

شتێکی ئەوتۆی نییە تا لەم بارەوە بیانڵێت. لە کاتێکدا کە لە تەمەنی بیستساڵیدا بووە دوای تێپەڕینی هەشت ڕۆژ بەسەر یەکەم بینینی خاتوو (یەنینا)دا چۆتە داخوازیی و لەو دەمەوە تا ئێستا پێکەوە دەژین. (یەنینا) نووسەرەو سەبارەت بە ژیان لە گیتۆدا لە کاتی جەنگدا نووسیویەتی. باومان دەیەوێت من ئەویش ببینم، کاتێکیش کە پێیناساندم یەنینا زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و باومانیش لە ڕووی نازەوە دەستی بە روخساریدا هێناو ووتی کە یەنینا لە ژیانیدا گەورەترین هاندەریبووە.

کۆمەڵناس لە دەرەوەی تیۆری مەعریفەوە بە یەقینەوە بە تەنها نایەت لەسەر عەشق بنووسێت – بەڵام باومان لە کتێبەکاندا لێکۆڵینەوە لەسەر مەرجەکانی عەشق لە زەمەنێکدا دەکات کە گۆڕان مەرجێکی نەگۆڕە و هەر دەبێت ڕووبدات.

**بۆچی کۆمەڵناسێك دەبێت خۆی سەرقاڵ بکات بە عەشقەوە؟**

من خۆم بابەتەکانی خۆم هەڵدەبژێرم. باومان ئەم ڕستەیەی بە هێمنییەوە ووت و پشتی بە کورسیەکەیەوە داو بە ئارامی کەوتە مژڵێدانی پایپەکەی دەستی. زمانە ئینگلیزیەکەشی کە قسەی پێدەکرد ئەکسێنتێکی پۆڵۆنی هەبوو.

–من دوای هیچ پرۆژەیەك ناکەوم، من لە سۆسیۆلۆژیادا ڕستەیەکی ئەلبێرت کامۆم هەمیشە لە مێشکدایە کە دەڵێت: جوانی هەیە و قیژە قیژیش هەیە، من دەمەوێ هەوڵبدەم وەفاداربم بۆ هەردووکیان. من هەوڵ بۆ ژیانێکی پڕ مانا دەدەم، تا بتوانم ژیانی ئەوانی تر باشتر بکەم. تەمەننا دەکەم بتوانم بەشدارییەك بۆ ڕۆحەکان بهێنمە دی، ئەمەش من بە بەرزترین پلە دایدەنێم لە ژیانمدا. بە خۆشییەوە دەمەوێ بەشداری لە بەشێك لەو جوانییەدا بکەم، چونکە من نامەوێت ئەو کەسانە شەرمەزار بکرێن کە بوونیان هەیە و کەچی لە ژیانێکی بە حورمەت بێبەریکراون، ئەو کەسانەی کە هەروەك گیاکەڵە سەیر دەکرێن و هەروەکو گیاکەڵەش ڕیشەکێش دەکرێن. کتێبی *Liquid Love – on the Frailty of Human Bonds* بەشێوەیەك لە شێوەکان کورتەیەکن لە بیرکردنەوەکانی من لەسەر جوانی لە ماوەی ئەم پانزە ساڵەی ڕابردودا. لە پایزیشدا کتێبی ( *Wasted Lives – Modernity and its Outcasts*) دەردەچێت کە خستنەڕووی تێڕوانینەکانی تری منن.

–کۆمەڵگەی ئێمە ڕێژەیەك لە زبڵ بەرهەم دەهێنێت. لە کارگەکانەوە هەم شمەکی جوان و هەم زبڵیش دەگوێزرێتەوە. کاتێ کە لە تێرمەکانی ئابوریدا باس لە بەرهەم دەکرێت وەك کۆی داهاتی نەتەوەیی (*BNP*). خێرا ئێمە تەنها سەیارەی بارهەڵگر لەگەڵ شمەکگەلێکی جواندا دەبینین. بەڵام لە هەمان کاتدا مرۆڤی پاشماوەش بەرهەمدەهێنێت. هەموو بەعەقڵانی کردنێك واتا لەدەستچونی کار بۆ چەند کەسێك و بەزبڵبوونی چەند کەسێکی تر، هەروەك چۆن لە شوێنی بەرهەمهێنانی کتێبدا تۆ کتێبت هەیە و لە هەمانکاتیشدا کاغەزی زیادە و بڕاوت هەیە بۆ فرێدان. کردنی مرۆڤیش بەم شێوەیە بە پاشماوەو زبڵ واتا ئینکارکردن لە بەهای ئینسان بوونی ئەو کەسانە.

نیـوەی مرۆڤایـەتی هـەلی هەڵبـژاردنی لـە دەستدا نییـە. لـە زیندانێکدا دەژی بـێ دیـوار. زۆرجـار لـە شـاری گـەورەدا شـوێن هەیـە کـە ئینسان رێـی تێناکـەوێت، مـن ئـەو شوێنانە بـە (نـا، چـوون) ناودەبـەم، تایبەتمەنـدی شـتێکی هەڵخەڵەتێنــەرە. ئــەوەی لــەو شــوێنە نــەژی رێیناکەوێتـە ئـەوێ، وە ئەوانەشـی کـە لـەوێ دەژین نـاتوانن لـەوێ بێنـەدەرێ. دیارە ئەوانـەی لەوێن تەمەنای هاتنەدەرەوە دەکەن بەڵام خۆیـان هیچ توانایەکی هاتنە دەرەوەیـان نییـە. ئەمـەش ئەو جوانی و ناشیرینیەیە کە باسیدەکەم.

ئـەم کتێبـە بـاس لـەو جوانیـە دەکـات کـە زەحمەتـە خۆیـت لێنزیـك بخاتـەوە، بـەڵام لـە کۆتایدا خوێنەران دەتوانن پێیبگەن.

- تۆ لە کتێبەکەتدا باس لەوە دەکەیت کە عەشق کراوە بە شمەکێکی ئیستهلاکی: عەشق هەڵدەبـــژێرێت و دواتـــریش وەك شمـــەکێك تورهەڵدەدرێ. تۆ سەرنجت بەرامبەر ئەو عەشقە چـییە پـێش ئـەوەی بکـرێ بـە شمــەکێکی ئیستیهلاکی؟

–مـن بـاوەڕم بـە میسالیەت نییـە بەڵکـە بـە پێـچەوانەوە لـەو بـاوەڕەدام کـە ئـەم حاڵەتـە هـەرگیز میـسالیانە نـەبووە. بـەڵام پێناسـەی کۆمەڵگەیەکی باش ئەوەیە لەو باوەڕەدابێت کە هێـشتا ئـەو کۆمەڵگەیـە نەبۆتـە کۆمەڵگەیـەکی باش. کۆمەڵگەی دیموکراسی ئەو کۆمەڵگەیەیە کە باوەڕ نەهێنێت بەوەی کە بۆتە کۆمەڵگەیەکی دیموکراسی. کۆمەڵگەی تەواو ئەو کۆمەڵگەیەیە کـە بـاوەڕی بـەوە نـەبێت کـە بەیـەکجاری بۆتـە کۆمەڵگەیەکی تەواو. هەرە خراپترین تێڕوانینی کۆمەڵگەیـــەکیش ئەوەیـــە کـــە پێیوابێـــت کۆمەڵگەیەکــە تــەواو بــاش و دیموکراســی و کاملــە، مەبەســتم کۆمەڵگەیەکــە کــە هــەموو سنوورەکانی بەزاندووە و گەیشتۆتە کەماڵ.

–ئەم حاڵەتە بۆ عەشقیش ڕاستە، من باوەڕم بە عەشقێکی پێرفێکت نییە. عەشق پێویستی بە شەڕێکی یەکبینە هەیە. ئەمەش پرۆژەیەکی دوور و درێـژە و مانـای رێکـەوتن و رێنەکـەوتن دەگەیـــــەنێت، چارەکردنیـــــشی کـــــارێکی زۆر قورسە.

گـەڕان بـەدوای عەشقدا رەجەتەیـەك نییـە بـۆ سـەرکەوتن، لـە ڕاسـتیدا عەشـق بـۆ خـۆی سەرکەوتن و بێ ئومێدییە. ئێستا قسە لەسەر شـێوە ژیـانی (نیـو پێکـەوەیی) دەکـرێ، کـە حاڵەتێکـە داوای مـەرجی خۆبـەختکردن لـەوەی بەرامبەر ناکات، شێوەی (پەیوەندی گرفانی)ی هەیـە ئینسان دەتوانێـت هـەرچ کاتێـك ویـستی لێیدەربهێنێت. بەم شێوەیە سەرکەوتنی تـەواو بەدەستدەهێنێت بە بێ هیچ نائومێدبوونێك.

لە مەخزەنەکاندا دەتوانی شمەکی تر لە بری ئەو شمەکە وەربگریت کە هەتە و بەدڵت نییـە، یان شمەکێك کە پێتوایە تازەترە. هەمان شت بۆ عەشقیش راستە: گەر تۆ رازی نەبیت بەوەی کە هەتە، ئەوا دەیگۆڕیت بە یەکێکی تر کە دەتەوێ هەتبێت. ئەوەی لەسەر ئەم رێچکەیە دەڕوات و پێیوایـە کـە عەشـقیش شـتێکە دەتـوانێ هـەروا ئاسـان بگۆڕێـت و توڕبـدرێت، درەنـگ یـان زوو دووچاری تەنهایی و سەرگەردانی دەبێت.

–هەریـەك لـە ئێمـە پێویستی بـە گروپێك لـە هاوڕێ هەیە، ئەمـەش من بە (تۆڕی پەیوەندی) نـاوی دەبـەم، کاتێـك کـە مـن لاو بـووم بـیرم لـە ناوەنـدێکی هاوڕێیـانی وا دەکـردەوە کـە هێنـدە

قایم و خۆراگر نەبێت و پێچەوانەی ئەو (تۆڕی پەیوەندی)یە بێت کە ئەوسا هەبوو. (تۆڕێکی پەیوەندی) وا کە خۆگرێدان و داپچڕان لێی ئاسانبێت، مرۆڤ بتوانیٚ وەك بەرنامەی کۆمپیوتەر دەست بە (دیلیت)دا بنێت و ئەو ناوانە بکوژێنێتەوە کە دەیەوێت پەیوەندیان پێوە نەبەستێت.

کەسانێك هەن دەبنە قۆزاخەیەك بۆ کەسە تەنهاکان، ئەگەر هاتوو ئەو کەسە تەنهایانە هەست بە دڵنیایی بکەن ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوانیش هەستبکەن بەشدارن، ئەمەش بۆ خۆی چارەسەرکردنێکی باشە. ئینسانی گەنج هەوڵئەدات تا ئەوپەڕی توانا درێژە بە چەندەها پەیوەندی بدات، ئەمەش رەنگە لە رێی عەشقەوە یا کارەوە بیٚ. دیارە ئەم کارە زۆر ئاسان نییە، مرۆڤ پێویستییەکی بەهێزی بە پەیوەندی بەستن لەگەڵ مرۆڤی تردا هەیە، ئەمەش بۆ خۆی کۆنفلیکت دروستدەکات. لەمەشدا جۆرەها گەشەکردن لە پرس و رای تایبەتی و چارەسەرکردنیاندا ڕوودەدات. بەڵام لە راستیدا جیاوازی بیروڕا لە دنیایەکدا دەبێت کە دەبێت ئەو دنیایە دیوێکی لە ئارامیدا بێت و دیوەکەی تری لە جێگۆڕکیٚ کردندا بێت.

- لە مۆدێلە کۆنەکەدا تەڵاق بەشێوەیەك لە شێوەکان نامومکینە، بێگومان ئەمەش حاڵەتێکی نەگۆڕی هەیە، بەڵام لە ڕاستیشدا ئەمە ئەو شتە ڕاستەقینەیە نییە کە ئێستا ئێمە بتوانین خەونی پێوە ببینین؟

هەرکام لەو دوو مۆدێلە، هەم کۆنەکە و هەم تازەکە بریتین لە دوو لایەنی چاکە و خراپە. لایەنی پۆزەتیڤ و نەگەتیڤ لە هەردوو جۆرەکەدا بوونی هەیە، هەردووکیشیان دەبنە هۆی عەزاب. ئەو عەشقە رۆمانسییە کۆنەی کە مەرگ هەردوولا جیادەکاتەوە، تەڵاق تێیدا شتێکی پێشبینی نەکراوەو لە هەمانکاتیشدا جێگای شوورەیی بووە. ئەم بارەش جۆرێك لە چەوساندنەوەی هێناوەتە ئاراوە کە خاوەنی تێڕوانینێکی نەگەتیڤانەیە. ژن و پیاو رقیان لە یەکتری بووە کەچی حوکمیش بووە لەگەڵ یەکتریدا بژین، وە منداڵیش لەگەڵ ئەواندا پێویستبووە ملبدات. لەم بارەدا رێگایەك نییە بۆ چوونە دەرەوە. بەڵام کاتێك ئینسان زانی کە ئیتر هیچ ئەگەرێکی تری نییە رەنگە ئەو کات زیاتر بیەوێت هەوڵبدات رازیببێت و ملبدات. لەم ژیانە مۆدێرنەدا ئاسانە پەیوەندی بەستن، بەسادەیش دەتوانیت لەو پەیوەندییە بێیتە دەریٚ، بەڵام لە بەرامبەر ئەوەدا هیچ هەوڵێك نییە تا ببێتە لەمپەرێك بۆ راگرتن و چاکردنەوەی ئەو پەیوەندییەی کەوا بە باشی ناچێتە پێشیٚ. بۆیە زۆر ئاسانترە کە تەنها خۆت قوتار بکەیت و کەسێکی نویٚ بۆ خۆت بدۆزیتەوە بە قەدەر ئەوەی چارەسەری بکەیت.

- تۆ لە کتێبەکەتدا هێمات بۆ ئەوە کردووە کە ژیانی سێکسیش لەناو ئەو پەیوەندییە جێگۆرکێکەرەدا دەشکێت. چۆن سێکسوالیتێت مەرجە تەسکەکانی خۆی لەناو پەیوەندییە جێگۆرکێکەرەکاندا دادەنێت؟

بێگومان زیاد لە سێکس لەم ژیانە مۆدێرینەی ئێستادا هەیە، بەڵام مەرج نییە ئەمە لە ژیانی پێشتر باشتربێت. من زۆر بە سادەیی باوەڕم بەو رێپیشاندەرانە نییە کە پەیمان

دەدەن ئەم پەیوەندییە لە گرفت ریشەکێش بکەن یان ئۆرگازم پاکبکەنەوە لە گرفتەکان. پێکەوەبوونی دووکەس و سێکس تەنها تەکنیکێکە کە ئینسان دەتوانێت فێربێت.

من باوەڕم بە ڕێپیشاندەری سێکس نییە کە وانەی تەکنیك بدات تا لەو ڕێگەیەوە موعجیزە بەرپا بکات. هەموو ئەوانەی کە لە بارێکی ئازادەوە ئەم کارە دەکەن لە سەرەتاوە بە تەنها خۆیان ئەم پرکێشییەیان کردووە و لە سفرەوە دەستیان پێکردووە، ئامانجیشیان ئەوەبووە بگەنە ڕێگەیەك کە تایبەت بێت بە خۆیان، ئەمەش شتێك نییە ئینسان فێر بکرێت بەڵکو خۆی فێر دەبێت.

- تۆ لە کتێبەکەتدا باس لەوە دەکەیت کە هۆمۆسێکسوالیتی جیابۆتەوە لە ئیرۆس و بەشێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندی لەگەڵ ئەو سەرمەدییەدا دۆراندووە کە لە ژیانی سێکسدا هەیە و ئەگەری بەخشینی منداڵی تێدایە. چۆن ئەم کرانەوە مۆدێرنە بەرووی سێکسوالێتیدا پەرە بەم ناڕازیبوونە دەدات لە ژیانی سێکسیدا؟

ئەو سەرنج ڕاکێشانەی پێشوو بۆ سێکسوالیتی لە ئاستێکی بەرزدا پەیوەندیدار بوو بەو پەنهانییە قەدەغەکراوەی کە لەدەوری دەسوڕایەوە. ئەو هۆشیارییەش کە بۆ گۆڕین هەبوو بۆ خۆی پەنهانییەکی گەورە بوو کە پەیوەستبوو بە پەیوەندی مرۆڤێك لەگەڵ مرۆڤێکی تردا، کە تا ئێستاش ئەو دوو کەسە دوو تاکن لە بەرامبەر یەکتریدان.

کاتێك سێکس دەگۆڕێت بۆ تەکنیك ئەوا پەنهانی لە سێکسدا نامێنێ. ئەمەش نابێتە تەواوبوونی بە پێچەوانەوە دەبێتە برسیبوونێکی شارەزایانە. خاڵی دەستپێکردنی منیش لێرەوە سەرچاوە دەگرێ کە هەر کاتێك هەموو شتێك لەسەر پەیوەندی مرۆڤەکان وترا ئەوا ئەو کاتە من پێموایە کە شتە گرنگەکان ماون و هێشتا نەوتراون.

- ئایا هیچ ڕێگەیەکی باشتر هەیە؟

من نازانم. قسە لەیەك نەچووەکان نیشانەی ئەوەن کە تا مرۆڤ زیاتر بزانێت کێشەکان چارەناکرێن. لەلایەکەوە ئازادی هەیە، لەلاکەی تریشەوە ئاسوودەیی. ئازادی بەبێ ئاسودەیی خەونێکی ترسناکە، وە ئاسودەیش بەبێ ئازادی زیندانە. کۆکردنەوەی ئەم دوانەش پێکەوە ئاسان نییە.

بەهەمان شێوەش بۆ پێکەوەبوونی، پیاو و ژن، منداڵ و دایك و باوك، یان کەسانی تر هەمان شتە. ئێمە هەوڵدەدەین ئەو ڕێگا ناوەندییە ئاڵتوونییە بدۆزینەوە، بەڵام زەحمەتە ئێمە بتوانین هەم ئازادی و هەم ئاسوودەیی پێکەوە بپارێزین بەبێ تەنگهەڵچنینیان بە یەکتری. ئاسودەیی سنوور بۆ ئازادی دادەنێت و ئازادیش بە هەمان شێوە.

جوانی ئینسان لە ژیاندا ئەوەیە کە هەوڵدەدات بە مەحاڵ بگات. ئەگەر هەموو شتێکیش روونبێت ئەوا ژیان چێژی نامێنێت. ئێمەی ئینسان لە هەوڵی ئەوەداین تا ئەوپەڕی مەحاڵ لە ژیاندا بچینە پێشەوە و ژمارەی زۆری رۆژەکانیش ببینین. بەڵام ئێمە لە دنیایەکی پڕ لە جێگۆڕکێدا دەژین و هەروەها بێ سەبریشین. هەموو ئەو شتانەی کە هەن دەبێ ببن. چاوەڕوانی لەم تامەزرۆبونانەماندا جێگای

نابێتــەوە، هــەروەها چــەند ڕۆژێکــیش نــین تــا حساب بکرێن و تـەواوبن. هـەموو ڕۆژێك نرخـی خــۆی هەیــە و دەبــێ بێــچەند و چــوون زاڵــبین بەسەریاندا.

هــەروەها تــۆ لــە کتێبەکەتــدا گفتوگــۆ لەسـەر ئـەو حاڵەتـە کۆمەڵایەتیـە زۆر گەورانـەش دەکەیت. تۆ باست لەوە کردووە کە چۆن موبیل تەلـــــەفون و ئەنتـــــەرنێت ئـــــەو هـــــەلی پەیوەندیکردنـەی خوڵقانـدووە بـەبێ ئـەوەی بـە شـــێوەیەکی فیزیکـــی مرۆڤـــەکان پەیوەنـــدی بەیەکەوە ببەستن، ئەمەش نێوەندێکی لـە نێوان مرۆڤەکانـدا دروسـتکردووە. بـەڵام پەیوەندییـە تەکنـــەلۆژیایی و مۆدێرنەکـــەش توانیویـــەتی حاڵـەتی تـازە دروسـتبکات. بـۆ نموونـە بـەهۆی ئـەم تەکنەلۆژیایـەوە توانیویـەتی لـە پلەیـەکی بـــەرزدا بزوتنەوەیـــەکی دژ بـــە جیهـــانگیری دروســـتبکات، ئەمـــەش بـــە تـــەنها خـــۆی جیاناکاتەوە، وانییە؟

مـــن پێموایـــە ئـــەم بزوتنەوەیـــە وەك ئـــەو بەشـدارییە وایـە بـەڵام بـە تـەواوەتی نـا. ئـەم بزوتنەوانە کە دەبنە هۆی یەکخستنی مرۆڤەکان لە دەوری شتێك و کردنیـان بـە کۆیـەکی نـەگۆڕ. بەرەنگاریکردنی جەنگ دژی عێراق نمونەیەکی زۆر باشە. وەهمێکی جەماعی وای خوڵقاند کە توانی هـەموو جیاوازیی مرۆڤە بەشداربووەکان بشارێتەوە، هەروەها دەرفەتی ئـەوەش نـەبوو تـا سـەرنجە جیاوازەکـان لەگـەڵ یەکتریـدا بکەونـە گفتوگۆکردن. من دەمەوێت ئەم جۆرە هاوبەشـی کردنــە نــاوبنێم (بەشــداریکردنی کەنتۆریانــە). کاتێك خـەڵکی دەچنە شانۆ هـەموو شتەکانیان لە کەنتۆرێکدا دادەنێن، دواتر دوای تەواوبوونی شـــانۆگەرییەکە شـــتەکانیان وەردەگرنـــەوەو هەریەکـە و بـەخۆیی و قەناعەتـەکانی خۆیـەوە دەگەڕێتــەوە ماڵــەوەو ژیــانی تایبــەتی خــۆی دەژی. ئەمـە بەشداریکردنێکی ڕاسـتەقینە نییـە بەڵکە ئەمە بەشداربوونێکی ترە بە مانایەکی تر.

گرفتەکــە هــەر هــەمان گــرفتی جارانــە. هـەمووومان دەمانـەوێت بارەگایـەکمان هـەبێت، چونکە تەنها لەوێدا دەتوانین ئـەوەبین کە هـەین، بـەبێ ئـەوەی خۆمـان بگـۆڕین، بـەڵام ئەمـە لـە هەمانکاتیـــشدا دەمانترســـێنێت. لەبەرئـــەوەی بارەگــا دەتوانێــت ڕێگربێــت لەبەردەمانــدا بــۆ دۆزینــەوەی جێگــای تــازەتر، بۆیــە ســەرلەنوێ ترس لەوێشدا داگیرماندەکاتەوە.

تـــرس و کۆمەڵگـــەی جێگۆڕکێکـــەر ڕەگەزێکی تری متمانەکردنن. تۆ لـە کتێبەکەتدا نووســـیوتە کـــە دنیـــای ئـــەمڕۆ (پـــیلان دژی متمانەکردن) دەگێڕێ، مەبەستت لەمە چییە؟

کاتێـك کـە منـداڵبووم لـە هـەموو شـوێنێکی شـەقامەکاندا ئـەو ئیعلانانـە هەڵدەواسـران کـە باسـیان لـەو کارگانـە دەکـرد کـە لـە سـاڵەکانی 1700 کـان یـا 1800 ەکانـەوە هـەن. ئەمـەش جۆرێك لە متمانە پێدانی بەو کارگانە دەبەخشی کـــە لـــە دەمێکـــەوە بنیـــاتنرابوون. ئەمانـــە لەسـەرەتاوە لـە شـاگردییەوە دەسـتیان بـە کـار کردبوو بۆ نموونـە کارگـەی ڕینـۆ یـان فـۆرد کە دواتر توانیان تا تەمەنێکی درێژتر بمێننەوە.

جـان پـۆل سـارتەر وەك پرۆژەیـەك قـسەی لەسـەر ژیـان کـردووە، ئەمـەش پەیوەنـدی بـە هەڵبژاردنی توانا ڕاستەقینەکانەوە هـەبووە، کە دواتر ئـەو توانایانـە فرۆشـراون و تایبەتمەنـدی خۆیـان وەرگرتـووە و ئیـدی بـەو شـێوەیە ژیـان

بەردەوام بووە. ئەو کات ئینسان تەنها یەك ڕێگای لەبەردەمدابوو. بەڵام ئێستا کارگە هەیە لە ڕۆژێکەوە تا ڕۆژێکی تر نامێنێت، ئەمەش لەبەرئەوەی کە ئیفلاس دەکات یان دەفرۆشرێت. ئەگەر تۆ پێنج ساڵ گەرەنتی لای شەریکەیەکی تەئمین بکڕیت؟ ئەوا تۆ چۆن دڵنیادەبیت لەوەی کە ئەم شەریکەیە تا ماوەی پێنج ساڵی تر دەمێنێت؟ ئێمە بەبێ متمانەکردن بە شتێك ناتوانین بژین. ئێستا جۆرێك لە متمانەکردن دروستبووە بەبێ هیچ گەرەنتییەك، متمانەکردنێکی جێگۆڕکێکەرە. ئەمەش هۆیەکە بۆ ترس دروستکردن، ئەگەرچی لە راستیشدا چەندەها هۆکاری تر هەن لە دنیای ئێمەدا کە وا لە ئینسان دەکات بترسێت.

کەمی متمانەکردن و زۆری گومان. لە شوێنە گەورەکاندا کاریگەریی خۆی لەسەر ئەتنییە جۆراوجۆرەکان و فرە کلتووریی بەجێدێڵێت. تۆ هێما بۆ ئەوە دەکەیت کە بۆتە هۆی ئەوەی کە تۆ بە "میکسۆفیلا" (مەبەستت لایەنی دڵ پێخۆشبوونە) و "میکسۆفۆبیا" (مەبەست ترس و دڵەڕاوکێیە) ناویان بەریت، دڵپێخۆشبوون بەشێوەی ژیان و ترس و دڵەڕاوکێ تێکەڵ بەیەکتری بوون. ئەمەش عەشق تاڕادەیەکی زۆر دەخاتە ناو تاقیکردنەوەیەکی قورسەوە، تەنانەت قورس بۆ سیاسییەکانیش؟

گەشەکردنی ژیان وا بالی بەسەر شێوە ژیانی ئێستادا کێشاوە، کە ئێمە لەیەك کاتدا ڕووبەڕووی هەردووك لە میکسۆفیلا و میکسۆفۆبیا ببینەوە. ئەو دڵ پێخۆشبوونە بە کەسی نەناس کە دێت و ژیان لە شارە گەورەکاندا خۆش و هەمەرەنگ دەکات، لێرەدا میکسۆفۆبیا دێتە ئاراوە کاتێك کەسێکی نەناس یان کەسە نەناسەکان دەبنە هۆی پەشێوی، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ئێمە ناتوانین بە هەمانشێوە کۆنترۆڵیان بکەین وەك ئەوەی کە دەیانناسین. ژیانی سەر شەقامەکان لە شارە گەورەکاندا قوتابخانەیەکە ئێمە تێیدا فێری هونەری ئەوە دەبین کە چۆن لەگەڵ ئەوانی تردا بژین کە جیاوازن.

جیاوازی لەناو شارێکی گەورەدا شتێکی نوێ نییە. بەڵام پێشتر ئەم جیاوازییە وا دەبینرا کە دواتر ونـدەبێت و نـامێنێ. سەرکێشیکردنیش لەلایەن ئەو کەسە نەناسەوە تەنها وەك قۆناغێك بووە و تێپەڕیوە، وە هەروەها هێندەش بە بەهاداری سەیری کەسی نەناس نەکراوە تا لێی بکۆڵرێتەوە.

ئێستا دەتوانین ئەو جیاوازییە بەدیاردەیەکی هەمیشەیی ببینین، وە ئێمە ناچاریشین کە نەناس و غەریبەکان بناسین، یان لە هەر حاڵێکدا خۆمان فێری ئەوە بکەین کە لەگەڵیاندا بژین.

بەڵام "میکسۆفیلا و میکسۆفۆبیا" ئەمانیش هەردووکیان دوو تێڕوانینن بۆ ژیان، جیاوازی هەردووکیشیان سەرنج ڕاکێشەو هەم هەرەشە لێکەریشە. ئیمانویل کانتی فەیلەسوفی ئەڵمانی سەبارەت بەم بابەتە دەڵێت: ئەمە هەم دەبێتە جێی ئازار و هەم جێی لەزەتیش.

بەڵام وا لێرەدا ئێمە بەسەر ئەو پلانە سیاسییەدا تێدەپەڕین. ترس لە غەریبە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ترسەی کە هەمانە لە ئارامی ژیان و جیهانگیری. کارگە

بەرهەمهێنـــەکانی خۆرئـاوا بـۆ بەرهـــەمهێنانی شمەکـەکانیان دەگوێزنـەوە بـۆ ئاسـیا، چـونکە لـەوێ کەسـە گـەنج و زیرەکـەکان هـەرزانترن. حکومەتەکان بەزەحمەت دەتوانن رێ لەو ترسە بگـرن چـونکە لەبەرئـەوەی خۆیـان لۆکـاڵین، لـە بەرامبەریـشدا کایـەی بازرگـانی و پیـشەسازی گلوباڵـە. سیاسـییەکان رۆڵێکـی کـەمیان هەیـە، بۆیـە ئـەوانیش هەوڵـدەدەن لـە سـامانی ئـەو کەسانەی تر بدەن کە خاوەنی ئەو ترسەن تـەنها لەبەرئەوەی پیشانی بدەن کە شتێك دەکەن.

دەوروبـــەری مـــن گـــەرەکێکی هێمنـــەو پەناهەنـدەکان مـەیلی سیاسـەتیان نییـە. هـیچ ئەفیـشێکیش پـێش هەڵبـژاردن بـە دیوارەکانیـدا هەڵناواسرێت. لە ماوەی ئەو 32 ساڵەی کە من لەوێدا ژیـاوم تـەنها شـتێك کە مـن بـەخێرایی لـە دراوســێکانم وەرمگرتبێــت ئەوکاتــە بــوو کــە شـارەوانی ویـستی پارچـە زەوییـەکی بـچوك لـە هەندێك قەرەج بسەنێتەوە، بڕواناکـەیت کـە بـوو بــــە چ هەرایـــــەکی توندوتیـــــژ، هــــەموو سیاسـەتمەدارە لۆکاڵییـەکان هـاتن تـاکو ئـەو ترســـەی ئێمـــە بقۆزنـــەوە. تـــرس جـــۆرە سـەرمایەیەکی گەورەیـە کـە سیاسـەتمەدارەکان ئاسان دەتوانن سەرنجراکێشانە گەمەی خۆیانی تێـدا بکـەن. شـتێك نییـە هێنـدەی تـرس کـە کـــارتێکی ئەوەنـــــدە بـــــەهێزبێت بـــــۆ سیاسـەتمەدارەکان تـاکو هەمیـشە و لـە هـەموو شـوێن بتـوانن بیقۆزنـەوە و گەمـەی خۆیـانی پێبکەن.

**پەراوێزەکان**

1-ســـیگروم داڤیـــد ســـدوتیر رۆژنامەنوســـێکی ئیسلەندییە.

**سەرچاوە:**

رۆژنامـەی پاشـکۆی کلتـوری داگـس نیهێتـەر/ لاپـەڕە 7/ 15ی ئۆگۆستی 2003.

# دوو چیرۆکی زوویا پیرزاد

له فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد

-1-

**لێوانی[1] دەسکدار**

لەسەر شووشە گەورەکەی موغازەکەدا و بە خەتێکی لار نووسرابوو: بەخێربێن بۆ ساڵانی (1920). ناوی موغازەکە (ساڵانی 1920) بوو. ژنە جحێڵەکە دەرگاکەی کردەوەو هاتە ژوورێ. زایەڵـەی زەنگۆڵەیەکی نادیار هاتنە ژوورەوەکەی راگەیاند بەڵام ئەو پیاوەی کە لە تاریك و روونی بنەوەی موغازەکەدا و لە پشت مێزێکی کۆن و دێرینەوە کە تایبەت بە نووسین بوو، دانیشتبوو و رۆژنامەی دەخوێندەوە هیچ سەری هەڵنەبڕی.

ژنە بەناو موغازەکەدا گەڕاو سەیری دەوروبەری کرد. کورسی کۆن، مێز تەوالێتی ئاوێنەدار و گەلێ سنووق و باوڵی قورس و گەورەی ئەوتۆ کە نەخشونیگاری زۆریان لەسەر هەڵکۆڵرا بوو و رووبەرووی یەکتر راگیرابوون، هەریەکەشیان پارچە لەزگەیەکی بچوکی بەسەرەوە بوو کە نرخ و ساڵی دروستبوونی لەسەر بوو. ژنە دەسکی درێژی جانتاکەی لەم سەرشانییەوە گواستەوە بۆ ئەوشانی، ئینجا سەرێکی هەڵبڕی و دەیان چلچرای بینی، هەندێکیان یەك چرا و هەندێکیان چەندین چرای گەورەو بچوك کە وردە شووشە و پارچە کریستاڵی بریقەدار نەخشێنرابوون لە بنمیچەکەوە شۆڕببوونەوە. نرخی هەریەکێکیان لەسەر پارچە مقەبایەکی چوارگۆشە بە چراکەوە هەڵواسرابوو، هەوای گەرمو کولاوی موغازەکەش وای راگرتبوون جوڵەیان نەدەکرد. ژنە گەیشتە بەشێکی موغازەکە کە پەردەیەك و قەفەسەیەك[2] لە بەشەکانی تری جیا دەکردەوە. پەردەکەش کە لە قەیفەی سوور بوو و هەندێ جێگای دڕابوو وێنەی چوار حاجی لەقلەقی لەسەر چنرابوو کە لە کاتی فریندا بوون. بەرامبەر بە قەفەسەکە تاکێ قەنەفەی چەرمی

گەورە هەبوو. قەفەسەكەش پڕ بوو لە شتی گەورە و بچوك و كەسیش بە ڕێكخستنیانەوە خۆی ماندوو نەكردبوو. قاپ و كاسەی چینی و فەخفوری، چاویلكەی كۆنی فرۆكەوانیی، دەسگایەكی چاپی ڕەش و قورس كە جێی چەند پەنجەیەكی نەمابوو، ئیتر گوڵدان و تەپلەك و جیٚ مۆم و خشڵ و زیوەری خولاٚوی و تۆزاوی. ژنە چاویلكەیەكی بەرهەتاوی لە چاودا بوو دایكەند و هەناسەیەكی قوڵی هەڵكێشا. بۆ شیٚ و بۆ كۆن دەهات. جوتیٚ دەستكێشی هەڵگرت و ئەمدیو ئەودیوێكی پێكرد و هەڵیسەنگاند. دەستكێشەكە لە ساتینی پەمەیی دروستكرابوو. پەڵەیەكی زەردیش بەسەر جێپەنجەكانی دەستە چەپییەوە بوو. دەستكێشەكەی خستەوە جێی خۆی و ئینجا ڕوانییە وێنەیەك كە لە چوارچێوەیەكی كۆن و دێریندا بوو. لە وێنەكەدا كوڕۆڵەیەكی بنەوشی و مۆن لە پەنای ژنێكی جحێڵدا وەستابوو. ژنی ناو وێنەكە لاواز و ڕەنگ پەڕیوو بوو، قژی لە تەوقە سەریدا كۆكردبووەوە و لەسەر قەنەفەیەكی گەورەی چەرم ڕێك و قیت و قۆز دانیشتبوو. بەسەر ئۆیەی یاخەی كراسەكەیەوە كە داخرابوو ڕیزیٚ مرواری درێژ شۆڕببووەوە. كوڕۆڵەكە لێو هەڵقورچاو و مۆن و ئەبڵەقانە لە كامێراكەی ڕوانیبوو.

ژنە جحێڵەكە بە پەنجە خاكو خۆڵی سەر وێنەكەی لابرد و بزەیەكی هاتیٚ و بە هێواشی وتی "تۆش وەكو كوڕەكەی من حەزت لە وێنەگرتن نییە؟" یەكێك وتی "ڕاستە. حەزی لە وێنەگرتن نەبوو."

ژنە جحێڵەكە خێرا لای كردەوە. قژە خاوو درێژەكەی ڕژایە پشتییەوە. لەسەر قەنەفە چەرمین و گەورەكەدا ژنێك دانیشتبوو. قژی لە تەوقە سەریدا كۆكرابووەوە و لەسەر ئۆیەی یاخەی كراسەكەیەوە كە داخرابوو ڕیزیٚ مرواری درێژ شۆڕ ببووەوە.

ژنە جحێڵەكە پرسی "وێنەی ئێوەیە؟"

ژنە ڕیزە مروارییەكەی لە دەوری پەنجەی ئالاٚند. "بەڵیٚ وێنەی من و كوڕەكەمە."

ژنە جحێڵەكە دەسكی درێژی جانتاكەی خستە سەر شانەكەی تری و لە ژێرەوە ڕوانییە ئەو مێزە كۆنین و دێرینەی كە تایبەت بە نووسین بوو و لە بنی موغازەكەدا دانرابوو.

ژنە هەر لەسەر قەنەفە چەرمەكەوە وتی "خەمت نەبیٚ. بوونی من لێرە بۆ ئەو شتێكی ئاساییە و پێی ڕاهاتووە."

ئینجا هەستاو لای قەفەسەكەوە وەستا. "زۆربەی ئەو شتانەی لەم قەفەسەدا دەیبینی هی منن. یانی هی من بوون، لە پاش مردنم، چونكە هیچ كەسم نەبوو دراوسێیەكان شتەكانمیان لە قەراغ شەقامدا دانا. ئەویش (ئاماژەی بە پیاوی پشت مێزی نووسینەكە كرد) كۆی كردنەوە و هێنانیە ئێرە. ئیشی هەر ئەمەیە. ئەو شتانەی خەڵك نایانەویٚ ئەو دەیانهێنێتە موغازەكەی و دەیانفرۆشێتەوە بەو كەسانەی كە هەر بۆ خۆشی یان بە هۆی كونجكۆڵییانەوە دەیكڕن". هەردوو ژنەكە تاڕادەیەك بالاٚیان وەكو یەك بوو و تەمەنیشیان لە یەكەوە نزیك بوو. هەرچەندە ژنی ناو وێنەكە بەو تەنوورە ڕەش و درێژەی و بەو كراسە قۆڵ درێژ و یاخە داخراوە و بەو قژە كۆكراوەیەی

تــەوقی ســەرییەوە بــە تەمــەنتر یــا ڕەنگــە بنەوەشێتر دەهاتە بەرچاو. ژنەکەی تر پانتۆڵی لە پێدا بوو، کراسەکەشی بێ قۆڵ و دوگمەی سەریشەوەی کرابووەوە.

ژنــە جحێڵەکــە دووبــارە لــە وێنەکــەی ڕوانییــەوە. "هــیچ کەســت نــەبوو؟ ئــەی کوڕەکەتان".

ژنە گەردانەکـەی ملـی لـە دەوری پەنجـەی پێچاو سەیرێکی وێنەکەی کرد.

"کوڕەکــەم لــە شــەڕدا کــوژرا هــەروەها مێردەکەم و هەموو کەسوکارم".

ژنــە پەرچــەمەکەی کــە عــەرق بــە ناوچەوانییەوە چەسپاندبووی لایدا.

"مێردەکــــەت و کوڕەکــــەت لــــەکام شەڕدا کوژران؟"

ژنی وێنەکە بۆ چەند چرکەیەك چاوەکانی داخست، پاشـان کردنییـەوە. ئینجـا دەسـتی بــردو لێوانــە چــینییە دەســکدارەکەی لــە قەفەسەکە دەرهێنا.

"ئـەم لێوانـە، مێردەکـەم بـۆ کوڕەکـەمانی کڕیبوو."

دەسکی جانتاکە شانی ژنەی قورس دەکرد.

"بەداخەوەم. بێگومان زۆر ترسناك بووە."

ژنە پەنجەی بە گوڵە سوور و وردەکانی سەر لێوانەکـەدا هێنـا. "شـەرەکەت مەبەسـتە؟ بـەڵێ، ترسـناك بـوو. یـانی تـا ئـەو کاتـەی ئـەوان نـەمردبوون، بـەڵام دوایـی ئـیتر زۆر ترسـناك نـەبوو. کوڕەکـەم هـەموو بەیانییـەك بـەم لێوانـە شیری دەخواردەوە."

دەسکی جانتاکە دەتووت قورستر بووە. ژنە سەیری لێوانەکەی کرد.

لەسەر دەقە چینییە سپییەکە و لەسـەرووی گوڵـە سـوور و وردەکانـەوە ناوێك نووسـرا بـوو.

"ناوی کوڕەکەی ئێوەیە؟"

"نـاوی کوڕەکـەم بـوو. بـە نـاوی باپیرمـەوە کوڕەکەمان ناو نابوو. ناوێکی زۆر دێرین بوو. ئەی ناوی کوڕەکەی ئێوە چییە؟"

"نـاوی کوڕەکـەی منـیش نـاوێکی کۆنـە. ناوێکی کۆنی ڕۆژهەڵاتییە".

ڕەنگــــورووی هــــەڵبزڕکاوی ژنــــە بــــەو زەردەخەنە کاڵە کرایەوە. "ئێوە لـە ڕۆژهەڵاتـەوە دێـن؟ ئێمـە قاڵییـەکی بچوکی ئێرانیمـان هـەبوو. مێردەکــەم هەمیــشە خــۆی بەگــسکێکی نــەرم گــسکی دەدا. دەیــووت گــسکی زبــر قــاڵی دادەوەشێنێ."

ژنــــە لێوانــــە دەســــکدارەکەی خــــستە قەفەسەکەوە و بەرەو قەنەفە چەرمەکە ڕۆشت.

ژنــە لێوانــە دەســکدارەکەی هــەڵگرت و بــەرەو لای قەنەفــە چــەرمەکە وەرچــەرخا. قەنەفەکە خاڵی بوو.

ژنــە هەناســەیەکی قــووڵی هەڵکێــشا و بەرەو مێزە کۆن و دێرینەکە ڕۆشـت کـە تایبـەت بــە نووســین بــوو، لێوانــە دەســکدارەکەی لەسـەر دانـاو جانتاکـەی کـردەوە "موغازەیـەکی جوانت هەیە."

پیاوەکە سـەرێکی لەقانـد و باوێـشکێکی دا. بـاقی پارەکـەی دایـەوەو دووبـارە سـەرگەرمی خوێندنەوەی ڕۆژنامە بووەوە.

لەســەر شــەقامەکە هــەوا گــەرم و هــەتاو بـەتین بـوو. بـایش هـەڵیکردبوو. ژنـە گـوێی لـە دەنگی کپ و قەبزی دەرگای موغازەکە بوو کە لە دوای ئەم داخرا.

کە دەرگایماڵەوە کرایەوە کوڕۆڵەکە بە ڕاکردن هاتە پێشێ و قیژاندی: "چیت بۆ کڕیوم؟"

ژنە سەیرێکی کوڕەکەی کرد. "لێوانێك"

لێوانە دەسکدارەکەی لەبەر بەلوعەکەدا شت و وشکی کردەوە، ئینجا بە کوڕەکەی دا. "لێوانێك کە بەیانیان شیری پێ بخۆیت".

-2-

**هاوسێکان**

من ژنە دراوسێکەی بەرامبەرمان ناناسم بەڵام هەموو ڕۆژێك لە پەنجەرەی موبەقەکەمەوە لە حەوشەو موبەقی خۆیاندا دەیبینم. بەیانیان جلە شۆراوەکان دەهێنێتە حەوشەو دەیاندا بەو تەنافە درێژەی کە لە نێوان دوو پیرە چناردا هەڵواسراوە. دوایی دەچێتە موبەق و نیوەڕۆژە دروست دەکات، لە هەمان کاتدا منیش لە موبەقەکەی خۆمدا نانی نیوەڕۆ ساز دەکەم. هەرچەندە مەودای کۆڵانێکی باریك و حەوشەیەکی بچووکمان لە نێواندایە کارگەلێکی هاوشێوە ئەنجام دەدەین.

نیوەڕوان مێردی ژنە دراوسێکەم لەسەر کارو منداڵەکەی لە قوتابخانە دێنەوە، ژنە دراوسێکە پێخۆری نیوەڕۆ لە موبەق و لەسەر مێزەکە دادەنێ. مێردەکەی لەگەڵ منداڵەکەدا یاری دەکات. ژنە دراوسێکە خواردنەکە تێدەکات. منداڵەکە قاپەکەی خۆی دەداتە دواوەو نان ناخوات. ژنە خواردنەکە دەرخواردی منداڵەکە دەدات. مێردەکەی نیوەڕۆژە دەکا و بە ئەتواری منداڵەکە پێدەکەنێ. دوای نانی نیوەڕۆ مێردی دراوسێکەم لە حەوشە لەگەڵ منداڵەکەدا تۆپ تۆپێن دەکات. ژنە خوانی نیوەڕۆ کۆدەکاتەوە.

عەسر مێزی ئوتو و کەرەسەی دوورمان دەهێنمە موبەق. موبەق ڕووناکتر و گەرمترە. لە موبەقەکەدا هەست بە ئاسوودەییەکی زۆرتر دەکەم.

ژنە دراوسێکە عەسرانی لەگەڵ منداڵەکەیدا بەسەر دەبات. دەرسەکانی پێدەڵێ. هەندێجار یاری لەگەڵدا دەکات و هەندێجاریش شەڕی لەگەڵدا دەکات، تەنانەت لێشی دەدات. منداڵەکە دەگری. ژنە دراوسێکەش دەگری. کە منداڵەکە ژیر دەبێتەوە ژنە دراوسێکە لە پشت مێزی موبەقەکەوە دادەنیشێ. ئانیشکەکانی لە مێزەکە دەچەقێنێ و سەریشی دەخاتە نێوان هەردوو دەستییەوە. هەندێجار جگەرەیەك دادەگیرسێنێ و لە شوێنێکی نادیار ڕادەمێنێ. ئینجا لە پڕێکدا لە جێی خۆی ڕادەپەڕێ. دوای چەند ساتێك بە سەوەتەیەکی بەتاڵەوە دێتە حەوشە. جلەکانی سەر تەنافەکە لێدەکاتەوە، قەدیان دەکات و دەیانخاتە سەوەتەکەوە.

لە موبەقدا نانی ئێوارە دروست دەکەم. ژنی دراوسێکەش لە موبەقەکەی خۆیدا نانی ئێوارە دروست دەکات. منداڵەکانم لە قوتابخانە و مێردەکەم لەسەر کار گەڕاونەتەوە. قسە دەکەن. گوێ دەگرم. دەپرسن "لێوان لە کوێیە؟ قەڵەم لە کوێیە؟ سابوون لە کوێیە؟" دەڵێم "لێوان لە قەفەسەکەدایە، قەڵەم لەسەر مێزی نووسینەکەیە." بە تەنیشت بەلوعەی

مەغـــسەلەکەوە ســـابوونێکی تـــازە دادەنـــێم. منداڵەکان باسی ڕووداوەکانی قوتابخانە دەکەن. من خوانی ئێوارە ڕێك دەخەم، مێردەکەم باس و خواسـی دائیرەکـەی دەگێڕێتـەوە. بـزەم دێـتێ. منداڵەکان دەرس دەخوێنن، نانی ئێوارە دەخۆن، قیـژوقاژ دەکـەن. مێردەکـەم دوای نـانی ئێـوارە ڕۆژنامـە دەخوێنێتـەوە. مـن قاپـەکان دەبەمـەوە موبـەق. ژنـە دراوسـێکە لـە موبەقەکەیـدا قـاپ دەشـوات. مـن بیر لـە خـواردنی سـبەی نیـوەڕۆ دەکەمەوە.

**پەراوێزەکان:**

1-لێوان – پەرداخ

2-قەفەسە – جۆرە جێقاپێکە یان لە نایلۆن یان فلز دروست دەکرێ، شێوەی سەبەتەی هەیەو جگە لە قاپ بۆ دانانی شتی تریش بەکاردێت.

**سەرچاوە:**

لـــە کۆمەڵـــە چـــیرۆکی: "مثـــل همـــەی عـــصرها" وەرگیراوە.

# بەرەو هۆنراوەکانی ولیەم برۆنک

هنری وینفلد

لە ئینگلیزییەوە: روخۆش عەلی

بەڕای من ئەوەی برۆنک پێیهەڵدەسێت پەیڕەویکردنی ڕێبازێکە کە لەگەڵ (ڤیانێگە تیڤا)ی نەریتی سۆفێگەریدا چوونیەکن بۆ نموونە لای نووسەری نەناسراوی (تەمی نەزانین) (*The cloud of unknowing*)ی سەدەی چواردەهەم تەنها زانیاری دروست زانستی خودایە. بەڵام لەو ساتەوە ئەم زانستە بە تەواوی لەسەروو دەسەڵاتی ئێمەوەیە، وەلانانی زانیاری هەڵەی جیهانەکەمان لە ڕێگەی دانپیانان بە دواکەووتویی و خۆقووتارکردن لەخۆبایبوون و هاوشێوی ئەوان بۆ ئێمە دەگونجێن. تەنها چوونە نێو "تەمی نەزانین" بەس نییە بۆ ناسینی خودا بەڵکو دەکرێت هەست بە بوونی بکەین. هەروەها لە ڕووی ناکۆکی خودی ناوەرۆکەوە ووتارەکانی برۆنک ڕەوشی گومانکردنی ڕادیکاڵی و نیهلیزمی (*nihilism*) ڕەتدەکەنەوە. بەڵام مەبەستی هۆنراوە نکوڵی کردن نیە بەڵکو ووروژاندنی ئەو شتەیە کە بە ووتەی لۆژیك "پیرۆزە" لە میانەی نکوڵیکردنەوە. هەروەها برۆنك لەو بڕوایەدایە کە هۆنراوە ئەرکێکی دیکەی هەیە و تاڕادەیەك لە کاری ئەو پرۆسە ڕۆحیانە دەچێت کە نووسەری "تەمی نەزانین" پراکتیزەی کردووە و تێیدا زمانی سۆفیگەری تەنها فاکتەری ئەو پرۆسە ڕۆحیەیە، بەڵام لەگەڵ ئەو جیاوازیە سەرەکییەی کە تەنها خودی زمانی سۆفیگەری خۆی گرنگ نییە بەڵکو مەبەستی زمانی شیعری لە بەکارهێنانی هەندێك ڕێبازی سۆفیگەری و گوزارشتی جوان بۆ بەرجەستەکردنی "پیرۆزی" و جوانی گرنگن. لەبەرئەوەی هۆنراوە لە زمان و سستمی ووتاری زمان پێك دێت بێگومان "بێسودە بڵێین هۆنراوە پیرۆزی بەرجەستە دەکات" چۆن دەتوانن لە شتێك بدوێن کە ناشێت لەسەری بدوێن؟ هەرچەندە ئەم ناکۆکییە لە زێدی هۆنراوەی لریکدا بۆ نزیکبوونەوەیە لە ڕەوشی مۆزیك و لە سستمی

ووتاری زماندا دەردەکەوێت. ئەو پەیوەندییە سۆفیگەریی نێوان شێوەو ناوەڕۆك لە چەمکێکی دیاریکراوی کارەکانی برۆنکدا لە هەر هۆنراوەیەکی هاوچەرخی دی پێشکەوتووترە و (بەجۆرێك واملێدەکات، بەشێوەیەکی گشتی وەك سەرچاوەی بونیاتنەری پەیوەندییەکی ڕەمزی بە ڕەوشی هۆنراوەوە بیر لە هۆنراوەکەی بکەمەوە) لەبەرئەوەی ئەو ناکۆکییە لە هەموو هۆنراوە لریکیەکاندا دروست دەبێت، لە کاری برۆنکدا کراوە بە مەغزای نووسین. برۆنك ڕووبەڕوو بوونەوەی سستم و سنووری ووتاری زمانی هۆنراوەو مەترسی بەردەوامی پاشەکشێکردنی لە دوورکەوتنەوە بۆ دەرەوەی سستمەکە لا چاکترە و ڕاستەوخۆ لە بری خودی کۆتایی دەیکاتە ناوەندی کۆتایی. هەرچەندە وەك پێشتر تێبینیمان کردبوو، لە سەرەتای ڕەوشەکەدا مەغزای هەوڵەکانی بۆ پێکهێنانی هۆنراوە نەبوو بەلام لە کۆتاییدا دەڵێن برۆنك شاعیرێکی سۆفیگەرییە کە هۆنراوەکانی بە هەمان ئاڕاستەی (*The Via Negativa*) ڕەوتدەکەن. لەوانەیە تەنها بۆ ئەوە بێت لە کۆتاییدا بڵێن خودی هۆنراوەی لریك جۆرێکە لە تەسەوف لەوانەیە ئەوپەڕی شێوەی تەسەوف لە خودی خۆیدا بەشێك لە هەوڵی زمان بێت بۆ ووروژاندنی شتە پیرۆزەکان وەك شاعیر لە هۆنراوەی "سروشتی فۆرمی میوزیك"دا پێمان دەڵێت "سەختە بڕوا بە جیهانێك بهێنین کە دەبێت میوزیکی تێدا بێت". هەرچەندە کاتێك دەمانەوێت وەلامی پرسیاری "میوزیك چییە؟" بدەینەوە، دەتوانین سەبارەت بە میوزیك هەر ئەوەندە بڵێین کە بریتیە لە سووڕانەوە لەناو بازنەیەکی داخراودا.

**سەرچاوە:**

*From "the Cloud of Unknowing: William Bronk and The Condition of Poetry" Sagetrieb 7.3 (Winter 1988): 137-144.*

## بێرت کمڵمان

ولیەم برۆنك بۆ ماوەی زیاتر لە نیوسەدە کاری بێوێنەی لە بواری توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا ئەنجام داوە. ئێستا برۆنك یەکێکە لەو شاعیرانەی کە هۆنراوەکانی لە هەموو گوزارشتێکی نابەجێی و میوزیك پاکسازی کراوەو زادەی بیرکردنەوەیەکی قووڵن. هەروەها ووتارەکانی لێکۆڵینەوەی ووردن بەلام زۆر ووروژێنەرن. شاعیر بە تەنها لە میانەی هۆنراوە یان هەردووك هۆنراوەو پەخشانەکانیەوە بە شێوازێکی بێوێنە فاکتەری گومانکردن لە ڕەوشی مرۆڤ پێشنیار دەکات. وەك پۆڵ ئەستەر دەڵێت "هۆنراوەکانی برۆنك وەك ڕەوانبێژێك دەوەستن هێرشێکی زۆر جوان بۆ سەر هەموو گریمان و ووروژاندن و مۆنیۆمێنتی گومانەکانی عەقڵ دەبەن. هەمیشە برۆنك لە هەڵسەنگاندنەکانیدا لەناو ئەبستراکدا قاڵ دەبێت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکات بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی گۆڕانی چاوەڕوان نەکراوی بۆچوونەکان و دەربڕینی ئاشکراو کاڵ و کرچ لە خۆدەگرن و بەهیچ جۆرێك قەرداری ڕێبازی لۆژیکی نین. بێگومان توانای بیرکردنەوە لە جیهان و زیاتر لە بواری ئەبستراکتدا ڕاستیەکە مرۆڤ دەیزانێت وە زۆر

خولیایەتی بەڵام لە هەمان کاتدا وەك کێشەیەکی سەخت لەگەڵیدا دەجەنگێت بەمجۆرە دەشێت بووترێت کە برۆنك شاعیرێکی فەلسەفییە بە تایبەتی لە بواری خودی ئەبستراکتداو لە کۆتایدا کێبڕکێی دەکات. کاتێك ڕاستەیە بەرچاوەکانی پەرچەکرداری هوشیاری هەڵدەسەنگێنێت، دژ بە ملکەچبوون و هەندێك جاریش کێبڕکێی زانیاریە حاشا هەڵنەگرەکان دەکات بە هەڵچوون جگە لە ڕەهەندی فیزیکی شوێن و کات دیاریدەکرێن. لە کاتی خوێندنەوەی هۆنراوەکانی برۆنکدا ئەوەی پێویستە لە هزردا بمێنێتەوە ئەوەیە کە سەرەڕای قووڵی سروشتی فەلسەفی نووسینەکانی برۆنك شاعیرە نەك فەیلەسوف. لەگەڵ ئەوەشدا کە برۆنك شاعیرە بیریارێکی مەزنیشە چونکە دەشێت مانەوەی تەواوی بۆچوونەکانی بۆ ماوەیەکی زۆر لەبەرئەوە نەبێت کە ئەو شاعیرێکی سۆزدارییە. تا ئێستا نووسەر پەیوەندی بە برۆنکەوە نیە بەڵکو بە ساموئێل بێکێتی نووسەرەوە هەیە کە هەوڵی بەراوردکردنی ئەو بۆ تێگەیشتنی برۆنك بەسوودە. ستایلی خەمۆك و ڕێکوپێکی نووسینی بێکێت لە شێوازی برۆنك دەچێت. ئەوەی شایانی باسە لەیادنەکردنی کارەکتەرە نائومێدەکانی ناو ڕۆمان و شانۆگەرییەکانی بێکێتە لە میانی ئەوانەوە جەخت لەسەر وەلانانی بڕوا بوون بە هەر شتێك دەکەن. هەرچەندە لای برۆنکیش ئەم رووە تاریکە هەیە بەڵام هەندێك شتی دیکەش هەیە. سەرەڕای بوونی نیگەرانی بێمانای کۆتاییەکەی.

کۆکراوەی توێژینەوە هۆشیاریەکەی بە هەستێکی مەزنەوە لە زانیاریە نەگۆڕەکان لادەدات و زۆر ناماقووڵانە بە ئێستاوە پەیوەستە وەك لە هۆنراوەی "بیرەوەریە بچووکەکانی باران"دا دەڵێت "بەرەو خوار بچەمێوەو هەست بەو زەوییە مەزنەی ژێر پێم بکە" هەمیشە ئەم دژە گۆڕانە زیاتر بۆ هنری دایڤید شرۆ دەگونجێ تا بێکێت کە مەزنترین کاریگەری نووسەر ئەوەیە تەنها لایەنگرێکی خۆشەویستی جیهانە. شێوازی توندوتیژی پێشکەشکردنی دیمەنە سروشتیەکانی برۆنك لەگەڵ شێوازی شرۆدا زۆر لێکدەچن. دەشێت گەشەکردنی برۆنك وەك نووسەر و بیریار بە پێشکەوتنی زمانە شیعریەکەی پێوانە بکرێت. ئەمە یەکەمین و گرنگترین زمانە کە ژیانی رۆژانەی خۆی دەدوێنێت وە هەمیشە بە زمانی گومان کێشە مەزنەکانی مرۆڤ دەدوێنێت. برۆنك شوێنی خۆی لە نێو نەریتێکدا کردۆتەوە کە بلیز پاسکاڵ زۆر بە ڕەوانی لێیدواوەو لەو بڕوایەدایە کۆتایی هێنانی پرۆسەکانی عەقڵ بە گومان کارێکی ناچاری بێت. هەرچەندە ئێمە لە گومان و هەڵەدا دەژین، لەگەڵ ئەوەشدا خوداو سروشت خۆیان لە قەیرانەکانمان هەڵدەقوورتێنن. ئێمە تەنها هۆشمەند نین بەڵکو (غەریزین) سروشتین. هەروەها برۆنك وەك بنەمای زمان لە زانیاری دەڕوانێت. ئێمە بە ژێری یان بە بەدیهیی گوزارشت لە بۆچوونەکانمان دەکەین لە کاتێکدا ئەو جۆرە گوزارشتانە ناتوانن ئاماژە بە ڕاستی بکەن. هێشتا برۆنك دەتوانێت لە ڕاستی بدوێت چونکە هەرچۆن بێت دەزانێت کە ئەو لە پشت ڕەخنەی توندی زمان یان پێکهاتەکانیدایە کە خودی خۆی لە کاری بیرکردنەوەی قووڵ دایڕشتووە.

**سەرچاوە:**

*From "The Winter Mind": William Bronk and American Letters by Burt Kimmel man.*

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم
## نامەی نێوان ئانتوان چیخۆف و ئۆلگاکنیپەر

له فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**کنیپەر**
**19 ژانیوەری**
**مۆسکۆ – تەلگراف**
***Telegraphie sant inguiete*(1)**

***olga***

* * * * * *

**کنیپەر**
**19 ژانیوەری**
**موسکۆ 2ی بەیانی**

**چـەند دێڕێکـت بـۆ دەنووسـم ئازیزەکـەم، هـەموو ڕۆژێك ئـەم کارە دەکـەم بـۆ ئـەوەی بۆڵـە بۆڵم بەسەردا نەکەیت. بۆ ماشات نووسیوە کە تەندروستیت باش نیـە، دەبێـت بەدرێـژیی بـۆم بنووسیت مەسەلەکە چییە. من بووکە شووشە نیم، ئـەم جـۆرە هەڵوێستە زۆر تـووڕەم دەکـات.**

**ئـەمڕۆ لەوپـەڕی بێتاقەتیـدا تـەلگورافێکم بـۆ ناردیـت(...) ئێـستا زۆر نەخۆشـم، بـە تـەواوی ئیـسراحەتم لێـبڕاوە، هـەموو کـاتی بێکـاریم لـە شـانۆ دوورم و لەگـەڵ خێزانەکەمـدام، دایکیـشم بـە درێـژایی ڕۆژ هـەر کـار دەکـات، بـەردەوام دەوروبەرم ئاپوورەیەو من لەوە زۆر قەڵسم. هـەر لە دوای شانۆگەری "مرۆڤە تەنیاکان"ەوە لەگەڵ کوسیتای برامدا بەشەڕهاتم، ئاسایی من هێورم، تەنیا حەزم لەوەیە بڕۆمە ناو جێگاو بـێ جووڵـە ڕابکـشێم. هـیچ ناخوێنمـەوە، تەنانـەت ڕۆژنامەیش. خەجاڵەتیە! بۆ کات ئەمەندە کەمە؟ پەردەی دووەممان ڕێك خستووە، سبەینێ نۆرەی پـەردەی سـێیەمە، ڕۆژی بیـست وشـەش سـەدەهەمین نـۆرەی نمایـشکردنی "فیـودۆر"ە. ئازیزترین ئازیزم، ژیان چەند خێرا دەگوزەرێت، خۆزگـا زسـتان زوو بڕۆیـشتایە، زۆر دەمـەوێت**

لەگەڵ تۆدا ئیسراحەت بکەم! نازانم ئەگەر ئومێدی دیداری تۆ نەبوایە ژیانم چۆن بەسەردەبرد. شەوێکی ئارام و خەونێکی ئارامتر ئازیزەکەم.

* * * * * *

**چیخۆف**

**20 ژانیوەری**

**نیس – تەلگراف**

*Sante Meveilleuse*[2]

*Antonine*

* * * * * *

**چیخۆف**

**20ی ژانیوەری**

**نیس**

ئەکتەری چکۆڵەو ئازیزی خۆم، خاتوونی دڵبەرم، بۆ تەلگرافت بۆ ناردووم؟ لە باتی ئەو پرسیارە گەوجانەیە وا چاکتر بوو شتێکم لە بارەی خۆتەوە بۆ بنووسیت. "سێ خوشکەکە" چی بەسەرهات؟ لە نامەکانتا وا دەردەکەوێت کە هەمووتان هەر لە فشەتان داوە، دەنگە دەنگ لە پەردەی سێیەمدا؟ بۆ دەنگە دەنگ؟ دەنگەکان هەموویان دورو لە دەرەوەی شانۆکەو لەسەرخۆن، بەلاّم لەسەر شانۆکە هەموویان خەواڵوون و وەنەوز دەدەن، ئەگەر پەردەی سێیەم خراپ بکەن هەموو نمایشنامەکە خراپ دەبێت و لەم سەرەتای کاری نمایشنامە نووسینەمدا ناوم دەزڕێنن و لە شانۆم وەدەردەنێن. "ستانسلافسکی" لە نامەکەیدا زۆر بە چاکە باسی تۆو "ڤیشنیڤسکی" دەکات.

ڕاستە من ناتوانم بتبینم وەلێ منیش دەست خۆشیت لێدەکەم. "ڤێرشینین" "ترام – ترام – ترام"ە کە بە پرسیار تێدەگات و تۆ بە وەلاّم. لای تۆوە ئەم "ترام – ترام"ە ئەوەندە بە گاڵتەیەکی سەرنج ڕاکێشەوە دەردەکەوێت کە لەگەڵیا پێدەکەنیت، ئەو دەڵێت "ترام – ترام"و پێدەکەنێت. بەلاّم نەك بە دەنگی بەرز، زۆر لەسەرخۆ. ئێمە کەسایەتیەك دەخوازین گەنج و چالاکتر لەوەی کە لە "خاڵ ڤانیا"دا هەبوو. لەبیرت نەچێت دەبێت تۆ زوو خۆشحاڵ بیت و بە ئاسانیش تووڕە بیت. من ئومێدم بە تۆیە، ئازیزەکەم تۆ ئەکتەرێکی چاکیت.

من پێشتریش وتبووم کە بردنی لاشەی "توزنباخ" لەگەڵ باروودۆخی شانۆکەتاندا ناگونجێت، بەلاّم "ستانسلاڤسکی" جەختی دەکرد کە هەڵگرتنی لاشەکە پێویستە. بۆم نووسی ئەو کارە پێویست ناکات، نازانم نامەکەمی پێگەیشتووە یان نا. ئەگەر نمایشنامەکە سەرنەکەوێت دەڕۆم بۆ مونت کارلۆو ئەمەندە دەخۆمەوە تا گەوج دەبم.

زۆر حەز دەکەم لە "نیس" بڕۆمە دەرەوە، بەلاّم بۆ کوێ بچم؟ ئێستا ناتوانم بڕۆم بۆ ئەفریقا چونکە دەریا زۆر نائارامە، نایشمەوێت بچم بۆ "یاڵتا" دەبێت لە مانگی فێبەرەوەریدا لە "یاڵتا"بم و لە سەرەتای ئەپریلدا بڕۆم بۆ مۆسکۆ. پاشان دەتوانین لە مۆسکۆوە بڕۆین بۆ شوێنێك.

من ئاگام لە هیچ نییە. ئاگاداری تەندروستیت بە، دڵدارەکەم، ئەکتەرە نائومێدەکەم، من لە بیرنەکەیت، کەمێك خۆشت بوێم، تەنانەت ئەگەر بە ئەندازەی پولێکیش

بێت. ماچت دەکەم، لە ئامێزت دەگرم، حەزدەکەم شادمان بیت.

سڵاو:

خاوەن ڕێزو ئاوەزەکەت ئانتونی

* * * * * *

**کنیپەر**

**22ی ژانیوەری**

**مۆسکۆ**

ئانتوانی ئازیزتر و چاکم! دیسان خەڵکی دێنە سەرت و نارەحەتت دەکەن. بۆ ناچیتە ئوتێلێکی تر؟ ئێستا کە دەمەوێت ئەم نامەیە بنووسم ئەوانەی دەوروبەرم قسە دەکەن و هەموویان پرسیارم لێدەکەن. لەگەڵ "ماشا"دا لە ئاپارتمانە تازە و ئاسوودەکەیدا کە تارادەیەك لە دەرەوەی شارە و کە زۆر تەریك و ئارامە شەوم گوزەراند. دوێنێ نمایشێکی باشی "مەلی دەریا"مان کرد (...) شەو بە تەواوی بڕیار لەسەر ئەوە درا کە "سێ خوشکەکە" لە 30 ژانیوەریدا دەست پێبکات، (ستانسلافسکی)یش هاتە ناو دەستەی کارەکەوە. "نیمروڤیچ" دەڵێت دەبێت "کاچالوڤ"[3] ڕۆڵی "توزنباخ" ببینێت. تۆ دەڵێی چی؟ بۆ هیچت لە بارەی تەرمی "توزنباخ"ەوە نەوتوە؟ (...)

دەبێت پەلە بکەم لە پرۆڤەدا، ماچت دەکەم و لە ئامێزت دەگرم. بیر لە بەهار و جوانی ژیان بکەرەوە، تۆ هەردووکیانت خۆش دەوێت، وانیە شاعیرەکەی خۆم؟

تووتکەکەت

* * * * * *

**کنیپەر**

**23ی ژانیوەری**

**مۆسکۆ – نیوەی شەو**

ڕۆژێکی تر تێپەڕی و نامەیەکت نەگەیشت هەرە ئازیزەکەم! ژیان بێ نامەکانت چەندە بێزراوە. کە لە پرۆڤە دەگەڕێمەوە بەسەر ئەم مێز و ئەو مێز و گۆشە و کەناری ژوورەکەدا دەگەڕێم بۆ ئەوەی بزانم شتێکم لە "نیس"ەوە پێنەگەیشتوە. گێژ و وڕ بە دەوری خۆمدا دەسووڕێمەوەو هەندێك جار تووڕە دەبم، ناتوانم بۆ چرکە ساتێك تەنیابم و ئەمەیش هەرگیز بۆم چاك نیە، ڕۆژ بە ڕۆژیش تادێت خراپتر دەبم، براکەم و ژنەکەی لە بیست و حەوتەمدا دەڕۆن بۆ پترۆزبورگ، من لە پێش "سێ خوشکەکە"دا دەتوانم پشوویەك بدەم. ڕۆژی بیست و حەوتەم دوا پرۆڤەی پەردەی چوارەم لەگەڵ "ستانسلافسکی"دا دەکەین. "ماشا". ئەو ژنە نازەنینە، نامەت بۆ دەنووسێت. من دەترسم پێش وەخت لە بارەیەوە هیچ بڵێم.

ئیتر قسەکردن لە بارەی شانۆوە بەسە، تەلگرافی 17ی ژانیوەریمت پێگەیشت؟ زۆر خۆشحاڵم بەوەی تەندروستیت باشتر بووە، بۆچی بۆم نانووسیت حاڵت چۆنە؟ ئەمە من خەمبار دەکات. وا هەست دەکەم تۆ بەرانبەر بە من ساردیت، دەبێت وێنەیەکی خۆتم بۆ بنێریت (...) هێشتا نازانم هاوین لە کوێ بەسەر بەرم، لە کوێ پێکەوەبین، لە کوێ دوور لە بێزارکردنی خەڵکیی خۆشەویستی خۆمان بکەین، دەمەوێت لەگەڵما هەست بە بەختەوەری بکەیت، حەز دەکەم سەربەخۆ بژین و کەس دەست نەخاتە

نێوانمـان، مـن دەزانم تـۆ چ جـۆرە ژیانێکـت پـێ خۆشـە شـاعیرەکەم، تـۆ چێژ لـە هـەموو شتێکی جوان و قەشەنگ وەردەگریت (...)

* * * * * *

**چیخۆف**

**24ی ژانیوەری**

**نیس**

دڵدارەکـەم، ژنـی دانسقە، لەبەرئـەوەی دەریا ئـارام نیـە نـاڕۆم بـۆ جـەزائیر، هاوڕێکانیـشم هەرناچـن، ئیـدی بـیری ئـەو سـەفەرەم لەسـەرم دەرکـــردوەو بـــە تـــەمام بـــچم بـــۆ "یاڵتـــا" خۆشـبەختانە بیـستوومە ئـاوو هـەوای ئـەوێ خۆشە و دایکیشم تەنیایە، وێنەکەی خۆمت بۆ دەنێرم (...)

بیـستم لـە پـەردەی سـێیەمدا تـۆ دەسـتی "ئایرینا" دەگریت و لەگەڵ خۆتا دەیبـەیت، بۆ؟ لەبەرئەوەیـە کـە لەگـەڵ بـاری دەروونـی خۆتـدا دەگونجێـت؟ نابێـت تـۆ لەسـەر کورسـیەکە بجوڵێیت، ئەی "ئایرینا" بەرەو لای تۆ نایەت؟ ئەگــەر ڕاســتت دەوێــت کۆلۆنیــل (پــتروف) نامەیــەکی دوورو درێــژی بــۆ نوســیوم، لــە نامەکـــەدا ڕەخنـــە لـــە "فـــدوتیك"، "رودو"، "سولیونی" دەگرێت، لە بارەی "ڤرشنین" و بێ ڕەوشتیەکانیەوە ناڕازیە. دەڵێت ئەو لەگەڵ ژنی یەکێکی تردا پەیوەندی هەیە (...)

خۆشـبەختانە ستایـشی سـێ خوشـکەکە و "ناتاشـا"ی کـرد. زۆریـش بـە شـان و بـاڵی "توزنباخ" یا خوێند.

باوە ئانتونی

* * * * * *

**کنیپەر**

**26ی ژانیوەری**

**مۆسکۆ**

*Bonjour, montres cher Antonio! Comment ca va? La sante et lhumeur vont bien, sans doute؟*

هـەموو نامـەکانتم بەدەسـت دەگـات، بۆیـە ماچێکی گەورە پێشکەش بە ئاکادیمیسینەکەی خۆم دەکەم، بەڕاستیی نازانم چ هەستێکم هەیە، تـەواو لـەوە دەچـێت یـەکێك دەسـت و قاچـم بەدەزوویەك رابکێشێت و منیش بێ بیرکردنەوە گوێڕایەڵی بم، تەنها لە کاتی نووستندا تەنیام و ئەمەیش مانای وایە من خۆم نیم، بێ ئاگایانە لە تەمەڵیدا دەژیم، ئەمەیش ترسناکە!

سبەی دوا پرۆڤەی "سێ خوشکەکە"یە، لە پـەردەی چـوارەمدا گـەلێك هەسـتم دەوروژێـت، دەڵـێن نواندنەکـەم زۆر سروشـتیە. لـە پـەردەی سـێیەمدا لەگـەڵ خوشـکەکانمدا قـسە دەکـەم، باشترە بڵێم دان بە شتەکاندا دەنێم، پچڕ پچڕ و لەسـەرخۆ، زۆر ئەسـتەمە دانپیانـان بـە دەنگـی بەرز نەبێت. تەنیا لەیەك شوێندا دەتوانم هاوار بکەم: "ئۆه ئولیا تۆ چەند سادەیت! من عاشقم، ئەمە چارەنووسی منە.." و هتد..

پاشان دیسانەوە ئارام دەبمەوە و گرژدەبم، ئـەو تـەواو بـێ جووڵـە دادەنیـشێت، دەسـتی لەســەر ئــەژنۆی هــەڵپێکاوە تــا لــە دەرەوەی شانۆوە دەنگـی "ترام ترام" دەبیستێت، ئینجا سـەر بـەرز دەکاتـەوە، ڕووی دەکرێتـەوە، بـە تووڕەییـــەوە هەڵدەســـتێت، خوشـــکەکانی بەجێـدێڵێت، وا دەزانم ئـەو بـەدەم "تـرام تـرام"

وتنەوە (لە دەستنووسەکەی تۆدا ژنەکە بە دەنگی بەرز دەیڵێت و پیاوەکە وەڵامی دەداتەوە) دەیەوێت بڵێت ئەو خۆشی دەوێت، واتا بە ئەریٚ وەڵامی دەداتەوە گوایا پیاوەکە ماوەیەکە چاوەڕێی دانپێدانانەکەیە، من لەسەر مێزێک دادەنیشم، لە نزیک رووناکیەکانی پێشەوە، وروژاوم، بە قەڵەمێک خەت خەتێن دەکەم، کاتێک کە ئەو گۆرانی دەڵێت ژنەکە سەیری دەکات و بزەی دێتیٚ، ئینجا روو وەردەگێڕیٚ، سەری دادەنەوێنێت و دەپرسێت (ترام ترام) پاش کاردانەوەکەی ژنەکە بە پەرۆشترەوە دەڵێت (ترا، لا)و پاشان بە جەخت لەسەر کردنەوە دەڵێت: (ترام ترام) ئەگەر هەموو ئەمانە بە زەردەخەنەوە بوترێن بازاڕی نیە، چونکە ئەمە ژوانێکە. چونکە هەتا ئەو شەوە پەیوەندییەکان پاکبووە، وا نییە؟

وا دەزانم ئێستا هەموو شتەکان بە چاکی بەرەو پێش دەچن، دەڵێن پەردەی چوارەم کە بە لێکدابڕانی "ماشا" و "ڤرشنین" دەست پێدەکات هەستێکی زۆر بەهێز دەوروژێنێت. لە بارەی دوا پرۆڤەوە، دوو سبەی بۆت دەنووسم. ئەمڕۆ سەدەمین نمایشی "فیودور" بوو. (...).

* * * * * *

**چیخۆف**

**26 ژانیوەری**

**نیس**

خۆشەویستەکەم، زۆر لەوە دەچێت بچم بۆ جەزائیر، نامەکانت هەر بە ئادرەسی "نیس" بنووسە، یان دەتوانیت یەک دوو نامە بۆ پۆستی ریستانی جەزائیر بنووسیت، لە جەزائیرەوە دەڕۆم بۆ "یاڵتا" و پاشان لەگەڵ تووتکەکەمدا دەچم بۆ شوێنێک (...)

سیٚ خوشکەکە چۆن بوو؟ بۆ پۆستی ریستانتی جەزائیر بۆم بنووسە، پشتگوێی مەخە، ئەم چەند رۆژەی دوایی ئێرە ساردبوو، تەواو وەک "یاڵتا". پێم خۆشە کە بەجێی دێڵم، ئەگەر ئەمشەو دەریا نائارام بوو ئازیزەکەم بە قسەی هاوڕێکانم دەکەم و دەڕۆم بۆ ئیتالیا، نەک بۆ جەزائیر بۆ ناپۆلی، وەلیٚ پێش ئەوەی شەودابێت نامەکەمت بۆ دەنووسم، شەو دەچم بۆ مارسیلس.. ئاه..!

بەلاٚم ورەم چاکە، حەزم لە سەفەرە، ئەم رۆژانەی دوایی بیرم لەوە کردۆتەوە کە هاوین بڕۆم بۆ "سپیتز بورگن"[4] یان "سلوٚڤیکا"[5]

* * * * * *

**چیخۆف**

**28ی ژانیوەری**

**نیس – یەکشەممە**

ئەم نامەیەت لە نیسەوە بۆ دەنووسم، دڵدارەکەم، لێرەوە دەچم بۆ فلۆرانسەو پاشان بۆ رۆما و ناپۆلی. لەویٚ نامەکانی "نیس"تم پیٚ دەگات. ناونیشانم بۆ نامەو تەلگوراف بەمجۆرەیە: پۆستی ریستانتی ناپۆلی. شانۆگەریەکەم کراوە یان نا؟ ئاگام لە هیچ نییە (...)

تا "چلەی رۆژوو" لەماڵەکەی خۆمدا دەبم لە "یاڵتا" رەنگە لە ئیتالیاوە بە کەشتی و بە رێگای "کورفیو"[6]دا بڕۆم.

**ئانتوانیوکەت**

* * * * * *

**چیخۆف**

**28ی ژانیوەری**

**نیس، یەکشەممە**

هەرە ئازیزەکەم، دانپێدانانەکەی "ماشا" لە پەردەی سێیەمدا زیاتر گفتوگۆیەکی راستەوخۆیە، هەرگیز نائومێدانە مەیلێ، بەلأم دەنگیشت زۆر بەرز مەکەرەوەو جارجارە زەردەخەنەیەکی لەگەڵدا بکە. بێ لەمانە رۆڵەکەت وا ببینە هەست بەوە بکرێت شەوەو ماندوویت. وایش هەست بکرێت کە تۆ لە خوشکەکانی ترت زیرەکتریت یان بەلایەنی کەمەوە خۆت وا بزانیت. لە بارەی "ترام ترام"ەکەوە خۆت چۆنت پێ باشە وای بکە، تۆ لە باتی منیت.

هەڵبەتە ئەمە زۆر بە ئارەزووەوە نانووسم. بەلأم پێ دەچێت "سێ خوشکەکە" شەکەتیان کردبم یان لە راستیدا لە نووسین و کەوتنە ساڵەوە ماندوو بووبم، نازانم، رەنگە بۆ ماوەی پێنج ساڵ واز لە نووسین بهێنم و بکەومە سەفەر کردن و پاشان دەست بە نووسین بکەمەوە.

باشە ئەی بڕیار نیە "سێ خوشکەکە" لەم وەرزەدا لە مۆسکۆ نمایش بکرێت؟ دەتەوێت کردنەوەکەی لە "پترزبورگ" بێت؟ بەلأم بڕوات هەبێت لە "پتروز بورگدا" چ ئومێدێکی سەرکەوتنی نییە (...) لەوێ زۆر ئاپوورە و جەنجاڵ دەبێت بەلأم هیچ سەرکەوتوو نابێت، بە داخەوەم (...)

"توتو"ی ئاکادیمی

* * * * * *

**کنیپەر**

**29ی ژانیوەری**

**مۆسکۆ**

زۆر زۆر سوپاس گوزارم بۆ وێنەکە، وەك هەموو وێنەکان ئاماتوریو بێ ڕەونەقە شەکەت دێیتە بەرچاو (...)

* * * * * *

**چیخۆف**

**29ی ژانیوەری**

**فلورانسە، دووشەممە.**

هەرە ئازیزەکەم، لە فلورانسەوە بۆت دەنووسم و لەوانەیە دوو رۆژ لێرە بمێنمەوە، تەنیا ئەتوانم بڵێم ئێرە زۆر خۆشە، ئەوەی ئیتالیای نەدیبێت نەژیاوە، ژوورەکەم هێند ساردە ئەگەر پاڵتۆیەکی فەروم پێبوایە لەناو ژوورەکەدا لەبەرم دەکرد.

"سێ خوشکەکە"نمایشکرا؟ ورەت باشە؟ چ پرسیارگەلێکی بێ سەرەو بەرەن؟ (...)

ئانتوانیوکەت

* * * * * *

"سێ خوشکەکە" رۆژی 31 ژانیوەری 1901 چوە سەر شانۆ، دوای نمایشکردنەکە بەردەوام کنیپەر تەلگورافی بۆ چیخۆف دەنارد

* * * * * *

**کنیپەر**

**31ی ژانیوەری**

**مۆسکۆ – تەلگوراف**

*Grand success embrasse mon bien aime*(7)

ئۆڵگا

* * * * * *

بەداخەوە تەلگورافەکە لە جەزائیرەوە بۆ "یاڵتا" نێرابوو، چیخۆف دوای گەڕانەوەی بۆماڵەکەی بینی و وەك ئەنجام ماوەیەك لە سەرکەوتنی نمایشنامەکە بێ ئاگا بوو.

* * * * * *

**چیخۆف**

**2ی فیبەروەری**

**رۆما**

نازەنینترین کچ، لە رۆمام، دوای هەفتەیەکی رێك ئەمڕۆ نامەکەتم پێگەیشت، وا ئەزانم خەتای شکست هێنانی نمایشنامەکەی من بێت، تەنانەت وشەیەکیشت لە بارەیەوە نەنووسیوە، گومان لەوەدا نییە کە سەرنەکەوتوە.

ئەم ئیتالیایە سەرزەمینێکی زۆر خۆشە، ولاتێکی بێ وێنەیە، تەنانەت لەم ولاتەدا سووچێك نادۆزیتەوە زاخاوی مێشکت نەداتەوە، من ئێستا لە رۆمام و لێرەوە بۆ ناپۆلی دەچم و پێنج رۆژ لەوێ دەمێنمەوە (واتا ئەگەر نامە بنووسیت دەتوانم لەوێ وەریان بگرم) پاشان دەچم بۆ "بریندیسی"[8] ولەوێوە بە رێگای "کورفیو"دا دەرۆم بۆ یاڵتا. بڕوانە چ گەڕیدەیەکم. جێگا گۆڕین و شتی تازە بینین زۆر لەوە باشترە لە ماڵەوە دابنیشیت و بنووسیت. تەنانەت ئەگەر شانۆ نووسینیش بێت، ئێمە، واتا تۆ و من دەچین بۆ سوید و نەرویژ. باشە؟ بۆ یادەوەری پیر بوونمان.

من لە لووتکەی تەندروستیدام، لە لووتکەدا، ئازیزم، نیگەرانی من مەبەو ئاگات لە خۆت بێت (...) ئەم رۆژانە بە جۆرێکی ترسناك نان دەخۆم. نامەیەکم لە "نمیروڤیچ"ەوە پێگەیشتووە زۆر بە چاکی باست دەکات.

**ئانتونیوی تۆ**

**خاوەن رێز و ئاوەزەکەت**

* * * * * *

**چیخۆف**

**4ی فێبروەری**

**رۆما**

خۆشەویسترین خۆشەویست، هێشتا لە رۆمام، لێرەوە دەچم بۆ "ناپۆلی" و لەوێوە بۆ "کورفیو" ئەگەر ببیستم کە هێشتا لە کوستەنتینیە تاعوون هەیە لە رێگای ڤیەناوە دەڕۆم بۆ روسیا (...) دوێنێ لە ناپۆلیەوە تەلگورافی "نیمروڤیچ"یان بۆ ناردم کە باس لە نمایشکردنی "سێ خوشکەکە" دەکات. دەڵێت رۆڵی ژن چاکترین رۆڵ بوو، ئێستا چاوەڕێی نامەی تۆم، سبەینێ بەرەو ناپۆلی دەچم و رەنگە چوار یان پێنج رۆژ لەوێ بمێنمەوە. نامەکانی تۆیان لە نیسەوە بۆ ئێرە ناردووە، بێ ئەوەی دانەیەکی لێ ون بێت، کەواتە هەر لە فێبروەریدا دەگەڕێمەوە بۆ یاڵتا. لەوێوە نامەی زۆرت بۆ دەنووسم تا یەکدی دەبینین و پێکەوە دەڕۆین بۆ شوێنێك، باشە؟ ماچێکی گەورە، تەندروست بیت و ورەت دانەبەزێت.

**ئانتەکەت**

* * * * * *

**کنیپەر**

**5ی فێبروەری**

**مۆسکۆ**

ئانتونی ئازیزم، چەندم پێخۆشە لەگەڵتدا بدوێم. زۆر شت هەیە دەبێت پێت بڵێم! (...) لە مۆسکۆ تەنیا باس باسی "سێ خوشکەکە"یە سەرکەوتنێکی مەزنە بۆ چیخۆف و شانۆکەمان. تووتکەکەت بە تەواوی ناوی دەرکردوە. "نوڤۆڤیرمای"[9] نووسیویەتی کە خاتوو کنیپەر و جەنابی "گروموف" بە درێژایی نمایشەکە بەرجەستەبوون. ئەمە گەورەیی نییە؟ (...) نامەیەکم لە براکەمەوە پێگەیشتووە دەربارەی ژوور لە پترۆزبورگ.

ژوورێکی باش بە نزیکەی 80 رۆبڵ لە مانگێکدا کە ئەگەر دوو کەس بیگرن نرخەکەی کەم دەکەوێت و ئاسانترە. هەموو لە بارەی گرانیە ئەفسانەییەکەی ژیانی ئەوێوە قسە دەکەن، ترسناکە. (...) هەموو شەوانی هەفتەی پێشوو نمایشم هەبوو بێجگە لە هەشتەم شەو کە "مردووەکانیان" لەگەڵ "مانت"[10] دا نمایش کرد. ئایا تۆ لە نامە نەناردنم بێتاقەتیت؟ من زۆر خۆشحاڵم، وەلێ ئازیزم نامەکانم هەموو ترسناکن و من خەجاڵەتم. تۆ لە من توورەنیت؟ هێشتا هەر خۆشت دەوێم؟ نەگۆڕاویت؟

ئانتوان هێشتا هەر هەمان کەپوو، ددان، قژ، چاوو ڕیشت هەن؟ گەلێك بەوە دڵم ناخۆشە کە ناتوانیت نمایشی "ماشا"کەم ببینیت، ئەگەر تۆ لێرە بویتایە زۆر بە خۆشی و دڵ و داوەوە ڕۆڵم بۆ دەبینیت.

کەواتە شەوێکی ئارامت بەسەر بردووە ئازیزەکەم؟ باری دەروونیت چۆنە؟ ڕاستە فلورانسا جوانیەکی رووتە؟ توانیوتە "پلازو پیتی"[11] و کاتدرائیەکە بەو دیمەنە جوانەوە ببینیت؟ بۆ من لەوێ لەگەڵتا نیم؟ ئەگەر لەگەڵتا بوومایە پێکەوە پیاسەمان دەکرد و زۆر چێژمان لەو ساتانە دەبرد (...)

ئەکتەرە چکۆڵەکەت.

* * * * * *

**چیخۆف**

**7ی فێبرووەری**

**رۆما**

ئازیزەکەم، دوو سەعاتی تر لە ڕێگای باکوورەوە دەچم بۆ روسیا، دنیا زۆر ساردەو بەفر دەبارێت و من هەرگیز حەز بەوە ناکەم بۆ ناپولی بڕۆم. کەواتە بە ناونیشانی یاڵتاوە بۆم بنووسە، هیچ نامەیەکم لە تۆوە دەربارەی "سێ خوشکەکە" پێنەگەیشتووە، هەرچەندە بە تەلگورافێك پێیان وتم کە لەسەردەمی نوێ "نوڤۆڤرمیا" تۆی بە چاکترین ئەکتەر ناودێر کردووە.

لێت دەپاڕێمەوە گشت وردەکاریەکانم بە ئادرەسی یاڵتا بۆ بنووسیت (...)

ئانتونیوکەت.

* * * * * *

**کنیپەر**

**8ی فێبرووەری**

**مۆسکۆ**

تەنیا دەمەوێت ئەوەت بۆ بنووسم کە من ئەمڕۆ چەندە لە بیری تۆدا بووم و ئەمەیش ئاسوودەیی پێدام. ئازیزم، چەند لە من دووریت! من ناتوانم تا کۆتایی زستان و کۆتایی وەرز کە ئیتر هەموو رۆژ و سەعاتێك

لەگەڵتا دەبم ئارام بگرم. خۆزگا دەتزانی چەندە پەرۆشی ئەو رۆژانەم، لە کوێ یەکدی دەبینین؟

ئەگەر شانۆگەریەکە بەبێ من نمایش بکرێت رەنگە لە مانگی مایسدا ئیتر ئازاد بم، گەلێك ماندووم، لە پێکەوتووم، وا هەست دەکەم یەکێکی ترم، وا چاوەڕوان دەکەم کە پێم پێبکەنیت، هەموو دەڵێن ئەم کچە هێندە خۆی ماندوو دەکات دەیەوێت لە پێ بکەوێت. وەك سمۆرەی ناو قەفەس شڵەژاوەو وا دەزانێت کارێکی ڕاست و زرنگانە دەکات.

باوا بێت، پێبکەنە ئانتوانی ئازیز بەلاَم من ناتوانم بێ ئەم شتانە بژیم. هەرگیز، هەرگیز شەکەت نابم، هەندێك جار هێورم و دەتوانم وەك خۆم دەمەوێت بژیم، ناتوانم ئەو ژیانەی کە خۆم دەیخوازم لێرە بیکەم، واتا ژیانێك کە کاتمی تیا بە فیڕۆ نەڕوات و ناچار نەبم لەگەڵ کەسانێکدا بم کە خۆشم ناوێن و شێتم دەکەن. زۆر حەز دەکەم ئانتوان بتبینم، تەماشای وێنەکەت دەکەم و گوێم لە پێکەنینتە، هەموو شتێکت دەبینم، لەو چاوە نائاسایانەتدا نیگایەك بەدی دەکەم، گوێم لێیە کە پێم دەڵێیت "کچی شکۆمەند" ئەمەم زۆر پێ خۆشە.

ئیتالیات پێ خۆشە، لەوێ ژیان چەندە پڕە. سروشت، شیعر و مێژوو!! (...)

ئۆڵگاکەت

**پەراوێزەکان**

1-تەلگوراف بکە نیگەرانی تەندروستیتم. ئۆڵگا.

2-تەندروستیم زۆرباشە. ئانتوان.

3-*Kachalov*

4-*spilzburgen*

5-*solovka*

6-*corfu*

7-سەرکەوتنی زۆر، دڵدارەکەم لە ئامێزت دەگرم.

8-*Brindisi*

9-*Novovermya*

10-راکاترینا میخایلوڤنا مانت ئەندامی تیپی هونەری شانۆ، خوشکی یەکەم ژنی مایرهۆڵدە.

11-*palatzoo pitti*

**سەرچاوە:**

کتێبی دلبند عزیزترینم ل 119-131

# وێستگەکانی سەردەم

- میشیل فۆکۆ و پشتیوانی لە ئیسلامیزمی ڕادیکاڵ
  لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

- ئەلبرتۆ مانگویل: بەندکردنی بۆرخس
  نزار ئاغری
  لە عەرەبییەوە: ئازاد

- سەرنجێك لە زمان و شوناسی کورد لە کرماشان
  محەمەد باقر پیری
  لە فارسییەوە: هێرش بێتووشی



# میشێل فۆکۆ و پشتیوانی لە ئیسلامیزمی ڕادیکاڵ

لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

لەم ساتەدا کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرگەرمی چاودێریکردنی گۆڕانکارییە سیاسی و ئاینییەکانە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەتایبەت سەبارەت بە ئێران، دوو پرۆفیسۆری زانکۆی ***Purdue*** گەڕاونەتەوە بۆ وەڵامی خۆرئاوا بۆ ئەو شۆڕشە- لەڕێگەی نوسینەکانی فەیلەسوفی فەرەنسی میشێل فۆکۆ کە لەبارەی شۆڕشی گەلانی ئێرانەوە ڕاپۆرتی هەیە دیراسەیان داوە.

لەمانگی حوزەیرانی 2005دا خاتوو جانێت ئەفاری پرۆفیسۆر لە مێژوو و دیراساتی ژنان و کێڤین ب. ئەندێرسۆن پرۆفیسۆری زانستی سیاسی کتێبێکیان بڵاوکردەوە بەناونیشانی "فۆکۆ و شۆڕشی گەلانی ئێران: جێندەر و تەفرەدانەکانی ئیسلامیزم" بڵاوکردۆتەوە. لە پاشەکی ئەو کتێبەدا ڕاپۆرتەکانی میشێل فۆکۆ کە لەسەر شۆڕشی گەلانی ئێران نوسیونی بڵاوکراوەتەوە و وەرگێردراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی و زۆرێک لەو ڕاپۆرتانەش بۆ یەکەمینجارە بڵاودەکرێنەوە.

ئاندێرسۆن دەڵێت" میشێل فۆکۆ یەکێکە لە فەیلەسوفە زۆر بەناوبانگەکان و لە سەردەمی ئیستەماندا لەناو زۆرێک لە بیرمەنداندا دیارترینیانە کە بەشێوەیەکی فراوان خوێندنەوە بۆ بۆچوونەکانی کراوە".

هەروەها دەڵێت" بەسەدان کتێب و گوتار لەبارەی فۆکۆوە نوسراوە و کاریگەری ئەم فەیلەسوفە لەسەر مێژوو و فەلسەفە و زانستی سیاسی و پەروەردەوە ڕاڤەکراوە. هەرچۆنێك بێت ڕاپۆرتەکانی فۆکۆ لەسەر شۆڕشی گەلانی ئێران زۆر نەناسراون لەبەرئەوەی لە کاری ڕۆژنامەنوسیدا ئەو ڕاپۆرتانەی لەماوەی دووجار سەفەرکردنی بۆ ئێران نوسیونی ئیستا بەتەواوەتی فەرامۆش کراون. کتێبەکەی ئێمە لەڕاستیدا سەرچاوەیەکی تەواوە بە زمانی ئینگلیزی کە ڕۆشنایی دەخاتە سەرنوسینەکانی فۆکۆ لەبارەی ئێرانەوە".

خاتوو جانێت پێی وایە لە کۆتایی ساڵانی 1970کاندا گەلانی ئێران ویستیان کەلتورێکی جیاواز لە بەخۆرئاوایکردن و بە مۆدێرنەکرن بخوڵقێنن بۆیە شۆڕشیان کرد. لە ئەنجامدا شا لە وڵات وەدەرنرا و سەرکردەی شیعەی مەنفی ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا خومەینی گەڕایەوە و دەسەڵاتێکی ئیسلامی دامەزراند. لەماوەی 1978 و 1979 وە دواتریش دنیای خۆرئاوا بۆیەکەمین جار تێبینی خۆیان لەبارەی شۆڕشەکە و ئیسلامیزمی ڕادیکاڵەوە هەبوو. لەو بارەیەوە خاتوو جانێت دەڵێت" تێگەیشتنی پێشوتری فۆکۆ لەسەر شۆڕشی گەلانی ئێران تەواو جیاوازتربوو لە بۆچوونەکانی دواتری، وە پێی وابوو کە بزوتنەوەی ئیسلامیەکان ڕۆڵی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەگۆڕێت وە

بەشێوەیەکی فراوان بەشداری گەمە سیاسییەکانی جیهان دەکەن". فۆکۆ کە راپۆرتەکانی بۆ رۆژنامەی بەناوبانگی ئیتالی *"Corriere della sera"* ئامادە دەکرد و بە فەرەنسیش بڵاوی دەکردەوە، دوو جار سەردانی ئێرانی کردووە و لە پاریسیش چاوی بە خومەینی کەوتووە. هەرچۆنێك بێت نوسینەکانی فەیلەسوفی ناوبراو پڕبایەخ بوون لەبەر ئەوەی نوسینەکانی خاڵی بوون لە رەخنەگرتن لە شۆڕشەکە و سەرکردە ئیسلامیەکەی.

زورێك لە نوسینەکانی فۆکۆ باسکردنە لە قەیرانەکانی مۆدێرنیتی لە ئەوروپادا. فۆکۆ*(1926-84)* بە زۆرێك لە فۆرمی پیشکەوتنخوازی تێزەکانی نوسیوە، وەك ئەوەی دەبینرێت لەبارەی پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیاوە قسەی هەبووە کە پێی وایە تەکنەلۆژیا هێندەی کۆنترۆڵکردنی کەسەکانە هێندە ئازادیان ناکات. خاتوو جانێت دەڵێ" خەڵك پرسیاری ئەوەی هەیە کە چۆنە فوکۆ ناتوانێت رەخنە لەم شۆڕشە بگرێت؟"

هەروەها دەڵێ" لەبەرئەوەیە کە ئەو سۆزێکی بۆ شۆڕشی گەلانی ئێران هەبووە لەبەر ئەوەی ئەو شۆڕشە جۆرێکی جیاوازبوو لە شۆڕش کە بەربەرەکانی مۆدێلی پێشکەوتوی خۆرئاوای دەکرد".

خاتوو جانێت بە جیاواز لە بۆچوونەکانی ئەندێرسۆن پێی وایە فۆکۆ نەك رەخنەی لە ستەمکاری حکومەتی تازەی ئێران دەگرت دژ بە ژنان و هۆمۆسێکسواڵەکان بەڵکو رەخنەی لەو بارەیەشەوە هەبوو کە رەفتاری حکومەتی تازە لەگەڵ کەمایەتیەکانی گروپ و ئاینیەکاندا ئاسایی نەبوو. بۆنمونە سەرجەم ژنانی ئەو وڵاتە ناچار کران کە حیجاب بکەن و قژیان داپۆشن، زۆرێك لە پیاوە هۆمۆسێکسواڵەکان لە سایەی رژێمی ئیسلامیدا لەسێدارە دران. ئەو رژێمە ئیسلامیە هەوڵیدەدا کاریگەری لەسەر دەرەوەی خویشی جێبهێڵێت.

ئایا فۆکۆ ئەوەندە پابەند بوو بە کێشەی ژنانەوە، یاخود دەیویست رەخنە لە شۆڕشەکە بگرێت و لە پێشێلکاری مافەکانی ژنان و مافی گروپ و ئاینە کەمینەکان ئاگاداریان بکاتەوە؟ رەنگە ئەمە تەنها لەو بارەیەوە بێت کە فۆکۆ فەیلەسوفێکی دیار و بیرمەندێکی سەردەم بووە و نوسینەکانی بە شێوەیەکی فراوان خوێندراونەتەوە، بەکورتی فۆکۆ فەیلەسوفێك بووە چاوی خوێنەری لەسەر بووە بۆیە زیاتر ویستویەتی رەخنە لە شۆڕشەکە بگرێت و گەلانی جیهان لە خەوشی شۆڕشی گەلانی ئێران ئاگادار بکاتەوە.

هەرلەو بارەیەوە خاتوو جانێت ئەفاری نوسەری کتێبی "شۆڕشی دەستوری گەلانی ئێران 1906-1911"یە (چاپی زانکۆی کۆلۆمبیا1996). ئەم خانمە ئیستا لێپرسراوی دیراساتی نێونەتەوەییە تایبەت بە کۆمەڵگەی ئێران. هەروەها ئەندێرسۆن نوسەری کتێبی" لینین، هیگڵ، مارکسیزمی خۆرئاوایی"یە( چاپی زانکۆی ئیلینۆیس 1995). ئەندێرسۆن لەو بارەیەوە دەڵێت" چارەکە سەدەیەك دوای ئەوە، مشتومڕەکان لەبارەی شۆڕشی 1978 و 1979 بەردەوامن و تا ئەمڕۆش دیبەیت لەو بارەیەوە دەکرێت". هەروەها ئەندێرسۆن نوسیویەتی" تا 11ی سێپتەمبەریش گەورەترین مشتومڕ لەسەر شۆڕشی گەلانی ئێران بوو کە چۆن وەڵامی ئیسلامیزمی رادیکاڵ بدرێتەوە" ئەمەش لەوە سەرچاوە دەگرێت کە چەندە گرنگە لە راپۆرت و نوسینەکانی فۆکۆ رامێنین سەبارەت بەو رووداوانەی کە تەواو سەرنجی خۆرئاوای بەرەو ئیسلامیزمی رادیکاڵ راکێشا.

سەرچاوە:

*WEST LAFAYETTE, Ind. – July 8, 2005*



# ئەلبرتۆ مانگویل: بەندکردنی بۆرخس

نزار ئاغری

لە عەرەبییەوە: ئازاد

بە تەنها قەدەر خۆی، بەشێوەیەکی گاڵتە ئامێزانەی ڕوونیشەوە، لە یەك کاتدا خۆشەویستیی کتێب و کوێریی بە خۆرخێ لویس بۆرخس بەخشی. جیهانەکەی جیهانێکی "کتێبی" بوو، جیهانی ئەو وشە و ڕستەو پیتانەی کە وەکو بوونەوەری زیندوو بە دەوریدا هەڵبەز و دابەز دەکەن، گەرچی نەیدەتوانی ئەو کتێب و وشانەش ببینێت. پەیوەندیەکە پەیوەندییەکی رووحی بوو، کە لە نێو دڵیدا چەقی بوو، خولیایەکی بێکۆتاییش گەشەی پێدەدا.

بۆرخس عاشقی کتێب بوو، هەربۆیە بە وشەوە نووساو لە ڕەنگ و مۆسیقاو دەنگ و شێوە دوورکەوتەوە.

هەر قەدەریش لاوێکی بۆ نارد، کە ئەویش هەڵوەدای کتێب بوو، تا ڕۆمان و چیرۆك و شیعر بۆ برخس بخوێنێتەوە. بۆرخس بە چاوی ئەو لاوەوە دەیخوێندەوە و ئەو لاوەش بە خەیاڵی بۆرخسەوە بە نێو دێڕەکاندا دەهات و دەچوو.

ئەم لاوە ئەلبرتۆ مانگویل بوو کە دواتر سەبارەت بە خولیای بۆ کتێب و هەڵوەدایی بۆ پیت و سەوداسەریی بۆ نووسین، دەنووسێت.

هەروەکو بۆرخس دەربارەی کتێبخانە و شوێنە خەیاڵاوییەکان و دەروازەکانی بەهەشت و ئینسایکلۆپیدیاکان و چیرۆکە سەیر و سەمەرەکان دەنووسێت. دەربارەی مێژووی خوێندنەوە دەنووسێت. بەڵام هەروەها سەبارەت بەو بوونەوەرە خورافییەش دەنووسێت کە لە پێناوی کتێب و لەسای کتێبدا دەژی.

"هاودەمیی بۆرخس" ئەو کتێبەیە کە چیرۆکی ئەو خۆشەویستییە گەورەیە دەگێڕێتەوە: خۆشەویستیی وشە و پیتەکان. خۆشەویستیی هاوبەشی بۆرخس و مانگویل.

لە ڕێی مانگویلەوە دەزانین کە بۆرخس وێڕای نابیناییەکەی حەزی بە سەفەر دەکرد. زۆر بایەخی بە تەنە فیزیکەکانی جیهانی چواردەوری خۆی نەدەدا جگە لە تەنی ئەو کتێبانەی کە چێژی لە هەڵگرتن و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانیان و دەستدان لە بەرگەکانیانەوە دەبینی، هەروەکو ئەوەی بوونەوەری زیندوو بن. (بە ئەڵهاوە) باسی بیابانی عەرەبی و ئاسەوارە یۆنانیەکان و پەیکەرە ڕۆمانیەکان و سەهۆڵبەندانی ئایسلەندی‌و شەقامە قیرتاوکراوەکانی جنێڤی

دەکرد. ئەم شتانە ڕەنگدانەوەی هەندێ شتی تر بوون کە پێشتر لە کتێبەکاندا خوێندبوونیەوە. لە پێشدا کتێب دێت پاشان واقیع. بەلای ئەوەوە ئینجیل و ئەلیادەو هەزار و یەکشەوەو ڕامایانا زۆر واقیعیترن لە واقیع.

خۆشەویستی بۆ هونەری شێوەکاریش هەر لە خۆشەویستییەوە بۆ ئەدەب سەرچاوەی گرتبوو. ئەو هونەرە چەند لە دەقی ئەدەبی و شیعر و خەیاڵەوە نزیك بووایە، ئەوەندە سەرنجی ڕادەکێشا. بایەخی بە نیگارەکانی بلیك و ڕامبرانت و هاوڕێ کاتالۆنیەکەی واتە خول سولار و نورای خوشکی دا. بەلاَم ڕقی لە تابلۆکانی ئالگریکۆ بوو کە پڕ بوون لە قەشە و پیاوانی ئایین و دەتگوت نیگاری ڤاتیکانن.

ناوبەناو گوێی لە موزارت دەگرت و بەوە دڵگەرم دەبوو و هاواری دەکرد چۆن ئەو هەموو ماوەیە توانیویەتی بەبێ موزارت بژی. بەلاَم هەر کە ئەو چرکە "مۆسیقی"یە تێدەپەڕی، ئیدی دەگەڕایەوە نێو دونیای کتێب و هەموو شتێکی لەبیر دەچووەوە.

بەلای بۆرخسەوە کتێب کرۆکی ژیانە: ژیان لەگەڵ کتێبدا، خوێندنەوەی کتێب، نووسینی کتێب، گفتوگۆ لەگەڵ کتێبدا، قسەکردن سەبارەت بە کتێب. "قسەکردن سەبارەت بە کتێب گفتوگۆیەکە کە لە سەرەتای مرۆڤایەتیەوە دەستی پێکردووە و هەرگیزیش کۆتایی نایەت".

بەلای بۆرخسەوە جیهان وەکو کتێبخانەیەك وایە. کتێبخانە ئەو وێنە ئایدیالیەی ئەو گەردوونەیە کە وا لە زەینی ئەودا. کتێبخانە بەهەشتە.

ئینسایکلۆپیدیا و فەرهەنگەکان ئەو شارو دێ و وڵاتانەن کە خۆشیدەوێن. بۆرخس لە ئینسایکلۆپیدیاکاندا سەردانی وڵاتانی دەکرد و شوێن ڕووبارەکان دەکەوت و بە کێوەکاندا هەڵدەگژاو دەیڕوانییە تاڤگەکان. گەشتەکانی لەلاپەڕەکاندا بوو و لە ناو دڵی کتێبە ئەستوورەکاندا دیدەنیەکانی ئەنجامدەدان. کتێبخانەکەی لە ماڵەوە کتێبەکانی خۆی تیانەبوو، چونکە کتێبەکانی هی ئەو نین، بەڵکو هی ئەوانی ترن.

پەیوەندی بە واقیعەوە بە تەنها کاتێك دروستدەبێت کە ڕەوایەتیی خۆی لە کتێبەکانەوە وەرگرتبێت. واقیع هەموو شتەکانی خۆی لە کتێبەکانەوە وەردەگرێت. کتێبەکان باشترین چوارچێوە و بگرە تاقە چوارچێوەش بۆ ژیانی پێکدەهێنن.

ئامرازی گەورەی ئەو بۆ زاڵبوون بەسەر بیرۆکەی مەرگدا لە زماندا بوو. بۆرخس خۆی بە زمان تێراو دەکرد و دەیخستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و پەرەی پێدەدا و ڕێکیدەخست، وەك ئەوەی زمان درەختێکی نەمر بێت لای ئەو. بۆرخس وەکو باخەوانێك بوو لە باخچەی زماندا.

بۆرخس زانیبووی چۆن مامەڵە لەگەڵ زماندا دەکات و ئاسۆیەکی وای لەبەردەمدا والاَکرد کە پێشتر کەس پەی پێنەبردبوو. لەوە دوودڵ نەبوو کە بڵێت کەس لە بواری زمانی ئیسپانیدا شتێکی تازە ناخوڵقێنێت، هەربۆیە قەسیدەی "بۆ نووسەرێکی لاو"یشی نووسی.

**بێهوده ئەوەت بە بیردا دێ شتێکی نوێ بخوڵقێنیت چونکە هەرچییەك بنووسیت ناتوانی بۆرخس تێپەڕێنیت**

خەون یەکێك بووە لە کەڵکەڵە ئەبەدییەکانی بۆرخس. ئەو هەمیشە ویستوویەتی نەك سەبارەت بە خەون بنووسێت، بەڵکو وەکو خەون بنووسێت. لەم بارەیەشەوە نووسیویەتی:

من هەمیشە هەوڵمداوە چیرۆکێك بنووسم وەکو خەون بێت، بەلام وا هەستدەکەم هەرگیز لەوەدا سەرکەوتوو نەبووم.

خەوتن شتێکی زۆر خۆش بوو، کە بۆرخس بە تاسووقەوە چاوەڕێی دەکرد، چونکە پڕ بوو لە خەون. ساتەکانی بەر لە خەوتن لە ساتەکانی خۆ ئامادەکردن بۆ چوونە ناو دونیایەکی تر دەچوو کە تەواو لەم دونیایە جیاوازە. ئەو ساتە ناسکەی ئەکەوێتە نێوان بێداری و خەونەوە، ساتێکە بە وشە وەسف ناکرێ. دەبێ مرۆڤ خۆی بۆ ئامادە بکات تا بە رۆحی خۆی هەست بە

شەبەنگەکەی بکات، چونکە ئەوە ساتێکە کە دووبارە نابێتەوە. "هەندێ وشە لەبەر خۆمەوە دەڵێمەوە کە مانایان نییە، هەندێ شوێنی نادیار دەبینم، ڕێ بە دەروونم دەدەم بە نشێوی خەونەکاندا هەڵبخلیسکێت".

گەر خەون کەڵکەڵەی بۆرخس بووبێت، ئەوا توونـاوتوون مۆتەکەی بووە. وەکو ئاوێنەش. ئەمانە شتگەلێك بوون کە بەسەر ڕۆحیدا زاڵ بوون. کە منالّ بوو، بۆ یەکەمجار ڕێکەوتی توونـاوتوونی کرد، کە نیگارێك بوو لە بنی قاپێکی مسدا هەڵکۆڵرابوو: خانوویەکی بێدەرگا، لە ناویدا وەحشێك هەبوو. منالّەکە لەناو خانووەکەدایە و وەحشەکەش دەیەوێ پەلاماری بدات.

ئاوێنەکانیش دەیترسێنن، چونکە کاتێك دەیبینی، دەترسا سەیری ئاوێنە بکات، چونکە دەموچاوێکی تری تیا دەبینی. دەموچاوی کەسێکی تر کە لە خۆی ناچێت. یان دەترسا لەوەش خراپتر بێت، ئەویش ئەوەیە کە هیچی تیا نەبینێت.

مرۆڤ بەردەوام چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە ئاوێنە دەموچاوی پیشانبداتەوە، بەلام ئەی ئەگەر لەبری ئەوە بۆشاییەکی قووڵی پیشاندا؟

بۆرخس لە جنێڤ لەسەر پێخەفێك ڕاکشابوو، کە کەمێك بەر لە مەرگی، مرگرێت یۆرسنار سەردانی کرد. بۆرخس داوای لێکرد بچێت بۆ ئەو خانووەی کە پێشتر بۆرخس تیابوو و پاشان بێتەوەو وەسفی خانووەکەی بۆ بکات.

یۆرسنار بە قسەی کرد، بەلام باسی ئەو ئاوێنە زەبەلاحەی نەکرد کە لە دەروازەی ماڵەکەدا هەڵواسرا بوو. نەیویست ترس بخاتە گیانیەوە. دەبوایە ئەو ژینگەیەی چواردەوری بۆرخس پڕبووایە لەو شتانەی کە پەیوەندییان بە کتێبەوە هەیە. یادی وەکو کۆڵۆنییەکی پڕ کتێب وابوو. ئەم کۆڵۆنییە ئەرشیفێکی گەورەی کتێبی تیابوو.

بەردەوام کتێبێك هەیە کە خەڵك نەوە دوای نەوە بۆ یەکتری جێدەهێڵن. ڕاستیەکەی دەقێك جارێك نووسراوەو دواتر بەردەوام هەمان دەق نووسراوەتەوە. گەر کتێبێکیش ون ببێت، کەسێك دێت و بۆ جارێکی دی دەینووسێتەوە.

هەندێ نووسەری هەن تەقللا ئەدەن جیهان بخەنە دووتوێی کتێبێکەوە. هەندێ نووسەری تریش هەن جیهان بەلایانەوە کتێبێکی

هەمیشە کراوەیە. جیهان بەلای بۆرخسەوە بریتی بوو لە کتێبێکی بێ کۆتایی، لەوەشدا بەختەوەر بوو کە زانیی چۆن ئەم کتێبە بخوێنێتەوەو چۆن پەی بە مەغزاکەی بەرێت. ئەو لەوە دڵنیابوو کە بەختەوەری وا لەناو لاپەڕەی کتێبەکاندا.

دوا وشەی ئەوەبوو کە وتی: "نازانم بۆچی باوەڕم وایە کە هەر کتێبە بەختەوەری بۆ ئێمە دەهێنێت. منیش لەم ڕووەوە سوپاسگوزارم".

پێدەچێ لە دوا چرکەکانی ژیانیشیدا هەر ئەم هەستە بەسەریدا زاڵبووبێت. واتە لە 14ی حوزەیرانی 1986دا لە جنێف ماڵاوایی لە ژیان کرد، ئەو شارەی کە تیایدا هاینێ و ڤیرجیل و کیپلینگ و دی کوینسی خوێندەوە.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی (الحیاة) ژمارەی ڕۆژی 2006/8/15.

# سەرنجێك لە زمان و شوناسی کورد لە کرماشان

محەمەد باقر پیری

لە فارسییەوە: هێرش بێتووشی

زمانی کوردی رابردوویەکی چەند هەزار ساڵەی هەیە و تەنانەت لە کەتیبەکانی "بێستون" و "تاقی بوستان"یش کۆنترە. پەرتووکی ئاوێستا کە یەکێ لە گرنگترین بەڵگە نووسراوەکانی وڵاتی ئێرانە، بە وتە و نووسینی زۆربەی هۆزان و کارناسان بە زمانی هەورامی (گۆرانی) نووسراوە، یان لانی کەم لە ناو زمان و زاراوەکانی ئێستای ئارياییدا لە هەورامی نزیکترە. زمانی کوردی لە زمانە سەربەخۆ و ریشەدارەکانی هیند و ئاریایی (هیند و ئێرانی)یە، بە جۆرێك "مینۆرسکی" و "سەرسیدنی ئەسمیت"

زمانی کوردیان بە زمانێکی سەربەخۆ و جیا لە هەر زمانێکی تر زانیوە و بگرە بە دایکی زمانەکانی تری ئێرانی وەك فارسی و.. ناو بردووە. درەختی زمانی کوردی لك و پۆپەکی زۆری لێدەبێتەوە. بۆ نموونە "میر شەرەفخانی بەدلیسی" زمانی کوردی بە چوار لکی "کرمانج، گۆران، لۆڕ و کەلهوڕ" دابەش دەکات و مینۆرسکیش بە سێ لکی ئەردەلانی باشوور، کەلهوڕی رۆژهەڵات، سۆرانی و موکریانی باکوور (کرمانجی) دابەش کردووە. بەڵام لەمڕۆدا باشترین شێوەی شیاو و یەکگرتووی دابەشکاری ئەوەیە کە زمانی کوردی بە چوار شێوە دوان و زیاتر لە دەیان زاراوە دەستەبەندی دەکرێت:

1–کرمانجی باکوور کە کوردەکانی تورکیە، سورییە، بادینانی عێراق و بەشێك لەئازەربایجانی رۆژاواوخوراسان. گفتوگۆی پێدەکەن.

2–کرمانجی ناوین یا سۆرانی کە کوردەکانی سلێمانی، هەولێر، موکریان و ئەردەڵان قسەی پێدەکەن.

3–کرمانجی باشوور کە خەڵکی کەلهوڕ، لەك، لوڕ، فەیلی و بەختیاری پێی دەئاخافن.

4–گۆرانی کە هەورامی، زازایی و.. سەر بەم شێوە دوانەن.

## کرماشان، زمان و شوناسی کوردی

وشەی کرماشان کە لە کرمانج وەرگیراوە بە واتای مسکێن و وەزێر هاتووە و کرماشان کۆی کرماجان – وەرزێرانە و هیچ ناچێتەوە سەر ئەو ناوە هەڵبەستراوەی کە گۆیا: "بەهرام" شای کرمان، کاتێك کە

فەرمانڕەوایەتی کرماشانی بەدەستەوە گرتووە، بە بۆنەی فەرمانڕەوایی و شایەتی خۆی ناوی "کرمان + شا" کە ناسناوی خۆی بووە، بۆی داناوە، ئەوە هەڵەیەکی جێکەوتوویە و هیچ پێوەندی بە کرماشانەوە نییە. بەڵام بەداخەوە وشەی کرمانشا لە سەردەمی قاجارەوە کەوتە نێو ئەدەبیاتی نووسراوی ئیدارەکان و خەڵکیش لە نووسراوەکانی خۆیاندا ناچار بوون واژەی هەڵەی "کرمانشا" لە بری "کرماشان" بەکاربەرن و ئەوە سەرەتایەك بوو بۆ سڕینەوەی شوناس لە گەورەترین و کاریگەرترین شاری کوردستان. کرماشان تا بەر لە هاتنە سەر کاری قاجارەکان یەکێ لە ناوەندە گرنگەکانی سەرهەڵدان و جوڵانەوە رزگاریخوازەکانی کوردان بووە. بۆ نموونە دوای جێگۆڕکێی دەسەڵات لە مادەکانەوە بۆ پارسەکان بە هۆی "کوورش"ەوە، یەکەم شۆڕش بۆ ستاندنەوەی دەسەڵات بۆ مادەکان بە هۆی "گیوماتا" لە کرماشان دارێژرا. وێنەکاری زەق و بەرچاوی بە دیل گرتنی ئەو شۆڕشگێڕە کوردە لەلایەن داریووشە لە بێستوون، بێ هۆ لەو شوێنە کەندەکاری نەکراوە. هەروەها لە سەردەمی هێرشی عەرەبەکان بۆ سەر ئێران و خۆ سەپاندنیان بەسەر ئەو وڵاتە و وڵاتانی تری دەوروبەردا، ئەوە کرماشان بوو بە ئایین و زمانی عەرەبەکان رازی نەبوو و وەك ناوەندێکی پارێزەری ئایین و زمانی کوردانی لێهات. لە ڕاستیدا یەکەم شۆڕش لە دژی خۆسەپاندنی عەرەبەکان، لە ناوچەکانی کرماشان و کێوەکانی "شاهۆ" و "دالأهو" لە ژێر ناوی جوڵانەوەی نەتەوەیی – دینی "یارسان"دا بناغەڕێژ کرا. ئەو جوڵانەوە دینییە شێوە سازدانەوەیەك و ئاوڕ وە سەردەمی بەر لە هروژمی عەرەبەکان و رەتکردنەوەی دینی لاوەکیان بوو. ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە تەواوی ناوچەکانی تری ئێران و وڵاتانی وەك میسر و.. وێڕای ئەوە کە ئایین و زمانی عەرەبەکانیان قبوڵ کردبوو، بەرهەمەکانی خۆشیان بەو زمانە دەنووسین، بۆ نموونە بەرهەمەکانی "ئیبن سینا"، "غەزالی"، "بیروونی" و.. بەڵگەیەکن بۆ ئەم وتەیە. بەڵام کرماشان بە تەنیایی و بە پشتیوانی خەڵك رەسەنایەتی خۆی و زمانی کوردی پاراست و یەکەم بەرهەمی نووسراو لە پەخشان و هۆنراوەی کوردی تایبەت بەو سەردەمەیە. وەك هۆنراوەکانی "بابە تاهیر" و ئامۆژگاریەکان و هۆنراوە دینییەکانی یارسان.

کرماشان لە دەورەکانی دواییشدا هەر ناوەندی شۆڕش و سەلمێنەری بوونی خۆی و زمانی کوردی بووە. بۆ نموونە "کەریم خانی زەند" بە هەوەڵ و هاوکاری هۆزەکانی "کەلهوڕ"، "زەنگەنە"، "زەند"، "لەك" و "لوڕ" بە پاشایەتی ئێران گەیشت و هێز و دەسەڵاتی بۆ جارێکی تر بۆ کوردان گەڕاندەوە کە بە شایەتی مێژوو ئەو سەردەمە یەکێ لە باشترین و ئارامترین دەورەکانی مێژووی شایەکانی وڵاتی ئێران بووە. چونکە ئەو هیچ کات قەلاچۆی بە کۆمەڵ و تاڵان و بڕۆی نەکرد و وەك سەردەمەکانی بەر لە خۆی پەلاماری هیچ وڵاتێکی نەدا. هێزەکانی کورد هاوڕێ لەگەڵ سەرۆکیاندا سەلماندیان کە بە ڕاستی ئەوەی "دیاکۆ"ی مادن. ئەو مادانەی کە یەکەم حکومەتی شۆرایی و هەڵبژێراویان لە مێژووی ئێراندا دامەزراند. هەروەها کرماشان دوای ئەوەش لە ئێران و کوردستاندا دەورێکی بەرچاوی هەبووە کە بۆ نموونە دەکرێ ئاماژە بە پێکهێنانی کابینەی

کاتی دەوڵەتی تەراوگە بە سەرۆکایەتی "نیزامۆسەڵتەنەی مافی"، مەشرووتە خوازی "یار محەممەد خان" و شۆڕشەکانی "داود خان"، "زەنگەنە" و "قەدەم خێرخان" و وتوویژ و شەڕ لەگەڵ رووس و ئینگلیسدا بکەین.

دوژمنانی ئێران و کوردستان بە حاڵیبوون لە رۆڵی کاریگەری کرماشان لە کۆی دەورەکاندا، هەوڵیان داوە ئەو مەڵبەندە لە ناوەندیەتی شۆڕشە رزگاریخوازەکان دابڕن و زۆرتر بە خۆوەی خەریك بکەن، بۆ تێوەردانی ئەو تەونەشیان تێکرا و وێکرا لە سەردەمی "محەمەد عەلی میرزای دەوڵەت شا"وە لە هەوڵی ئەوەدا بوون نامۆ بە خۆیان بار بێنن. دەوڵەتشای قاجار بۆ گەیشتن بەو ئاواتەی لە بازرگان و کاربەدەستانی ناوچەییەوە بگرە تا لێپرسراوی دایرەکان کە زۆرتر کۆ لاوی پلە و پایە و پاراستنی شوێن و جێگای خۆیان بوون، دەستی پێکردەوە و هەوڵیداوە

ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ تێیان بگەیەنێت کە شەرتی مانەوەیان لە پلە و پایەی دڵخوازیاندا پێوەندی بە قبوڵ کردنی فەرهەنگ و زمانی سەپاو و فەرمی واتە فارسییەوە هەیە. بە دەسپێکی ئەو کارە بناغەی لە کورد سڕینەوە لە کرماشان دامەزرا. پێویستە ئەوەشی پێوە زیاد بکرێت کە باری هەڵکەوتی جوگرافیایی و بە پیت و برەوبوونی خاکی کرماشان و کەوتنە سەر ڕێگای بازرگانی "بەغدا" – "خوراسان" و زیارەتگا گەورەکان، بۆتە هۆی جێگیربوونی هەندێ کەسی بازرگان لەو شارە کە دەسەڵاتی مادی ئەوان و باوەش بۆ گرتنەوەی بێگانەپەرستانی کورد لەو شارەدا زەقی کردنەوە.

ئەو سیاسەتانە لە سەردەمی ڕەزاخاندا گوڕ و تینێکی پتەوتریان بەخۆوە گرت. ئەو بە چاولێکەری لە "ئاتاتورك" و هاودەنگی لەگەڵ عەرەبە عێراقیەکاندا هەوڵی دا شارێکی گەورەی وەك کرماشان کە تەوەرە و ناوەندی ناوچە کوردنشینەکانی ئێران بوو، لە ناوەندییەتی بخات و وەك ناوەندی پارێزگایەکی بچووك ناودێری بکات. بۆ ئەو کارەش پارێزگای پێنجەمی بە چەندین پارێزگای بچووك دابەش کرد. ئەو کاتەی کە ئاتاتورك حاشا لە بوونی کوردەکانی "دیاربەکر" دەکرد و بە تورکی شاخی ناودەبردن، عەرەبەکان بە جێگیرکردنی عەرەبی هاوردە لە هەوڵی بە عەرەبکردنی "کەرکوك"دا بوون، ڕەزاخانیش بە بیانووی تەك ناوەندی و فارسیسمی دەوڵەتی لە هەوڵی لەناوبردنی شوناسی غەیرە فارسەکاندا بوو.

ئەو بەرنامەیە لە کرماشان بەرچاوتر بوو. چونکە حکومەتی ئێران بە هاوکاری تورکەکان لە سەردەمی عوسمانی – سەفەویدا سیاسەتی سەرکەوتوانەی تێکدانی قەڵا ئەستەمەکانی یارسان و کوردستانی تاقیکردبۆوە و جوڵانەوەی یارسان کە تا ئەودەم ڕاپەڕینێکی پەلاماری – ڕاگەیەنەری بوو بە ئاییني دڵ – دەروونی گۆڕی و قەڵاکانی "پاڵنگان"، "حەسەن ئاوا" و "مەریوان"ی لێستاندنەوە و پەیڕەوانی ئایینگەرای بۆ شارەکانی تری کوردستان وەك: "کەرەند"، "سەحنە"و "کرماشان" دوورخستنەوە، بە بڵاوەپێکردنی ئەوانە و لەناوبردنی ئاخرین فەرمانڕەوایی کوردی گۆران لە "پاڵنگان" و "دەرەتەنگ" بە کردەوە رزگاریخوازانی کوردی لە حاڵەتی لە خۆپرسینەوەدا هێشتنەوە. ڕەزاخان بە دەرس وەرگرتن لە هاوپەیمانیەتی سەفەوی لەگەڵ عوسمانیەکاندا، هەوڵی دا دڵی کوردستان واتە کرماشان لەکار

بخات و بۆ راپەراندنی ئەو ئەرکەشی لە زمان و شوناسەوە کە پێناسی هەر نەتەوەیەکە دەستی پێکرد.

ئەو لە هەوڵدا بوو خەڵکی دلێر و دڵسۆزی کرماشانی بە دروشمی ئێرانی و.. لە شوێنیسمی رەزاخانی نزیك بکاتەوە، ئینجا بە پیلان و دهۆی پەرەپێدانی کەرەستەی سرکەر و.. دانیشتووی ئەو شوێنە لە شوناسی راستەقینەی خۆیان دابڕێت.

بەداخەوە ئەمڕۆ دەرکەوتووە کە ئەو پیلانانە تا رادەیەکی زۆر سەرکەوتووانە لە کڵ دەرهاتوون. بەشێوەیەك کە زۆر لە بنەماڵەکان لەگەڵ مناڵەکانیاندا بە کوردی نادوێن و ناونانی کوردی لە زارۆکیان نامۆ دەنوێنێ. هەندێکیان بە کوردی دوان بە کەسری شان و هۆی دواکەوتوویی خۆیان دەزانن و بۆ گەیاندنی مەبەستیان لە زمانی سەپاوی فارسی کەڵك وەردەگرن. ئێمە چ باش و چ خراپ کوردین و قسەکردنمان بە فارسی نیشانەی فارس بوونمان نییە، کەواتە چ لەوە باشتر کە لە پاراستن و بەرزراگرتنی زمان و شوناسی خۆماندا توند و تۆڵ و تێکۆشەر بین و بڕوا بەوە بێنین کە زمانی کوردی لە هیچ زمانێکی تر کەمتر نییە. بەڵکو ئەوە ئێمەین خۆمان بەکەم دەگرین. مەگەر بەرهەمی هۆنەران و هونەرمەندانی گەورەی فیلمسازی ئێمە گشتیان بە کوردی نین کە رەنگدانەوەیەك لە ژیانی گەلی کوردن. ئەدی بۆ هەر بە خێرایی لە دنیادا دەنگ دەدەنەوە و بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان وەردەگێڕدرێن؟ چونکە پەیامیان بۆ گەلانی جیهان و غەیرە کوردیش پێیە. بە راستی ئەمڕۆ کرماشان چی لێهاتووە؟ کرماشانێك کە هەر وا ماوەیەك لەمەوپێش لە رێگای رادیۆ کوردیەکەیەوە هونەرمەندانی گەورەی وەك: "حەسەن زیرەك"، "مەزهەری خالقی"، "سەید تاهیری هاشمی"، "رەبیعی"، "کەمانگەر" و... بۆ کۆمەڵگای ئێران و کوردستان پەروەردە کردووە. ئەمڕۆ هەر لەو رادیۆ و تەلەفزیۆنەیدا کورد و زمانەکەی بە دواکەوتوو، لادێیی و بە دوور لە هەر فەرهەنگ و مەدەنییەتێك پیشان دەدەن. ئێمە ناتوانین حاشا لە بوونی خۆمان بکەین، چونکە هیچ کەس ئێمەی بە پێناسێکی جیا لە کورد بوون ناوێ. ئایا ئەو سەرلێشێواوییە هۆی نەشارەزایی لە مێژوو، فەرهەنگ و زمانی خۆیی نییە؟ ئەم وتەیە بە واتای پاش گوێدان و کەڵك وەرنەگرتن لە زمانەکانی تر نییە. چونکە ئێمە تەنیا گەلێکین کە بێجگە لە زمانی زگماکی خۆمان بە زمانەکانی فارسی، عەرەبی و تورکیش دەتوانین بخوێنین و بنووسین و ئەگەر بە باشی لەو بۆهاتەمان کەڵك وەربگرین، سەرکەوتنێکی گەورەمان وەدەسهێناوە.

لە کۆتاییدا پێویستە بڵێم کە ئەگەر لە دەیەی بیستەمی هەتاوییدا مەهاباد ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و زمانی کوردی بوو و لە شۆڕشی یەکگرتووی پەنجاوحەوتی هەتاویشدا سنەی پێوە زیاد بوو، ئێستا لە هەنگاوی سێهەمدا کرماشان وەك ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ، زمان و شوناسی کوردی دەبێ ئاڵا هەڵگر بێت.

